# شرحی ابن عقیل

## بە کوردی

لەگەڵ لێکدانەوەو إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

**بەرگی سێیەم**

ئامادەکردنی

سەربەست جەباری

# شرحی ابن عقیل

# بە کوردی

لەگەڵ لێکدانەوە و إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان ، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

ئامادەکردنی

سەربەست جەباری

بسم الله الرحمن الرحیم

# شرحی ابن عقیل بە کوردی

ئامادەکردنی : سەربەست جەباری

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانەی : ڕێ نوێ

ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٢٤٤ ) ی ساڵی ( ٢٠١٢ ) ی پێدراوە.

# المنصوبات[1] (( ناوە منصوبەکان[2] ))

## المفعولُ المُطْلَقُ[3]

٢٨٦- الْمَصْدَرُ اسْمُ مَا سِوَى الزَّمَانِ مِنْ مَدْلُولَي الفِعْــلِ كَأَمْنٍ مِنْ أَمِنْ.[4]

هـەموو فعلێـك دوو شـت ئەگەیـەنێ:ئـیش وکـار(الحـدث)،وکـات(الزمـان)، بۆنموونە فعلی((قام))بە واتای هەستان دێ لە کاتی ڕابردوو، وە((یقومُ)) هەستانە لـەکاتی ئێـستا،وە((قُمْ))واتـا هەسـتان لـەکاتی داهـاتوو، کەواتـە هەسـتان((القیـام)) بریتیـە لەئیـشەکە-کـە یەکێکـە لـە دوو واتـای فعلەکـە- ودەبێتـە مـصدر، ئەمەیـە مەبەسـت لـەمانای((سِـوَی الزَّمَـانِ مِـنْ مَـدْلُولَي

---

[1] دوای ئەوەی لەبابەتەکانی پێشوو باسی بەشەکانی قسە((الکلام))مان کرد، وە وتمان کە بەشی یەکەمی قسە بریتیە لەناو، وەدواتر باسی جۆرەکانی دابەشکردنی ناو بەپێی ماناو مەبەستە جیاوازەکانمان کرد، یەکێ لە دابەشکردنەکانی ناو ئەوەیە کە هەموو ناوێك-کە معرب بێ- لە ڕستەدا یان: مرفوعە ،یان منصوبە ، یان مجرورە، باسی ناوە مرفوعەکان کراو ڕابورد، لێرەوە دەست دەکرێ بە باسی ناوە منصوبەکان.

[2] لەزمانی عەرەبیدا ناوە منصوبەکان پانزەن کە ئەمانەن: { ١- المفعولُ بِهِ، ٢- المصدر (المفعول المطلق) ،٣- ظرفُ الزمانِ، وظرفُ المكانِ(المفعول فيه)، ٤- الحال، ٥- التمييزُ، ٦- المُستثنى، ٧- اسم لا، ٨- المُنادى، ٩- والمفعول من أجله، ١٠- المفعولُ معهُ، ١١- خبرُ كان وأخواتِها، واسم إن واخواتها، والتابعُ للمنصوب، وهو أربعة أشياء:١٢- النَّعتُ، ١٣- العطفُ ١٤- التوكيدُ، ١٥- البدلُ}.

[3] مفعولی مطلق ئەگەر بیکەینە کوردی دەبێتە:بەرکاری ڕەها، دیارە لەسەرەوە پێناسەی دەکرێ، بەڵام ئێمە لەکاتی شەرح کردندا((مفعولی مطلق))بەکار دێنین.

[4] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:مصدر_واتا مفعولی مطلق_ناوێکە ماناکەی بریتیە لە جگە لە کات لە دوو ماناکەی فعل_دیارە هەموو فعلێك دوو مانای هەیە ((ئیش وکارەکە(الحدث)، کات(الزمان)، وەکو ناوی ((أَمْنٍ)) واتا: دڵنیابوون، کە لە فعلی ((أَمِنَ))ەوە وەرگیراوە.

الفِعْــلِ))، وەکو ئەوەی بڵێ: مصدر بریتیە لە ناوی ئیش وکارەکە وەکو أَمْنٍ، کە یەکێکە لە دوو ماناکەی فعلی أَمِنَ.

جـا مفعـولی مطلـق بریتیــە لــە: چــاوگ((مــصدر))ــێکی منــصوب کــە بەهێزکار(مؤکِّد)ی عاملەکەیەتی، یان جۆری عاملەکەی ڕوون دەکاتەوە، یان ژمارەکەی[1]، وەکو((ضربْتُ ضرباً، وسرْتُ سيرَ زيدٍ، وضربْتُ ضربتين)). جا بۆیە پێی دەوترێ مفعولی مطلق لەبەر ئەوەی ناوی مفعولی بەسەردا دەبڕێ بەبێ بەستنەوەی بەحەرفێ جەڕ وهاوشێوەی، بەپێچەوانەی مفعولەکانی تر، چونکە ئەوانی تر پێیان ناوترێ مفعول بەبێ هێنانی حەرف، وەکو مفعول بە، ومفعول فیە، ومفعول معە، ومفعول لە.

* * *

[1] ئەمە جۆرەکانی مفعولي مطلقە، کە دواتر لەدێڕی ژمارە((٢٨٨)) بەتفصیلی باسی دەکەین.

*** باسی عاملی مفعولی مطلق**

٢٨٧- بِمِثْلِهِ أَوْفِعْلٍ أَوْ وَصْفٍ نُصِبْ          وَكَوْنُهُ أَصْلاً لِهَذَيْنِ انْتُخِبْ.[١]

**منصوب دەبێ مصدر بەهاوشێوەی خۆی، واتا بەمصدر، وەکو**((عجبتُ من ضَرْبِك زيداً ضرباً شديداً))[٢]، **یان منصوب دەبێ بە فعل وەکو**((ضربتُ زيدا ضرباً))[٣]، **یان منصوبە بە صفه**[٤]، **وەکو**((أنا ضَارِبٌ زيداً ضرباً))[٥].

**جا بۆچوونی بەصریێکان وایە کە مصدر ئەصل وبنەمایە، وفعل وصفه وەرگیراو((مشتق))ن لە مصدرەوە، ئەمەیە مەبەست لە ووتەی**((وَكَوْنُهُ أَصْلاً لِهَذَيْنِ انْتُخِبْ)) **واتا: بۆچوونی هەڵبژێراو ئەوەیە کە مصدر ئەصڵ وبناغەیە بۆ ئەم دووانە، واتا: بۆ فعل وصفه.**

**وە بۆچوونی کوفیەکان وایە کە فعل ئەصڵ و بنەمایە، ومصدریش وەرگیراوە لە فعلەوە.**

**وە هەندێکی تر پێیان وایە کە مصدر ئەصڵ وبناغەیە، وفعلیش لە مصدرەوە وەرگیراوە، وصفەش لە فعلەوە وەرگیراوە.**

**وە پێشەوا ابن طلحة**[٦]**، پێی وایە هەر یەك لە مصدر وفعل بۆ خۆیان ئەصڵن وسەربەخۆن، وهیچیان لە هیچیانەوە وەرنەگیراون.**

---

[١] **پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: منصوب دەبێ مفعولی مطلق بە هاو وێنەی خۆی-واتا بەمصدر-یان بە فعل ،یان بە ناوێك کە صفەیە-وەکو اسمی فاعل یان اسمی مفعول...-، وە بۆچوونی هەڵبژێراو ئەوەیە کە مصدر ئەصڵی فعل وصفەیە.**

[٢] **لەم ڕستەیەدا((ضرباً)) مفعولی مطلقە، وە منصوبە بە((ضَرْبِك))کە مصدرە.**

[٣] **لەم ڕستەیەدا((ضرباً)) مفعولی مطلقە، وە منصوبە بە((ضربتُ))کە فعلی ماضیە.**

[٤] **مەبەست بە صفه لێرەدا (نعت) نیە ،بەڵکو مەبەست پێی ئەو ناوانەن کە وەصف وصیفەتن، وەکو اسمی فاعل واسمی مفعول ،وصیغەی مبالغە، کە عەمەلی فعلەکەیان دەکەن.**

[٥] **لەم ڕستەیەشدا((ضرباً)) مفعولی مطلقە، و منصوبە بە(ضَارِبٌ) کە اسمی فاعلە.**

[٦] **ناوی: ابو بکری کوڕی محمدی کوڕی طلحةیە، وخەڵکی شاری إشبیلیەیە لە وڵاتی ئەندەلس، یەکێك بووە لە گەورە زانایانی ئەو شارە لە بواری زانستەکانی زمان وئەدەب، ماوەی زیاتر (٥٠) ساڵ لەو شارە وانەی وتووەتەوە، ساڵی ٦١٨ك کۆچی دوای کردووە.**

دیـارە بۆچوونی ڕاسـت یەکەمـە، چـونکە هـەموو فـەرعێك دەبـێ مانـای ئەصـڵەکەو شتێکی زیاتریش لـە خـۆگرێ، جا فعل وصـفەش لـە بەرامبـەر مـصدردا وان، چـونکە هەریـەك لـە فعـل وصـفە مانـای مـصدر وزیادەیـەکیش دەگـەیێنن، فعـل مانـای مـصدر وکات دەگەیێنێ، وە صفە مانای مصدروفاعل دەگەیێنێ.

* * *

*** جۆرەکانی مفعولی مطلق**

٢٨٨- تَوْكِيداً أَوْ نَوْعـاً يُبِينُ أَوْ عَدَدْ    كَسِرْتُ سَيْرَتَيْنِ سَيْرَ ذِي رَشَدْ.[١]

مفعولی مطلق سێ جۆری هەیە وەکو ڕابورد:

یەکەمیان: ئەوەیە کە دەبێتە بەهێزکار((مؤكِّد))ی عاملەکەی، وەکو((ضربتُ ضرباً))[٢].

دووەم: ئەوەیە کە بۆ ڕوونکردنەوەی جۆری عاملەکەی دێ، وەکو((سِرْتُ سَيْرَ ذِي رَشَدْ))، وەکو((سرتُ سيراً حسناً))[٣].

سێیەم: ئەوەیـە کـە بۆ ڕوونکردنـەوەی ژمـارەی عـاملەکـەی بێ،وەکـو((ضربْتُ ضربةً، وضَرْبتيْنِ وضَرَباتٍ)).

* * *

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: مفعولی مطلق بەکاردێ بۆ بەهێزکردنی عاملەکەی، یان بۆ جۆرەکەی ،یان بۆ ژمارەکەی، وەکو نموونەی((سِرْتُ سَيْرَتَيْنِ سَيْرَ ذِي رَشَدْ)) واتا: ڕێم کرد دوو ڕێکردن، وەکو ڕێکردنی خاوەن ژیری.

[٢] لەم ڕستەیەدا ((ضرباً))مفعولی مطلقەو بۆ بە هێزکردنی مانای عاملەکەی کە ((ضربتُ)) هاتووە، وە واتای ڕستەکە: لێم دا بە لێدان.

[٣] لەم ڕستەیەدا ((سَيراً حسناً)) مفعولی مطلقەو بۆ ڕوونکردنەوەی جۆری عاملەکەی کە((سِرْتُ))هاتووە، ماناکەی: ڕێم کرد بە ڕێکردنێکی جوان.

*** باسی ئەو ناوانەی جێی مفعولی مطلق دەگرن**

٢٨٩- وَقَدْ يَنُوبُ عَنْهُ مَا عَلَيْهِ دَلّ     كَجِدَّ كُلَّ الْجِدِّ وَافْرَحِ الْجَذَلْ.[١]

**هەندێ جار جێی مصدر دەگرێ ئەو شتەی کە ماناومەبەستی مصدرەکە بگەیێنێ، وەکو((کُل وبعض))، کە پاڵدرابێتن((إضافە))کرابن بۆ لای مصدرەکە، وەکو** ((جِدَّ كُلَّ الجِدِّ))، **وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە**﴿فَلا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ﴾[٢]، **وە وەکو**((وضربتُهُ بعضَ الضربِ)).

**هەروەها وەکو ئەومصدرەی کە هاومانا(مرادف)ی مصدری فعلەکەیە**[٣]، **وەکو نموونەی**((قعدْتُ جلوساً، افْرَحِ الْجَذَلَ)) **لێرەدا جُلوس: جێی(قعود)ی گرتووە چونکە هاومانایەتی،وە جذل: جێی(الفرح)ی گرتووە لەبەر ئەوەی هاومانایەتی.**

**هەروەها**[٤] **جێی مصدر دەگرێ اسمی ئیشارە، وەکو**((ضربْتُهُ ذلك الضَّرْبَ))[٥]، **جا هەندێ لە زانایان وتوویانە هەرکاتێ اسمی ئیشارە بوو بە جێگری**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:جێی مفعولی مطلق دەگرێ ئەو ناوانەی ماناو مەبەستی مصدرەکە دەگەیەنن، وەکو ووشەی((کُلّ))کە پاڵدرا بێ بۆ لای مصدرەکە، نموونەی ((جِدَّ كُلَّ الجِدِّ))، هەروەها وەکو ئەو ناوەی هاومانا(مرادف)ی مصدرەکەیە، نموونەی ((افْرَحِ الجَذَلْ)) واتا: دڵخۆش بە بەدڵخۆش بوون، ووشەی ((الجَذَلْ)) واتا ((الفرح)).

[٢] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٢٩)ی،سورەتی النساء،پوختەی ماناکەی{_ئەی پیاوانی فرەژن_ هەمو مەیل ولابوونەوەتان نەبێ بۆ یەکێ لە ژنەکانتان و ئەوی تر فەرامۆش کەن...}. إعرابەکەی: فـ/حسب ماقبلها. لا/ناهية جازمة. تميلوا/فعل مضارع مجزوم,وعلامة جزمه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة. والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. كُلَّ/ نائب عن مفعول المطلق،منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة,وهو مضاف ، الميلِ/مضاف عليه مجرور. الشاهد فيها : كلمة((كلّ))نابت عن المصدر وأُضيفت إليه.

[٣] واتا:ئەو فعلەی عاملە لەمفعولی مطلقە کە ولە ڕستەکەدایە.

[٤] کەواتا:ئەمە دەبێتە سێیەم ناو لەوناوانەی جێی مفعولی مطلق دەگرن.

[٥] لەم ڕستەیەدا((ذلك))دەبێتە:اسم إشارة مبني في محل نصب نائب عن المفعول المطلق. وە((الضربَ))دەبێتە:بدل لاسم الاشارە.

**مفعـولی مطلـق ئـەوە پێویـستە وەصـف كرێـت بـە مـصدرەكەی، وەكـو نموونـەمان هێنايـەوە، بـەلاّم ئەمـە[١] جێـی ڕەخنەوقـسەيە ،لەنموونـەكانی پێـشەوا سـيبويە((ظننتُ ذاكَ)) واتـا:** ظننتُ ذاك الظَّنَّ، **لێـرەدا** ذاكَ **اسمـی إشارەيە وئاماژەيە بۆ** الظَّنَّ **،و نەبووە بە وەصف بۆی.**

**هەروەها جێـی مـصدر دەگرێ جێناوەكـەی[٢]،وەكو**((ضربتُهُ زيداً))**،واتـا:**ضربتُ الضربَ، **وە وەكو فەرموودەی خوای گەورە**﴿لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ﴾[٣]**،واتـا: لا أُعذب العذاب.**

**هەروەها جێی مصدر دەگرێ ژمارەكـەی،وەكو**((ضربتهُ عشرين ضربةً))**،وە وەكـو فەرموودەی خوای گەورە**﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾[٤].

---

**[١] واتا:دانانی مەرج بۆ اسمی ئیشارە.**

**[٢] واتا: جێناوی مفعولی مطلقە كە.**

**[٣] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێكە لەئايەتی ژمارە(١١٥)ی،سورەتی المائدة،پوختەی ماناكەی {-هەركەس لە ئێوە ناسوپاس وبێ بڕوا بێ ئەوە سزايەكی دەدەم- كە سزای هیچ كەسی پێنادەم لە جیهانیان.} إعرابەكەی: لا/نافية غير عاملة. أعذبُ/فعل مضارع مرفوع ،وفاعله: ضمير مستتر تقديره( أنا ). والهاء/ضمير متصل مبني في محل نصب نائب عن مفعول المطلق لأنه عائد على ( عذاباً ). أحداً/ مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة. من العالمين/ جارومجرور. . الشاهد فيها :أُعذِبهُ ،حيث ناب عن المصدر(عذاباً) ضميره وهو الهاء في أُعَذِّبُهُ ،والتقدير:لا أُعذب العذاب.**

**[٤] ئەم ڕستە قورئانیەش بەشێكە لەئايەتی ژمارە(٤)ی،سورەتی النور،پوختەی ماناكەی {-ئەوانەی بوختانی زینا دەكەن بۆ كەسانی داوێن پاك- ئەوە ٨٠دار((شەلاق))یان لێدەن}. إعرابەكەی: فـ/حسب ماقبلها. اجلدوا/ فعل امر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة ، والواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. هُمْ: ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. ثمانينَ/نائب عن المفعول المطلق منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه ملحق بجمع المذكر السالم. جلدةً / تمييز منصوب . الشاهد فيها : ثمانين،حيث ناب العدد(( ثمانين )) عن المصدر فكان نائبا عن المصدر .**

هـــەروەها دەبێتـــە جێگـــری مـــصدر ئامێروئالەتەکـــەی،وەکو((ضـربتهُ سَوْطاً))ئەصڵەکەی((ضربتُه ضَرْبَ سَوْطٍ))بووە،و ناوە مضافەکە[1] حذف کراوەو مضاف إليه جێگەی گرتۆتەوە،خوای گەورە لەهەمووان زاناترە.

* * *

٢٩٠- وَمَـا لِتَوْكِيدٍ فَوَحِّدْ أَبَـدَا وَثَنِّ وَاجْمَـعْ غَيْرَهُ وَأَفْـرِدَا.[2]

دروست نیە کردنە دووان((تثنیة))ـی ئەو مفعول مطلەقەی کە بۆ توکید بێ،وە دروست نیە کۆ((جمع))کردنی،بەڵکو پێویستە بە مفردی بێ،کەوابوو دەڵێی((ضربته ضرباً))چونکە ئەم جۆرە مفعولە وەکو دووبارە کردنەوەی فعل وایە،دیارە فعلیش نەدەکرێتە دووان وەنەدەکرێتە کۆ [3].

بەلاّم جگە لە توکید–کە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ژمارەو،جۆر–ئەوە دانەر باسی کرد کە دروستە بکرێتە مثنی وجمع .

جا ئەو مفعول مطلقەی بۆ ژمارەیە ئەوە هیچ ڕا جیاییە نیە لەوەی کەدروستە بکرێتە دووان وکۆ، وەکو((ضربته ضربتين، وضرباتٍ)). بەلاّم ئەو مفعول مطلقەی بۆ جۆرە ئەوە ڕای زۆروباوی زانایان ئەوەیە کەدروستە بکرێتە دووان وکۆ،ئەگەر جۆرەکان جیاوازبن،وەکو(( سرْتُ سيرَيْ زيدٍ الحسنَ والقبيحَ)). وە قسەی دیاروئاشکرای پێشەوا سیبویە ئەوەیە کە کردنە دووان وکۆی بە قیاسی دروست نیە،بەڵکو بە بیستن(سماعی)دروستە،ئەمەش ڕای هەڵبژاردەی پێشەوا شەلەوبینە.

---

[1] واتا: ناوی((ضَرْبَ))کە مصدرەو مضافە وحذف کراوە و((سَوْطاً))یش بووە بە جێگری مصدرەکە.

[2] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:ئەو مفعول مطلقە ی کە بۆ توکید بێ ئەوە پێویستە بە مفردی بێ ونەکرێتە مثنّی وجمع ،بەلاّم غەیری توکید_واتا ئەوەی بۆ جۆرو ژمارەیە_ئەوە دەتوانی بە مفردی بیهێنی وە دەتوانی بە جمع ومثنّی بیهێنی.

[3] واتا : فعل ئەگەر فاعلەکەی دووان یان کۆبێ ، فعلەکە خۆی ناکرێتە دووان و کۆ ، وەکو لە دێری ٢٧٧ ی ئەلفیەدا باس کرا

## باسي حذف كردنى عاملى مفعولي مطلق.

٢٩١- وَحَذْفُ عَامِلِ الْمُؤَكِّدِ امْتَنَعْ وَفِي سِوَاهُ لِدَلِيـــلٍ مُتَّسَعْ.[1]

مفعولی مطلق كە بۆ توكيد بێ دروست نيە عاملەكەی حذف كرێ،چونكە ئەم مفعولە بۆ بەهێزكردن وچەسپاندنی مانای عاملەكەی هێنراوە،جا حذف كردنيش پێچەوانەی ئەم مەبەستەيە.

بەڵام جگە لەوەی بۆ توكيدە ئەوە دروستە عاملەكەی حذف كرێ ئەگەر بەڵگە هەبێ لەسەری:يان بە دروستێتی((جوازاً))،يان بە واجبێتی.

نموونەی حذف كردن بە دروستێتی،وەكو وتەت(( سَيْرَ زَيْدٍ))لەوەڵامی ئەو كەسەی دەڵێ((أيَّ سَيْرٍ سِرْتَ ؟))يان دەڵێی((ضربتين))لەوەڵامی ئەو كەسەی دەڵێ((كَمْ ضربتَ زيداً ؟))،تقديرەكە: سِرْتُ سَيْرَ زيدٍ، ضربته ضربتين.

جا وتەی كوڕی دانەر[2]:بێگومان وتەی((وَحَذْفُ عَامِلِ الْمُؤَكِّدِ امْتَنَعْ))هەڵەيە و لێی تێك چووە،لەبەر ئەوەی ((ضرباًزيداً))مفعولی مطلقەو بۆ توكيدە،وعاملەكەی حذف كراوە،وەكو لەمەو دوا باسی دێ-ڕاست نيە[3]،وە ئەوەی كردوويەتی بە بەڵگەی قسەكەوڕەخنەكەی لەوەی كە عاملی مفعولی مطلق كە بۆ توكيدە حذف بووە،ئەوە ناشێ بۆ بەڵگەی ئەمەو لەم بابەتەنيە،لەبەر ئەوەی((ضرباًزيداً))هيچ توكيدی تێدا نيە،بەڵكو

---

(١) پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:حذف كردنی عاملی مفعولی مطلق كە بۆ توكيدبێ ڕێگەنەدراوەودروست نيە ،بەڵام بۆ حاڵەتەكانی تر-واتا:ئەوەی بۆ ژمارە وئەوەی بۆ جۆرە-بە بەڵگە دروستە حذف كرێت.

[2] مەبەست كوڕی دانەر((ابن المصنف ،يان ابن الناظم)) بدر الدين محمد ابن مالك،كوڕی ابن مالكی خاوەنی ئەلفيەيە،كە شەرحی ئەلفيەكەی باوكی كردووە بەناوی(( شرح ابن الناظم على ألفية ابن مالك )).

[3] واتا:كوڕی دانەر ڕەخنەی لە باوكی گرتووەو،ابن عقيليش دەڵێ ڕەخنەكەی كوڕی دانەر ڕاست وتەواو نيە.

خاليه له توكيدو،وەكو ڕستەی((اضربْ زيداً))،چونكه لەجێی ئەودانيشتووە، جـا هـەروەكو چـۆن((اضـربْ زيـداً)) توكيـدی تێـدا نيـه بەهـەمان شێوە((ضرباًزيداً))يش توكيدی تێدا نيه،هەروەها هەموو ئەو نموونانەی باسی كردووە[١] هيچيان توكيد نين،چونكه لەهەموويانـدا مصدرەكە[٢]لـه جێی عاملەكەيه،وهەمان مانای ئەوی هەيه،ولـەبری ئەوە،بەڵگەش بۆ ئەمه ئەوەيـه نـاتوانين هـەردووكيان[٣] پێكـەوە كۆكەينـەوە،خۆ هـيچ كـام لـه توكيدەكان نادروست نيه كۆكردنەوەيان لەگەڵ توكيدكراوەكان.

هـەروەها بەڵگەيـەكی تـر لەسـەر ئـەوەی كـە((ضـرباًزيداً))وهاوشـێوەكانی مفعـولی مطلـق نـين بـۆ توكيـدكردنی عاملەكـەی ئەوەيـه كـه ئـەم جـۆرە مصدرە[٤] هيچ خلاف تێدا نيه كه عەمەل ناكات،بەڵام زانايـان خلافيان هەيه دەربـارەی ئـەو مـصدرەی لـەجێی فعلـه[٥]: ئايـه عەمـەل دەكـات يـان نـا؟ڕای ڕاسـت وبـەهێز ئەوەيـە كـه عەمـەل دەكات،كەواتـە((زيـداً))لـه ڕستەی((ضرباًزيداً))دا منصوبه به((ضرباً))له سەر ڕای بەهێز،وە ووتـراوە كه منصوبه به فعلێكی محذوف،كه بريتيه له((اضربْ))،كەواتا لەسەر ڕای يەكەم((ضرباً))لەجێی((اضربْ))ـە،لەڕووی ماناو لـەڕووی عەمەلەوە،وەلەسـەر ڕای دووەم تەنها له مانادا لەجێيەتی،بەڵام له عەمەلدا لەجێی ئەو نيه.

* * *

[١] واتا: كوڕی دانەر باسی كردووە دەربارەی ڕەخنەكەی له باوكی.

[٢] واتا:مفعول مطلقەكە.

[٣] واتا: ((اضربْ))كه عاملەكەيەو((ضرباً))كه مصدرەكەيه.

[٤] واتا:ئەو مفعول مطلقەی بۆ توكيد كردنی عاملەكەيەتی.

[٥] واتا: ((ضرباًزيداً))و هاوشێوەكانی.

*** باسی ئەو شوێنانەی واجبە حذف کردنی عاملی مفعولی مطلق.**

٢٩٢- وَالْحَذْفُ حَتْمٌ مَعَ آتٍ بَدَلاَ     مِنْ فِعْلِهِ كَنَدْلاً اللَّـذْ كَانْدُلاَ[١].

**حذف دەکرێ عاملی مصدر بە واجبی لە چەند شوێنێك:**

**لەوانـە:ئەگـەر مـصدرەکە لـە بـری وجێـی فعلەکـەی بێ،ئەمـەش یاسای(قیاسی)یە لە ئەمر ونەهی،وەکو((قياماً لا قعودا))واتا:قُم قیاماً،ولا تقعُد قُعُوداً، هەروەها قیاسیە لە دوعاکردن وەکو((سقیاًلك))واتا: سقاك الله.**

**هـەروەها حـذف دەکـرێ عـاملی مـصدر بە واجـبی ئەگـەر مـصدرەکە بکەوێتـە دوای پرسیارکردن(استفهام)ێك مەبەست پێی سەرکۆنەکردن (التوبیخ)بێت[٢]،وەکو((أَتَوَانِياً وقَدْ عَلاكَ المشيبُ؟))[٣]واتا:اتتوانی،سستی دەکەیت.**

**وە کەمە حذف کردنی عاملی مصدر ودانانی مـصدرەکە لە جێی فعلێك کە مەبەست پێی خەبەردانە،وەکو((أَفْعَلُ وكَرَامَةً))واتا:وأُكْرِمُكَ.[٤]**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:پێویست(واجب)ە حذف کردنی عاملی مصدر هەرکاتێك مصدر لە جێ وبری فعلەکەی بوو،وەکو نموونەی(نَدْلاً اللَّذْ كانْدُلا)واتا:بڕفێنە ئەوە وەکو ڕفاندنی.لەم ڕستەیەدا((نَدْلاً))کە مفعولی مطلقە لە جێی فعلەکەی کە((اندُل))هاتووە.

[٢] لەزمانی عەرەبیدا استفهام بەشێوەیەکی گشتی دوو مانای هەیە: أ- حقیقی{ئەویش ئەوەیە کە استفهامەکە بۆ مانای خۆی بێ،کە پرسیارکردنە} . ب_ مجازی {ئەمیش ئەوەیە کە ئەداتی پرسیارکردنەکە بۆ پرسیار کردن بە کار نایات وبۆ مانای تر بە کاردێ ،ئەو مانایانەش زۆرن یەکێکیان بریتیە لە سەرکۆنەکردن((التوبیخ))}.

[٣] واتا:ئایە سستی دەکەیت لە چاکەدا لە کاتێکدا پیری دایگرتووی،واتا:واز لە سستی کردن بێنە ولە گەڵ پیریدا ناگونجێ.

[٤] واتا: كَرَامَةً کە مصدرە وعاملەکەی حذف بووە ولە جێی أُكرِمُك دانراوە.

كەواتا مصدر لەم نموونانەو هاوشێوەكانیان منصوبە بە فعلێكی حذف كراو بە واجبی،ومصدرەكەش لەجێی فعلەكەدایە لەڕووی ماناوە.

هەروەها ئاماژەی كرد دانەر بە ووتەی((كَنَدْلاً))بۆ ئەو هۆنراوەی پێشەوا سیبویە باسی كردووە،ئەویش بریتیەلە ووتەی شاعر

ش١٦٢/ يمرون بالدهنا خفافا عيابهُــمْ ويرجعْنَ مِنْ دارينَ بُجْر الحقائبِ

عَلَى حِينَ أَلْهَى النَّاسَ جُلُّ أُمُورِهِمْ فَنَدْلاً زُرَيْقُ الْمَالَ نَدْلَ الثَّعَالِبِ.[1]

لێرەدا((نَدْلاً))لە جێی فعلە ئەمرەكەیەتی،كە اُنْدُلْ، ندل واتا:ڕفاندنی شت بە خێرای،وە((زُرَيْقُ))بانگكراو(منادی)یە،وتقدیری ڕستەكە: نَدْلاًيا زُرَيْقُ الْمَالَ، زُرَيْقُ ناوی پیاوە،دانەر پێی دروستە((زُرَيْقُ))مرفوع بێ بە((نَدْلاً))،بەلاّم ئەمە جێی قسەیە،چونكە ئەگەر((نَدْلاً))لەجێی فعلی ئەمری دوێندراو(مخاطب)بێ،وتقدیرەكەشی(اُنْدُلْ)بێ ئەوە دروست نیە(زُرَيْقُ) پێی مرفوع بێ،لەبەر ئەوەی فعلی ئەمر ئەگەر بۆ دوێندراو(مخاطب)بێ ئەوە دروست نیە ناوێكی ئاشكرا[2] مرفوع بكات،هەروەها ئەوەشی لەجێی ئەم فعلە ئەمرەیە وایە،وەئەگەر((نَدْلاً))لەجێی فعلی ئەمری غائب بێ،وتقدیرەكەشی((لِيَنْدُلْ))ئەوە دروستە(زُرَيْقُ)مرفوع بێ پێی،بەلاّم ئەوەی نەقڵكراوە ئەوەیە كە مصدر جێی فعلی ئەمری غائب ناگرێ،بەڵكو تەنها جێی فعلی ئەمری مخاطب دەگرێ،وەكو((ضرباًزيداً))واتا:اضرِبْ زيداً، واللهُ اعلمُ

---

[1] واتای ئەم دوو دێرە وبەڵگەكەی:-ئەو دزانە-تێپەڕ دەبن بە دەهنا_ناوی شوێنیكە_ بوخجەوتورەگەكانیان بەتاڵە،وكە دەگەڕێنەوە لە دارین_گوندێكە لە وڵاتی بەحرێن_ جانتاكانیان پڕە ، لەكاتێكدا سەرقاڵن خەڵكی بەكاروبارە گرنگەكانیانەوە ،دەڵێن برفێنە وبدزە زُريق_ناوی پیاوێكە لەدزەكان_وەكو دزین وڕفاندنی ڕێویەكان. بەڵگەكەی((نَدْلاً))مفعولی مطلقە ولە جێی فعلەكەیەتی ،وعاملەكەی حذف كاوە بە واجبی.

[2] واتا:تەنها جێناو((ضمير)) مرفوع دەكات ،وەناوی ئاشكرا((الظاهر))مرفوع ناكات.

٢٩٣ — وَمَـا لِتَفْصِيلٍ كَإِمَّا مَنَّـا عَامِلُهُ يُحْذَفُ حَيْثُ عَنَّا.(١)

**هەروەها(٢) حذف دەكرێ عاملی مصدر بەواجبی ئەگەر ئەو مصدرە بۆ ڕوونكردنـەوەی سـەرەنجامی ئـەو شـتە بـێ لـە پێشێوە باسكراوە،وەكوفەرموودەی خوای گەورە** ﴿حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾(٣)، **لێرەدا (مناً وفداءً):مصدرن ومنصوبن به فعلێكی حذف كـراو بەواجبی،تقدیرەكەشـی—والله أعلـمُ—** فإمَّا تَمُنُّونَ مَنّاً ، وإمَّا تفـدون

---

(١) **پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەو مفعول مطلقەی بۆڕوونكردنەوە(تفصیل) بێ وەكو((إمَّا مَنَّـا))—كە بەشێكە لە ئایەتی(٤)ی سورەتی(محمد)دواتر باسی دەكەین— ئەوە پێویستە عاملەكەی حذف كرێ مادام دیارو ئاشكرا بێ.**

(٢) **ئەمە دەبێتە جۆری سێیەم لەو حاڵەتانەی كە واجبە عاملی مفعولی مطلق تێدا حذف كرێ.**

(٣) **ئەم ڕستە قورئانیە بەشێكە لە ئایەتی ژمارە(٤)ی سورەتی(محمد)،كورتەی ماناكەی {هەتا كاتێ كوشتاری زۆریان لێ دەكەن ئەنجا_دیلەكانیان_قایم ببەستنەوە،جا دواتر یان بە منەت وچاكە وبێ بەرامبەر بەریان دەن، یان بە فدیە وبەرامبەر بەریان بدەن.واتا:چۆن پەرژەوەندی تێدا بوو وەگونجاوبوو}. إعرابەكەی:حتی/حرف ابتداء مبني على السكون لامحل له من الإعراب. إذا/ظرف لمايستقبل من الزمان متضمن معنى الشرط غير جازم. أثخنْ/ فعل ماض مبني على السكون، تُمْ/ ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل ، هُم/ ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به. والجملة الفعلية في محل جر بإضافة إذا إليها. فشدوا/فـ: واقعة في جواب الشرط. شدوا/فعل امر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة. والواو/ ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل،والألف:فارقة. الوثاقَ/مفعول به منصوب. فإمّا/فـ:حرف تفريع وتفصيل ،إمّا/حرف شرط وتفصيل. منّاً/مفعول مطلق لفعل محذوف تقديره( تمنّونَ) ولايجوزإظهاره لأنّ المصدر جاء تفصيلا لعاقبة جملة. بعدُ/ظرف زمان مبني على الضم لانقطاعه عن الاضافة لفظاومعنىً. وإمّا/و:حرف عطف. إمّا/معطوفة على إمّا الأولى وتعرب إعرابه. فداءً/ مفعول مطلق لفعل محذوف تقديره(تفدون) ولايجوزإظهاره لأنّ المصدر جاء تفصيلا لعاقبة جملة. الشاهد فيها: مَنّاو فِداءً، حيث حذف عامل المصدر وجوباً لأنه وقع تفصيلاً لعاقبة ما تقدمه.**

فِدَاءً،ئەمەبوو مانای ووتەی دانەر((وَمَـا لِتَفْصِيلٍ-تاكۆتای))واتا:حـذف دەكرێ عـاملی ئـەو مـصدرەی هێنـراوە بۆ ڕوونكردنـەوە،( حَيْثُ عَنَّ)واتـا:دەركـەوێ وئاشكرا بێ.

*      *      *

٢٩٤- كَذَا مُكَرَّرٌ وَذُو حَصْرٍ وَرَدْ        نَائِبَ فِعْلٍ لِاسْمِ عَيْنٍ اسْتَنَدْ.[١]

واتـا:هـەروەها پێویـستە حـذف كرێ عـاملی مـصدر بـە واجبی،ئەگـەر ئـەو مصدرە جێی فعلێك بگرێ كە خبرە بۆ نـاوی خـود(عين)[٢]،وە مـصدرەكەش دووبـــارە یـــان تایبـــەت(حـــصر)كـــراو بێ،نموونـــەی دووبـــارە((زيـدٌ سـيراً سيراً))تقديرەكـەی: زيدٌ يسيرُ سيراً،حـذفكـراوە(يـسيرُ)بـە واجبی لەبـەر ئـەوەی دووبارە بوونەوەكە جێی دەگرێ،وەنموونـەی تایبـەت كـراو((ما زيدٌ إلا سيراً)) ،((وإنَّما زيدٌ سيراً))تقديرەكـــەی: مـا زيـدٌ إلاَّ يـسير سـيراً ، وإنَّمـا زيـدٌ يـسير سـيراً ، حذفكراوە(يسيرُ)بە واجبی لەبەر ئەوەی تایبەت كردن(الحصر)لـەخۆ دەگرێ بەهێزی وتوكیـدێ وەكـو دووبـارە بوونـەوە، جـا ئەگـەر مـصدرەكە دووبـارە نـەبوو یـان تایبـەت نـەكراوبوو ئـەوە حـذف كردنـی عاملەكـەی پێویـست نیـــە،وەكو((زيـدٌ سـيراً))تقديرەكـــەی: زيـدٌ يـسيرُ سـيراً،دەتـــوانی((يـسيرُ))حـــذف كەی،وەدەتوانی باسی كەی،واللهُ أعلمُ.

*      *      *

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەروەها حذف دەكرێ بەواجبی عاملی ئەو مصدرەی دووبارەیە،هەروەها ئەوەی تایبەت(حصر)كراو بێ، بەمەرجێ ئەو عاملە حذف كراوە ببێتە خبر بۆ ناوی خود(اسم عين).

[٢] مەبەست لەناوی خود(عين)ئەو ناوەیە كە تایبەتە بۆ كەسێك یان شتێكی تایبەت، وپێچەوانەی ناوی مانا(اسم معنى)كە گشتیە.

٢٩٥-وَمِنْهُ مَـا يَدْعُونَهُ مُؤَكِّـداً لِنَفْسِهِ، أَوْ غَيْـرِهِ ،فَالْمُبْتَـدَا
٢٩٦-نَحْوُ(لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ عُرْفَـا) وَالثَّانِ كَـ (ابْنِي أَنْتَ حَقًّا صِرْفَا).[١]

واتا:یەکێکی تر لەو حاڵەتانەی کە عاملی مفعول مطلقی تێدا حذف دەکرێ ئەوەیە کە ناو نراوە بە (مؤکد لنفسه)،و(مؤکّد لغیره).

جا مەبەست لە مؤکد لنفسه ئەوەیە کە دەکەوێتە پاش ڕستەیەك کە تەنها مانای ئەو ڕستەیە هەڵدەگرێ ومانای تر هەڵناگرێ،وەکو((لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ عُرْفَا))واتا:اعترافاً،لێرەدا اعترافاً:مصدرەو منصوبە بە فعلێکی حذف کراو بەواجبی،وتقدیرەکەی((أعترفُ اعترافاً))ئەمەش ناودەبرێ بە مؤکد لنفسه،چونکە مصدرەکە بەهێزکەری ڕستەکەی پێش خۆیەتی،کەئەو ڕستەیەش هەمان مانای مصدرەکەی هەیە،وهیچ مانایەکی تر هەڵناگرێ،ئەمەبوو مەبەستی ووتەی دانەر((فَالْمُبْتَـدَا))واتا:یەکەم لەودوو جۆرەی باسکراوە لە دوودێڕەکە[٢].

وە مؤکّد لغیره بریتیە:لەومصدرەی دەکەوێتە پاش ڕستەیەك ئەو ڕستەیە دەکرێ مانای مصدرەکە لە خۆ گرێ ودەکرێ مانایەکی تر لەخۆ گرێ،بەهۆی هێنانی ئەم مصدرە دەبێتە یەك مانا،وەکو((ابْنِي أَنْتَ حَقًّا صِرْفَا))لێرەدا حقاً:مصدرەو منصوبە بەفعلێکی حذف کراو

---

[١] ڕوونتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٩٥-یەکێکی تر لەو حاڵەتانەی کە عاملی مفعول مطلقی تێدا حذف دەکرێ بەواجبی ئەوەیە کە ناو نراوە بە (مؤکد لنفسه)واتامصدرەکە مانای ڕستەکەی پێش خۆی بەهێز دەکات کە هەردووکیان یەك مانایان هەیە،یان(مؤکّد لغیره)کە مانای ڕستەکەی پێش خۆی بەهێز دەکات کە ئەو ڕستەیە دەکرێ لەگەڵ مصدرەکەدا یەك نەبن لەڕووی ماناوە، نموونەی یەکەم.٢٩٦-وەکو ڕستەی((لَهُ عَلَيَّ أَلْفٌ عُرْفَا))واتا:ئەو هەزاری لەسەرمە دانی پێدا دەنێم، وە نموونەی دووەم وەکو((ابْنِي أَنْتَ حَقًّاصِرْفَا))تۆ کوڕمی بە ڕاستی وبێگومان.

[٢] واتا:دێڕی ٢٩٥و٢٩٦ی ئەلفیە.

بەواجبی،وتقدیرەکەی((احقُّهُ حقاً))وە ناو نراوە بە مؤکّد لغیره،لەبەر ئەوەی ووتەی((أَنتَ ابْنِي))دەکرێ مەبەست پێی کوڕی ڕاستەقینەی بێ،ودەکرێ مەبەست پێی کوڕی ڕاستەقینە نەبێ،بەڵکو مەبەست وەکو کوڕی وابێ لە سۆزوخۆشەویستیدا،بەلأم کاتێ ووتی((حقّاً))ئەوە مانای ڕستەکە بوو بەوەی کە مەبەست کوڕی ڕاستەقینەیە،کەواتا ڕستەکە ماناکەی بەهۆی مصدرەکەوە گۆڕا،لەبەر ئەوەی بەهۆی مصدرەکەوە تەنها یەك ماناهەڵدەگرێ،بۆیە ئەم مصدرە دەبێتە مؤکّد لغیره،لەبەر ماناجیای کارتێکارو کارتێکراو[1].

* * *

٢٩٧-كَذَاكَ ذُو التَّشْبِيهِ بَعْدَ جُمْلَهْ    كَ لِي بُكاً بُكَاءَ ذَاتِ عُضْلَهْ.[2]

واتا:هەروەها پێویستە لابردنی (حذف کردنی) عاملی مفعول مطلق ئەگەر مصدرە بۆ لێکچوواندن(التشبیه)بێ لە دوای ڕستەیەکەوە بێ کە ئەو ڕستەیە لەخۆبگرێ فاعلی مصدرەکە لەماناد‌ا، وەکو((لِزيدٍ صوتٌ صوتَ حِمارٍ، وله بكاءٌ بكاءَ الثكلى))لێرەدا((صوتَ حِمارٍ))مصدرەوبۆ لێکچوواندنە،ومنصوبە بە فعلێکی حذفکراو بە واجبی،وتقدیرەکەی: يُصَوِّتُ صوتَ حِمارٍ،لەپێش ئەم مصدرەوە ڕستەیەك هەیە کە بریتیە لە((لِزيدٍ صوتٌ))ئەم ڕستەیە لەخۆی

---

[1] مەبەس لەکارتێکار(المؤثر)مصدرەکەیە،وە مەبەست لە کارتێکراو(المؤثر فيه) ڕستەکەیە.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: هەروەهایەکێکی تر لەو حاڵەتانەی کە عاملی مفعول مطلقی تێدا حذف دەکرێ بەواجبی ئەوەیە کە ئەو مصدرە بۆ لێکچوواندن(التشبیه)بێ لە دوای ڕستەیەکەوە بێ کە فاعلەکەی وەکو ئەو وابێ،وەکو((لِي بُكاً بُكَاءَ ذَاتِ عُضْلَهْ))واتا:هەمە گریان وەکو گریانی کۆسکەوتە.

واتا:لەڕستەی((لِزيدٍ صوتٌ))ناوی زید لەڕووی إعرابەوە فاعل نیە،بەلأم لەڕووی ماناوە فاعلە.

**گرتووه فاعلەکە لەماناداً**[1]**،کە بریتیە لە((زید))،هەروەها**((بكاءَ الثكلى)) **ومنصوبە بە فعلێکی حذفکراو بە واجبی،وتقدیرەکەی:** يبكي بكاءَ الثكلى. **جا ئەگەر لەپێش ئەم مصدرەوە**[1] **ڕستە نەبێ ئەوە پێویستە مرفوع کرێ،وەکو**((صوتُهُ صوتُ حمارٍ وبكاؤه بكاءُ الثكلى))**،هەروەها ئەگەر لەپێشیوە ڕستە هەبوو بەڵام ڕستەکە فاعلی لەڕووی ماناوە لەخۆ نەگرتبوو،ئەوە لەم حاڵەتەشدا مصدرەکە منصوب نابێ ومرفوع دەبێ،وەکو**((هذا بكاءٌ بكاءُ الثكلى، وهذا صوتٌ صوتُ حِمارٍ)).

**جادانەر باسی ئەم مەرجەی نەکرد،بەڵام لە ناوەڕۆکی نموونەکانیدا دەفامرێتەوە.**

* * *

---

**(1) واتا:ئەو مصدرەی کە بۆ لێکچواندنە.**

**(1) واتا : لە ڕستەی (لزید صوت ) ناوی زید لە ڕووی اعرابەوە فاعل نیە بەڵام لە ڕووی ماناوە فاعلە.**

## المفعول له[1]

٢٩٨-يُنْصَبُ مَفْعُولاً لَهُ الْمَصْدَرُ إِنْ      أَبَانَ تَعْلِيلاً كَ جُدْ شُكْراً وَدِنْ

٢٩٩-وَهْوَ بِمَا يَعْمَلُ فِيهِ مُتَّحِدْ      وَقْتاً وَفَاعِلاً وَإِنْ شَرْطٌ فُقِدْ

٣٠٠-فَاجْرُرْهُ بِالْحَرْفِ وَلَيْسَ يَمْتَنِعْ      مَعَ الشُّرُوطِ كَ لِزُهْدٍ ذَا قَنِعْ.[2]

**مفعول له بريتيه له:مصدريك،كەهۆى كردارەكە بگەيێنێ،هاوبەش بێ لەگەڵ عاملەكەى:لە كات،وبكەر،وەكو((جُدْ شُكْراً))لێرەدا شُكراً:مصدرە،وبۆ هۆى فعلەكەيە،چونكە ماناكەى دەبێتە سەخى بە لەبەر سوپاسگوزارى خواى گەورە،هەروەها هاوبەشى عاملەكەيەتى كەبريتيەلە((جُدْ))[3]:لەڕووى كات،چونكە كاتى سوپاسگوزارييەكەوكاتى سەخاوەتەكە يەكن،هەروەها لەڕووى فاعلەوە،چونكە فاعلى سەخاوەتەكە كە بريتيە لەكەسى**

---

[1] ناوى دووەمە لەناوە منصوبەكان ،وبە(المفعول لاجله)يش ناو دەبرێ، وبەكوردى دەبێتە {هاوەڵكارى_يان بەركارى_هۆى}.

[2] پوختەى ماناى ئەم سێ دێرەى ئەلفيە:٢٩٨-منصوب دەبێ مصدر ودەبێتە مفعول له ئەگەر هۆى كردارەكەى ڕوون دەكردەوە،وەكو نموونەى((جُدْ شُكْراً وَدِنْ))واتا:سەخى بە لەبەر سوپاسگوزارى،وملكەچ بە لەبەر فەرمانبەرى بۆخواى گەورە،لێرەدا ((شُكْراً))مفعول له بۆ فعلى((جُدْ))،وە فعلى((وَدِنْ))كە بەواتاى ملكەچ بە دێ(مفعول له)كەى حذف كراوە وتقديرەكەى((دِنْ طاعةً)).٢٩٩-پێويستە مفعول له ولەگەڵ عاملەكەى_واتا فعلەكە_يەك بن لە ڕووى كات وبكەر،جا ئەگەر يەكێ لەم مەرجانەى لەدەستدا.٣٠٠-ئەوە مجرورى بكە بە حەرفە جەڕێ كە بۆ هۆ(تعليل)بێ، ئەم مجروركردنەى مفعول بە حەرفى جەڕ ڕێگە پێدراوە لەگەڵ بوونى مەرجەكانيش،وەكو نموونەى(لِزُهْدٍ ذَا قَنِعْ)واتا:ئەو ڕازييە بەوبەشەى پێيدراوە لەبەر ئەوەى دونيا بەكەم گر(زاهد)ە.

[3] ((جُدْ))فعلى ئەمرە وبەماناى سەخى بە دێ،ولە((جادَ،يَجُودُ))وەرگيراوە، لەڕووى صەرفيەوە پێى دەوترێ فعلى((اجوف))واتا:حەرفى دووەمى علەيە.

دوێنـدراو(المخاطـب) فـاعلی سوپاسـگوزاریەکە یـەك کەسـن. هـەروەها نموونـەی((ضربتُ ابني تأديباً))لێـرەدا تأديباً:مـصدرەو، هـۆی کردارەکـە دەگەیێنێ،لەبـەر ئـەوەی ڕاسـت ودروسـتە لـە وەڵامـی((لِمَ فعلتَ الضرب؟))دا بێ،وە هاوبەشی (ضربتُ)ە:لەڕووی کات وبکەر.

حوکمی مفعول لە دروستێتی منصوب بوونە ئەگەر سێ مەرجەکەی تێدا بوو-مەبەست لە سێ مەرجەکە ئەوەیە مصدر بێ،و بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی کردارەکە بێ،ولەگەڵ عاملەکەی یەك بێ لەڕووی کات وبکەر-.

جائەگـەر مـەرجێك لەمەرجانـەی لەدەسـتدا ئـەوە پێویـستە مجـرور بکـرێ بـە حـەرفی هـۆی((تعلیـل))،کـە بریتیـە لـە حـەرفی لام،یـان حـەرفی((مـنْ))یـان ((في))،یـان حەرفی((باء))،نموونەی ئەوەی کە مصدر نەبێ((جئتُك لِلسَمْنِ))[1]،وە نموونەی ئەوەی لە گـەڵ عاملەکـەی یـەك نـەبن لـەڕووی کاتـەوە((جئتك اليوم للإكرام غداً))[2]، وە نموونـەی ئەوەی لە گەڵ عاملەکەی یەك نەبن لەڕووی بکەرەوە((جاء زيدٌ لإكرامِ عمرٍو لَهُ))[3].

وە نادروسـت نیـە مجـرور کردنـی مفعـول لـە لەگـەڵ بـوونی هـەر سـێ مەجەکانیش،وەکو((هذا قَنِعَ لزُهْدٍ)). هەروەها هەندێ لە زانایان پێیان وایە مەرج نیە بۆ منصوب بوونی مفعول لە تەنها ئەوە نەبێ کە مصدر بێ،وە مەرج نیە یەك بێ لەگەڵ عاملەکەی لەڕووی کات وبکەرەوە، بۆیە ئەمان بە دروستی دەزانن منصوب کردنی((إكرامِ))لە دوو نموونەکەی پێشوو، واللهُ أعلم

* * *

---

[1] لەم ڕستەیەدا((لِلسَمْنِ))کە بەمانای (ڕۆن)دێ ،مفعول لە ومصدرنیە،بۆیە دەبێ مجرور بێ بە حەرفی جەڕ،چونکە یەکەم مەرجی تێدا نیە.

[2] لەم ڕستەیەدا کاتی عاملەکە((جئتك))ئەمڕۆیە،وکاتی مفعول لە((للإكرام)) سبەینێیە،بۆیە منصوب نابێ .

[3] لەم ڕستەیەشدا فاعلی فعلەکە -عاملەکە-بریتیە لە((زيدٌ))،وە فاعلی مفعول لە بریتیە لە((عمرو))،بۆیە دەبێ مفعول لە مجرور بێ.

٣٠١-وَقَلَّ أَنْ يَصْحَبَهَا الْمُجَــرَّدُ وَالعَكْسُ فى مَصْحُوبِ أَلْ وَأَنْشَدُوا
٣٠٢-لاَ أَقْعُـدُ الْجُبْنَ عَنِ الْهَيْجَاءِ وَلَوْ تَوَالَتْ زُمَـــرُ الأَعْـدَاءِ.[(١)]

**مفعـول لــە کــە هــەموو مەرجــەکانی تێــدا بــێ ســێ حاڵــەتی هەیــە:یــەکێکیان:ئەوەیــە خــالی بــێ لــە ئــەلیف ولام ولــەإضــافــە، دووەم:ئەلیف ولامـی پێوە بـێ ،سێیەم:إضافەکرابێ، هـەر یـەك لـەم حاڵەتانـەش دروسـتە مجروربـێ بـە حـەرفی هۆبـوون(التعلیـل)،بـەڵام زۆرتـر وایـە ئـەوەی کـە خـالی بـێ لـە ئـەلیف ولام وإضـافـە منـصوب بێ،وەکو**((ضربتُ ابني تأديباً))**،وەدروستە مجروریش بێ،ودەڵێی**((ضربت ابني لتأديبٍ))**،پێشەوا جـەزولی پێـی وایـە کـە دروسـت نیـە مجـرور کردنی،ئەم بۆچوونەش پێچەوانەی ئەوەیە کە نحوزانـان فەرموویانـە، وە ئەو(مفعول لە)ی کە ئەلیف ولامـی پێوەبێ پێچەوانەی ئەوەیە کە ئەلیف ولامی پێوە نیە، وزۆرتر وایە مجروربێ،ودروستیشە منصوب بێ،کــەواتا نموونــەی**((ضربْتُ ابني للتأديب))**زۆرتــرە لــە**((ضربْتُ ابني التأديبَ))**،نموونەی ئەوەی هاتووە بە منصوبی ئەوەیە کە هۆنیوێتیەوە دانەر:**

**ش١٦٣/ *لاَ أَقْعُدُ الْجُبْنَ عَنِ الْهَيْجَاءِ[(٢)] ***

**لێرەدا((الْجُبْنَ))مفعول لە ،واتا:سستی ناکەم لەبەرترسان،هەروەها وەکو ووتەی:**

---

**[(١)] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە:٣٠١-کەمە بوونی حەرفی جەر بەو(مفعول لە)ی ئەلیف ولامی پێوەنەبێ وإضافە نەکرابێ، بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئەلیف ولامی پێوەیە، وە هۆنیویانەتەوە.٣٠٢-هۆنراوەی ((لاَ أَقْعُدُ الْجُبْنَ عَنِ الْهَيْجَاءِ وَلَوْ تَوَالَتْ زُمَرُ الأَعْدَاءِ))لەم شعرەدا -کە دواتر مانای دەکەین-مفعول لە کە((الْجُبْنَ)) ئەلیف ولامی پێوەیە وحەرفی جەری پێوە نەلکاوە،ئەمەش کەمە لە زمانی عەرەبیدا.**

**[(٢)] ماناوبەڵگەی ئەم نیو دێرە: سستی ناکەم لەترسا بۆ چوونە جەنگ. بەڵگەکەی((الْجُبْنَ))مفعول لاجلە و ئەلیف ولامی پێوەیە ومنصوب کراوە.**

ش١٦٤/ فَلَيْتَ لى بِهِمْ قَوماً إذا رَكِبُوا    شَنُّوا الإغَارَةَ فُرْسَاناً ورُكْبَانَا.[١]

هەروەها ئەوەی كە إضافە كراوە ئەويش هەردوو حاڵەكەی تێدا دروستە-منصوب بوون،ومجروربوون-وەكو يەك[٢]،كەوابوو دەڵێی((ضربتُ ابني تأديبَهُ ولتأديبِهِ))،ئەمەش[٣] دەكرێ بفامرێتەوە لەقسەی دانەر،لەبەر ئەوەی كاتێ باسی ئەوەی كرد كە كەمە مجروربوونی خالی لە ئەليف ولام ومنصوب بوونی ئەوەی ئەليف ولامی پێوەيە،زانرا ئەوەی كە مضافە هيچ كام لەم دووانەی بۆ كەم نيە وهەردووكيان وەكو يەكن،بەڵكو هەردوو حاڵەتەكەی زۆرە،لەوەی كە هاتووە بە منصوبی فەرموودەی خوای گەورە﴿يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾[٤]،وە وەكو ووتەی:

ش١٦٥/ وَأَغْفِرُ عَوْرَاءَ الكَرِيمِ ادِّخَارَه    وَأُعْرِضُ عَنْ شَتْمِ اللَّئِيمِ تَكَرُّمَا.[٥]

* * *

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: خۆزگە لەبری ئەم گەلەم خەڵكانێكی ترم هەبوايە كاتێ كە هێرشيان دەكرد دوژمنيان پەرت وبەڵاوە بكردايە بە سواری وپيادەی . بەڵگەكەی((الإغَارَةَ))مفعول لاجله و ئەليف ولامی پێوەيە ومنصوب كراوە.

[٢] واتا:بەبێ ئەوەی يەكێكيان بەهێزتر و زۆرتر بێ.

[٣] واتا:منصوب بوون ومجرور بوون وەكو يەك لەم حاڵەتەدا.

[٤] بەشێكە لە ئايەتی ژمارە(١٩)ی سورەتی(البقره)،كورتەی ماناكەی{پەنجەكانيان دەكەن بە گوێياندا لەبەر گرمەی هەورە تريشقە بۆ خۆپاراستن لە مردن...}إعرابەكەی{ يجعلون/فعل وفاعل ،أصابعَ/مفعول به،وهو مضاف ،هم/ضمير متصل مبني في محل جرّ مضاف إليه، في آذانهم/جارومجرور متعلقان بـ(يجعلون)،من الصواعق/جارومجرور متعلقان بـ(يجعلون)، حذرَ/مفعول له منصوب،وهو مضاف،الموت/مضاف إليه مجرور . الشاهد فيها:حذر مفعول له منصوب ،وهو مضاف يجوز فيه النصب والجر على السواء.

[٥] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: چاو پۆشی دەكەم لە قسەی ناشيرينی كەسی بەرێز لەبەر مانەوەی خۆشەويستی ،وە ڕوو وەردەگێڕم لە جنێوی خراپەكار لەبەر ڕێزی خۆم. بەڵگەكەی ((ادِّخَارَه)) مفعول لاجله يەو منصوبە لە كاتێكدا مضافە وە دروستە مجرور بێ و بوترێ((لادخاره)).

## المفعولُ فيهِ ( المُسَمَّى ظَرْفاً )[(١)]

٣٠٢- الظَّرْفُ وَقْتٌ أَوْ مَكَانٌ ضُمِّنَا     في بِاطِّرَادٍ ،كَهُنَا امْكُثْ أَزْمُنَا.[(٢)]

**دانەر پێناسەی هاوەڵفەرمانی کرد بەوەی کە بریتیە لە:کات،-یان شوێن- لە خۆ گری مانای((في)) بەزۆری،وەکو((هُنَا امكثْ أزمنا))لێرەدا (هُنا):هاوەڵفەرمانی شوێنە،وە(أزمُناً)هاوەڵفەرمانی کاتیە،هەردووکیان مانای((في))لەخۆ دەگرن چونکە ماناکەی:** امكث في هذا الموضِع ،وفي أَزْمُنٍ.

**جا خۆی پاراست دانەر بەووتەی((لەخۆ گری مانای في))لەو ناوە شوێنی وکاتییانەی مانای((في))لەخۆ ناگرن،وەکو ئەوەی بکرێنە مبتدا،یان خبر ، وەکو**((يومُ الجمعة يومٌ مبارك، ويومُ عرفةَ يومٌ مباركٌ،والدارُ لزيدٍ))**لەم حاڵەتانەدا نابنە ظرف[(٣)]،هەروەها ئەگەر ببنە مجرور،وەکو**(( سرْتُ في يومِ الجمعة)،و((جلسْتُ في الدار))**،زیاد لەوەش ڕاجیای هەیە لەوەی ئەمە[(٤)] ناونرێ بە هاوەڵفەرمان لە زاراوە(الاصطلاح)دا[(٥)]،هەروەها ئەگەر هاوەڵفەرمان ببێتە مفعول بە،**

---

[(١)] جۆری سێیەمە لە ناوە منصوبەکان ، لە شەرحەکەدا پێناسە دەکرێ ،ولە ڕێزمانی کوردیدا پێی دەوترێ {ئاوەڵفەرمان_یان هاوەڵفەرمان یان هاوەڵکار}.

[(٢)] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: هاوەڵفەرمان کاتە یان شوێنە لەخۆ گری،مانای حەرفی جەڕی((في))-کە بریتیە لە ظرفیەت-وەکو نموونەی((هُنَا امكثْ أزمنا))واتا:لێرەدا بمێنەرەوە بۆ ماوەیەك.

[(٣)] واتا:نابنە مفعول فیە .

[(٤)] واتا:ئەمەی هاوەڵفەرمان مانی ((في))لەخۆ نەگری،ونەبێتە مفعول فیە.

[(٥)] واتا:لە زاراوەی نحودا خیلاف هەیە ،کە ئایە دروستە بە((ظرف))ی کەمانای ((في))لەخۆناگری بوترێ مفعول فیە یان((ظرف))،کە لەڕووی زمانەوانیەوە دروستە پێی بوترێ ((ظرف))بەبێ ڕاجیای.

وەکو((بنیتُ الدارَ،وشهدْتُ یومَ الجمل))[1].

هەروەها خۆی پاراست دانەر بەووتەی((باطّراد))[2]لە وێنەی((دخلتُ البیتَ ، وسكنتُ الدارَ، وذهبتُ الشأم))هەر یەك لە((البیتَ ،والدار،و الشأم))مانای حەرفی((فی)) لەخۆ دەگرن بەلاَم بە جێگیری وزۆری نا،لەبەر ئەوەی ناوی شوێنە تایبەتەکان[3] دروست نیە حەرفی((فی))لەگەڵیاندا حذفکرێ،کەوابوو ((البیتَ ،والدار،و الشأم))لەو نموونانەی باسکران منصوب نین بەوەی کە مفعول فیە((الظرف)) بن،بەڵکو منصوب بن بە لێکچوون((التشبیە))بە مفعول بە،لەبەر ئەوەی هاوەڵفەرمان((الظرف)) ئەوەیە:کە مانای حەرفی((فی))لەخۆگرێت بە نەگۆڕی وبەردەوامی،بەلاَم ئەمان[4] مانای حەرفی((فی)) لەخۆ دەگرن بە بەردەوامی نا.

ئەمە ڕاو بۆچوونی دانەر بوو،بەلاَم ئەم بۆچوونە قسەهەڵدەگرێ،چونکە ئەگەر ئەم سێ ناوە وهاوشێوەکانیان منصوب بن بە لێکچوون((التشبیە))بە مفعول بە ئەوە نابێ مانای حەرفی((فی))لەخۆگرن،لەبەر ئەوەی مفعول بە مانای حەرفی((فی)) لەخۆ ناگرێ،کەواتا ئەوەشی لێکچووی بێ نابێ مانای حەرفی((فی))لەخۆ گرێ، کەوابوو پێویستی بەوە نەدەکرد بە ووتەی((باطّراد))دەرکرێن،چونکە ئەمان[5] دەرچوون بە ووتەی((ما ضُمِّنَ معنی فی))،واللهُ تعالی أعلمُ.

* * *

---

[1] لەم دوو نموونەیەدا هەردوو ووشەی((الدار ،یوم الجمل))نابنە هاوەڵفەرمان((مفعول فیە))،بەڵکو دەبنە مفعول بە.

[2] ووشەی((اطّراد)) واتا:یاسای نەگۆڕو جێگیر،هەروەها بە واتای زۆر وبەردەوامیش بە کاردێ ،لێرەدا هەردوو ماناکە دروستە.

[3] مەبەست لە ناوی شوێنە تایبەتەکان ((أسماء المكان المختصة))ئەوانەن کە سنووریان دیاریکراو وزانراو بێ.

[4] واتا:هەرسێ ناوی((البیتَ ،والدار،و الشأم))لەونموونانەی باسکران.

[5] واتا:هەرسێ ناوی((البیتَ ،والدار،و الشأم)).

## حوكمی مفعول فيه وئەوەی عامليّتی((ناصبە))

٤٠٣–فَانْصِبْهُ بِالْوَاقِعِ فِيهِ مُظْهَراً كَانَ، وَإِلاَّ فَانْـوِهِ مُقَـدَّرَا.[١]

**حوكمی ئەوەی مانای حەرفی((فی))لەخۆ دەگرێ لە ناوەكانی كات وشوێن منصوب بوونە،وەئەوەی منصوبی دەكات ئەو شتەیە كە تێیدا ڕووی داوە[٢]،ئەویش بریتیە لە چاووگ((المصدر))،وەكو((عجبْتُ مِنْ ضربِك زيداً يومَ الجمعةِ عندَ الأمير))[٣]،یان فعل،وەكو ((ضَرَبْتُ زيداً يومَ الجمعةِ أمامَ الأمير))[٤]،یان وەصف[٥]،وەكو((أنا ضارِبٌ زيداً اليومَ عندك))[٦].**

**جا بەپێی قسەی دیاری دانەر منصوبی ناكات تەنها ئەوە نەبێ كە تێیدا ڕووی داوە،كە بریتیە لە مصدر،بەڵام وا نیە،بەڵكو منصوبی دەكات مصدرو جگە لەمصدریش:وەكو فعل و وەصف.**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: منصوب بكە مفعول فیە بەو ئیشەی تێیدا ڕووی داوە–واتا:بە فعل وهاوشێوەی فعل–ئەگەر باسكراو((مذكور))بوو،یان باس نەكراو((مقدّر))بوو.

[٢] چونكە ناوەكانی كات وشوێن ((أسماء الزمان والمكان))دەبنە مفعول فیە واتا:ئەوەی كە كار((فعل))ەكەی تێیدا كراوە .

[٣] لەم ڕستەیەدا((يومَ،وعند))ناوی كات وشوێن((ظرف))ن ومنصوبن،وئەوەی منصوبی كردوون–واتا:عاملەكەیان–بریتیە لە((ضَرْبِك))كە مصدرەو عەمەل دەكات.

[٤] لەم ڕستەیەشدا هەردوو ناوی((يومَ الجمعة ،وعندَ))((مفعول فيه –ظرف– ))ن ومنصوبن،وئەوەی منصوبی كردوون بریتیە لە ((ضَرَبْتُ)) كە فعلە.

[٥] مەبەست لەوەصف:اسمی فاعل واسمی مفعول وصفەی مشبەو.....

[٦] لەم ڕستەیەدا هەردوو ناوی((اليومَ ،وعندَ))((مفعول فيه –ظرف– ))ن ومنصوبن،وئەوەی منصوبی كردوون بریتیە لە((ضارِبٌ))اسمی فاعلە ووەصفە.

فرسخ: لە بنەڕەتدا ووشەیەكی فارسیە،و پێوەرێكی كۆنە لە پێوەرەكانی پێوانەی درێژی كە بەسێ میل مەزەندە دەكرێ، كە دەكاتە نزیكەی((٥٥٤٠))مەتر.

واتا:عاملی((يومَ الجمعة وفرسخين))كە هەردووكیان مفعول فيهن باس نەكراوە.

لەم ڕستەیەدا((عندك))مفعول فيه و منصوبە وعاملەكەی باسنەكراوە بە واجبی.

هـەروەها ئـەوەی کـە منـصوبی دەکـات((الناصـب لـە))یـان باسـدەکریٚ لەڕسـتەکەدا وەکـو نموونـە هێنرایـەوە،یان بـاس نـەکراو((محـذوف))ـە: بەدروستێتی(جوازاً)،وەکو ئەوەی بوتریٚ((متی جئْتَ؟))تۆش دەڵێی((یومَ الجمعـة))،وە وەکـو بـوتریٚ((کَـمْ سـرْتَ؟))تـۆش دەڵێـی((فَرْسَـخَیْنِ)) ، تقدیرەکـەی((جئتُ یومَ الجمعة ، وسِرْتُ فرسخین))، یـان بـە واجبـێتی:ئـەویش وەکو ئەوەی ظرفەکە ببێتە ئاوەڵناو((صفە))،وەکو((مررتُ برجلٍ عندك)) ،یان ببێتـە حـال،وەکو((مررت بزیدٍ عندك)) یـان ببێتـە خـبر لـە ئێـستادا،یان لـە بنەڕەتـدا،وەکو((زیدٌ عندك،وظننتُ زیداً عندك))،کـەواتا عامـل-واتـا ئـەوەی ظـرفەکـەی منـصوب کـردووە-لـە نموونانـەدا باسنەکراو((محذوف))ـە بـە واجـبی، تقدیرەکـەی لـە جگـە لـە صـلەدا[1] بریتیـە لـە((اسـتقرّ))یـان ((مُستقرٌّ))،بەلاّم لـە صلەدا تـەنها بریتیـە لـە((استقرّ))،چـونکە صلە دەبیٚ ڕستە((جملە))بیٚ، دیارە فعلیش لەگەڵ فاعلەکەی دەبێتە جملە،بەلاّم اسمی فاعل لەگەڵ فاعلەکەی نابێتە جملە، واللە أعلمْ.

* * *

---

[1] پێشتتر لە بابەتی ((الاسم الموصول))باسی ((صلە))مان کرد.

## مەرجی ئەو ناوی کات و شوێنانەی دەبنە مفعول فیه

٣٠٥-وَكُلُّ وَقْتٍ قَابِلٌ ذَاكَ وَمَـا يَقْبَلُـهُ الْمَكَانُ إِلاَّ مُبْهَمَـا
٣٠٦-نَحْوُ الْجِهَاتِ وَالْمَقَادِيرِ وَمَا صِيغَ مِنَ الفِعْلِ كَمَرْمَى مِنْ رَمَى[1]

واتا ناوی کاتەکان دەبنە مفعول فیه:نادیار[2] بن،وەکو((سِرْتُ لحظةً،وساعةً))[3]،یان دیار وتایبەت بن:ئەویش بەهۆی ئەوەی إضافەکرابن،وەکو((سرتُ يومَ الجمعةِ))،یان بەهۆی هێنانی ئاوەڵناو((صفه))بۆی وەکو ((سرتُ يوماً طويلاً))،یان بە هۆی ژمارە وەکو((سرت يومين)).[4]

بەڵام ناوەکانی شوێن نابنە مفعول فیه مەگەر دوو جۆریان: یەکێکیان:نادیارەکانە ،دووەمیان:ئەوەیە کە لەمصدر دروستکرابێ بەو مەرجەی باسی دەکەین، جا شوێنە نادیارەکان وەکو شەش ڕووەکە،کە بریتین لە((سەروو"فوق"، خوار-یان ژێر-("تحت" ،

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٠٥-هەموو هاوەڵفەرمانێکی کاتی(الظرف الزمان) دەکرێ ببێتە مفعول فیه،بەڵام هاوەڵفەرمانی شوێن نابێتە مفعول فیه مەگەر نادیار(مبهم)بێ_مەبەست لە نادیار ئەوەیە کە سنوری دیاری کراوی نەبێ_. ٣٠٦-وەکو ئەو هاوەڵفەرمانانەی بۆ ڕووەکان(الجهات)ن،وە ئەوانەی بۆ ئەندازە(المقادير)ن،هەروەها ئەوەی کە دروستکراوە لە فعل وەکو((مَرْمَى))-واتاشوێنی تیر هاویشتن_کە لەفعلی رمی دروستکراوە.

[2] مەبەست لە هاوەڵفەرمانی نادیار(الظرف المبهم) ئەوەیە کە سنوری دیاری کراوی نەبێ،بە پێچەوانەی دیار(المختص).

[3] لەم ڕستەیەدا هەریەك لە ناوەکانی((لحظةً،وساعةً)) کە بەمانای ماوەیەك دێن کاتی نادیارن،لێرەدا ووشەی((ساعة))بەمانای ماوەیەك دێت نەوەك بەمانای ٦٠خولەك.

[4] واتا:هاوەڵفەرمانی نادیار بە هۆی سێ شتەوە دەکرێتە دیار:١-إضافة ،٢-وەصفکردن ،٣-هێنانی ژمارە بۆی.

ڕاست"یمین"،چەپ"شمال"،پێش"امام"،پاش"خلف"))هەروەها وەکو ئەندازەکان"المقادیر"،وەکو((غلوة ،ومیل ،وفرسخ ،وبرید))[١]، دەڵێی((جلستُ فوقَ الدار، وسرْتُ غَلْوةً))منصوبیان دەکەیت لەسەر ئەوەی کە هاوەڵفەرمانن[٢].

هەروەها ئەو هاوەڵفەرمانەی کەدروستکراوە لە مصدر،وەکو((مَجْلِسَ زيدٍ، ومَقْعَدَهُ))ئەوە مەرجی منصوب بوونەکەی بەقیاسی_ئەوەیە کە عاملەکەی لە هەمان لفظی خۆی بێ،وەکو((قعدتُ مَقْعَدَ زيدٍ، وجلست مَجْلِسَ عمرٍو))[٣]،جا ئەگەر عاملەکەی لە لفظی خۆی نەبوو ئەوە پێویستە مجرور کرێ بە حەرفی جەڕی(فی)،وەکو((جلستُ في مَرْمَى زيدٍ))،ناڵێی((جلست مَرْمَى زيدٍ))مەگەر بە ڕیزپەڕ"شاذ"ی.

لەوەی کە هاتبێ لەمە[٤] ووتەیان((هو مِنِّي مَقْعَدَ القَابِلَةِ ، ومَزْجَرَ الْكَلْبِ ، ومَنَاطَ الثُّرَيَّا))[٥]،واتا:بوونی ئەو لەمنەوە وەکو نزیکی مامانە ،وەوەکو دووری

---

[١] ئەم چوار ناوە ئەندازەن کە کۆن بەکار هاتوون ،وماناکانیان {غلوة واتا:ئەندازەی تیرهاوێژێك کە دەکاتە نزیکەی ٣٠٠تا٤٠٠مەتر ،میل دوو جۆری هەیە:میلی وشکانی ١٦٠٩مەترە ،وە میلی دەریایی ١٨٥٢مەترە ، فرسخ واتا:سێ میل ، برید واتا:زانایان لە ئەندازەی برید ڕایان جیایە ،وزۆربەیان پێیان وایە کە ١٢میلە.}

[٢] واتا:دەبنە مفعول فیە.

[٣] لەم دوو ڕستەیەدا (مَقْعَدَ)معمولی(قعدتُ) ،وە(مَجْلِسَ)معمولی(جلستُ)،هەردووکیان لە لفظی عاملەکەیانن.

[٤] واتا:لەوەی کە عاملی ظرفەکە لە لفظی خۆی نەبێ ،ومجرور نەبێ بە حەرفی جەڕ.

[٥] ئەم سێ ڕستەیە عەرەب وەکو پەند بەکاری دێنن ،یەکەمیان((هو مِنِّي مَقْعَدَ القَابِلَةِ))واتا:ئەو نزیکە لە منەوە وەکو نزیکی مامان ،وەدووەمیان((ومَزْجَرَ الْكَلْبِ))واتا: ئەو دوورە لەمنەوە وەکو دووری دوورخستنەوەی سەگ ،سێیەمیان((ومَنَاطَ الثُّرَيَّا))واتا:ئەو بەرزوبەڕێزە وەکو بەرزی ئەستێرە،لەم سێ ڕستەیەدا هەریەك لە

دوورخستنەوەی سەگ ،وەوەکو بەرزی ئەستێرەکان، بەپێی یاسا(القیاس)دەبیٚ((هو منّي في مقعدِ القابلة ، وفي مزجرِ الكلب ، وفي مناطِ الثريا))بوونایە[1]،بەلاّم بە دەرچوون لەیاسا((شذوذاً)) منصوب بوون،وە نابیٚ نموونەی تریش قیاس کریٚتە سەریان ،بە پیٚچەوانەی بۆچوونی پیٚشەوا کسائی، بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:

٣٠٧–وَشَرْطُ كَوْنِ ذَا مَقِيساً أَنْ يَقَعْ ظَرْفاً لِمَا في أَصْلِهِ مَعْهُ اجْتَمَعْ.[2]

واتا:مەرجی منصوب بوونی ئەو ظرفەی وەرگیراوە لە مصدرەوە بە قیاسی:ئەوەیە کە ظرفەکە لەگەڵ عاملەکەی بنچینەیان هەبیٚ،واتا:منصوب بیٚ بەو شتەی کە لە بنچینەدا یەك بن،وەکو کۆبوونەوەی((جلستُ)) لەگەڵ((مَجْلِس))لەوەی هەردوکیان لە(الجلوس)ـەوە وەرگیراون،کەوابوو بنچینەی هەردووکیان یەکیٚکە کەبریتیە لە(الجلوس).

جا بەپیٚی قسەی ئاشکرای دانەر بیٚ ئەندازەکان وئەوەی لە مصدر وەرگیراوە نادیارن،جا ئەندازەکان ئەوە بۆچوونی زۆرینە(جمهور)ـی زانایان وایە کە هاوەڵفەرمانی نادیارن،لەبەر ئەوەی –هەرچەندە ئەندازەیان دیارە– بەلاّم سیفەتیان نادیارە، وە مامۆستا ئەبو عەلی شەلەوبین پیٚی وایە کە ئەندازەکان هاوەڵفەرمانی نادیارنین،لەبەر ئەوەی ئەندازەیان زانراوە ، وە ئەوەی کە وەرگیراوە لە مصدرەوە ئەوە دەکریٚ نادیاربیٚ،وەکو((جلستُ مَجْلِساً))،وەدەکریٚ تایبەت ودیار بیٚ وەکو((جلستُ مَجْلِسَ زيدٍ)).

---

ناوەکانی(مَقْعَدَ ، ومَزْجَرَ،مَنَاطَ)ظرفن وعاملەکەیان لە لفظی خۆیان نین ومجروریش نین بە حەرفی جەر ئەمەش شازە.

[1] واتا:دەبوو مجرور بوونایە بە حەرفی جەر ،لەبەر ئەوەی عاملەکەیان لە لفظی خۆیان نیە وەکو ووتمان.

[2] پوختەی مانای ئەم دیٚڕەی ئەلفیە: مەرجی ئەو ظرفەی منصوب بیٚ بە پیٚی یاسا ئەوەیە کە لە گەڵ عاملەکەیدا یەك بنچینەیان هەبیٚ واتا:ظرفەکەوعاملەکەی لفظیان یەك بیٚ.

هــەروەها بــەپێی قــسەی ئاشــكرای دانــەر بــێ(مَرْمَـى)[1] وەرگــیراوە لــە فعلی(رمی)،ئەمەش بۆچوونی بەصرێكان نیە،چونكە بۆچوونی ئەوان وایە كە لە مصدرەوە وەرگیراوە، نەوەك لە فعلەوە[2].

هەروەها ئەوە جێگیر بوو كە شوێنی تایبەت-كەبریتیە لەو شتەی سنوری دیـاریكراوی هـەبێ-منـصوب نـابێ بـەمفعول فیـە، وەبزانـە كـە بیـسراوە منـصوب بـوونی هـەموو شـوێنێكی تایبـەت لەگـەڵ هـەردوو فعلـی((دخـل ، وسـكن))،هـەروەها منـصوب بـوونی نـاوی((الـشأم)) لەگـەڵ فعلـی((ذهـبَ))، وەكـو((دخلـتُ البيـتَ ، وسـكنتُ الـدارَ ، وذهبـتُ الشَّأمَ))جـا زانایـان بۆچـوونیان جیایە لەمەدا[3]، ووتراوە:منصوبن لەسەر ئەوەی كە(مفعول فیە)ن بە شاذی ،وە هەندێكی تر ووتویانە:كە منصوبن لەسەر ئەوەی كە حەرفی جەڕیان لێ لابراوە،وئەصــڵەی((دخلــتُ في الــدار))بــووەو حەرفــە جەڕەكــەی حــذف كراوە،ودواتـر نـاوی((الـدار))منـصوب بووە،وەكـو منـصوب بـوونی((مـررتُ زيداً))، وهەندێكی تر ووتویانە:كە منصوبن لەسـەر لێكچوونیان بە مفعول بە.

* * *

---

[1] كە لە دێڕی "٣٠٦"دا باسی كرد.

[2] بۆچوونی بەصرێكان وایە كە مصدر ئەصڵ وبنچینەیە بۆ سەرجەم ووشەوەرگیراوەكان"المشتقات".

[3] واتا:لەمنصوب بوونی ناوەكانی((البيت ،الدار ،الشأم))لەو سێ نموونەیەوهاو شێوەكانیان.

٣٠٨–وَمَا يُرَى ظَرْفاً وَغَيْـرَ ظَـرْفِ      فَذَاكَ ذُو تَصَرُّفٍ فى العُـرْفِ
٣٠٩–وَغَيْرُ ذِى التَّصَرُّفِ الَّذِى لَزِمْ      ظَرْفِيَّةً أَوْ شِبْهَهَا مِنَ الكَلِـمْ.[1]

**دابەش دەبن ناوەکانی کات وناوەکانی شوێن بۆ:گۆڕاو"متصرف" ، وەنەگۆڕاو"غیر متصرف"،جا متصرف لە هاوەڵفەرمانی کاتی وشوێنی ئەوەیە کە بەکار بێ بە هاوەڵفەرمانی، وبەناوی تریش ،وەکو((یوم ، ومکان))بێگومان هەریەك لەم دووانە بەکاردێن بەوەی هاوەڵفەرمان بن،وەکو((**سِرْتُ یوماً ،وجَلسْتُ مکاناً**))،وە بەکاردێن بەوەی مبتدا بن،وەکو((**یومُ الجمعةِ یومٌ مبارك ، ومکانُك حَسَنٌ**))،وە بەکاردێن بەوەی فاعل بن،وەکو((**جاء یومُ الجمعةِ ، وارْتَفَعَ مکانُك**)).

**وە ئەوەی متصرف نیە بریتیە :لەوەی کە تەنها بەهاوەڵفەرمانی یان هاو شێوەی هاوەڵفەرمانی بەکاردێ ،وەکو ووشەی((سَحَرَ))ئەگەر مەبەستت پێی پارشێوی ڕۆژێکی دیاریکراو بێ ،جا ئەگەر مەبەستت پێی پارشێوی ڕۆژێکی دیاریکراو نەبوو ئەوە دەبێتە متصرف،وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿**إِلَّا آلَ لُوطٍ نَجَّيْنَاهُمْ بِسَحَرٍ**﴾[2]، وە ووشەی((فوق))وەکو((**جلستُ فوقَ الدار**))،**

---

**[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٠٨–لەناوەکانی شوێن وکات–ئەوانەیان کە دەکرێ بەکاربێن وەکو هاوەڵفەرمان(الظرف)،ووەکو شتی تریش ئەوە پێی دەڵێن ظرفی متصرف لە عورفی نحویاندا.٣٠٩–وە ئەوانەی کە متصرف نین ئەوەن کە تەنها بە هاوەڵفەرمانی یان هاوشێوەی هاوەڵفەرمانی بەکاردێن.**

**[2] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٣٤)ی سورەتی(القمر)،کورتەی ماناکەی{جگە لەکەس وکاری پێغەمبەر لوط–علیه السلام– کە لە بەرە بەیاندا ڕزگارمان کردن}. إعرابەکەی: إلاّ/ حرف استثناء ،آلَ/ مستثنی منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة ،وهو مضاف .لوطٍ/ مضاف إليه مجرور ، نجّيْناهُمْ/ فعل وفاعل ومفعول به ،والجملة الفعلية في محل نصب حال بسَحَرٍ/جارومجرور متعلقان**

کەواتا هەریەك لە((سحر ،وفوق))تەنها بە هاوەڵناوی بەکاردێن[1].
وە نموونەی ئەوەی کە بەهاوەڵفەرمانی وهاوشێوەی هاوەلفەرمانی بەکار دێ ووشەی((عند،ولدُن))،مەبەست لە هاوشێوەبوونی هاوەڵفەرمانی ئەوەیە دەرناچێ لە هاوەڵفەرمانی مەگەر بە بەکارهێنانی بەمجروری بە حەرفی((من))،وەکو((خرجْتُ مِنْ عندِ زيدٍ))،وە ووشەی((عند))مجرور نابێ مەگەر بە حەرفی((من))،کەوابوو ناوترێ((خرجْتُ إلى عندِه))، قسەی عامی خەڵکی:(( خرجْتُ إلى عندِه)) هەڵەیە.

* * *

٣١٠- وَقَدْ يَنُوبُ عَنْ مَكَانٍ مَصْدَرُ وَذَاكَ فى ظَرْفِ الزَّمَانِ يَكْثُرُ.[2]

دادەنیشێ مصدر لەجێی هاوەڵفەرمانی شوێن بەکەمی ،وەکو((جلستُ قُرْبَ زيدٍ)) واتا: مكانَ قربِه، لێرەدا ناوە مضافەکە ووشەی((مکان))ـە حذف کراوەو،ناوە مضافە[3] لە جێی دانیشتووە،وهەمان إعرابی ئەوی وەرگرتووە،کە بریتیە لە منصوب بوون بە مفعول فيە(الظرفية)،ئەمەش قیاسی نیە ،کەوابوو ناڵێیت((آتيك جُلُوسَ زيدٍ))ومەبەستت شوێنی دانیشتنی زید بێ[4].
هەروەها زۆرە دانیشتنی مصدر لە جێی هاوەڵفەرمانی کاتی ،وەکو((آتيك طلوعَ الشمسِ ، وقُدُومَ الحاجِّ ، وخُروجَ زيدٍ))ئەصڵی ئەمانەش:{وقتَ طلوعِ الشمس ،

---

بـ(نجێناهُمْ) الشاهد فيها: ووشەی ((سحر))بەکار هاتووە بە متصرفی چونکە مەبەست پێی پارشێوی ڕۆژێکی دیاریکراو نیە .

[1] زۆربەی زانایان پێیان وایە ووشەی((فوق)) بەهاوەڵناوی و بەهاوشێوەی هاوەڵناویش بەکار دێ ،نەوەك تەنها بە هاوەڵناوی.

[2] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:هەندێ جار مصدر لە جێی هاوەڵناوی شوێنی"ظرف مكان" دادەنیشێ، ئەمەش بۆ هاوەڵناوی کاتی زۆرە.

[3] کە بریتیە لە((قُرْبَ))ومصدرە.

[4] ناوی ((جُلُوسَ))ئەگەر مصدر بێ ولەجێی هاوەڵناوی شوێن بێ ئەوە دروست نیە، بەڵام ئەگەر مصدر بێ وجێی هاوەڵناوی نەگرتبێ ئەوە دروستە.

ووقتَ قدومِ الحاجِّ ، ووقتَ خروجِ زيدٍ}بووەونــاوە مــضافەكــە[1] حــذف كراوە،ومضاف إليە إعرابی مضافەكەی وەرگرتووە، ئەمەش قياسيە بۆ هەموو مصدرێك.[2]

**لێرەدا بابەتی((المفعول فيه))كۆتای پێ هات.**

---

[1] كە بريتيە لە ووشەی((وقتَ)).

[2] واتا:دروستە هەموو مصدرێك لەجێی هاوەڵناوی كاتی دانيشێ ،بەلاَم بۆ هاوەڵناوی شوێنی تەنها ئەوەی بيستراوە–واتا سماعيە–دروستە،وهەموو مصدرێك ناكرێ لەجێی هاوەڵناوی شوێنی دانيشێ.

## المفعولُ مَعَه[(١)]

٣١١- يُنْصَبُ تَالِي الوَاوِ مَفْعُولاً مَعَهْ　　فى نَحْوِ سِيرِى وَالطَّرِيقَ مُسْرِعَـــهْ

٣١٢-بِمَا مِنَ الفِعْلِ وَشِبْهِهِ سَبَـــقْ　　ذَا النَّصْبُ لا بِالوَاوِ فِي الْقَوْلِ الأَحَقُّ.[(٢)]

**مفعول معه بریتیه:لەوناوەی کە منصوبە،لە دوای حەرفی واو کە بەمانای لەگەڵدابوون "معیة"بیٚ.**

**ئەوەشی منصوبی کردووە[(٣)] بریتیە لەوەی لەپێشیێوە هاتووە:کە فعلە یان هاوشیێوەی فعلە.**

**نموونەی ئەوەی منصوب بیٚ بە فعل**((سِيرِى وَالطَّرِيقَ مُسْرِعَةْ))**واتا:ڕیٚ بکە لەگەڵ ڕێیەکە،لێرەدا ناوی**(الطَّرِيقَ)**منصوبە بە فعلی**(سِيرِى)[(٤)].

**وە نموونەی ئەوەی منصوب بیٚ بە هاووێنەی فعل**((زيدٌ سائرٌ والطريقَ)) ، و((أعجبني سيرُك والطريقَ))**لەم دوونموونەیەدا ناوی**(الطَّرِيقَ)**منصوبە بە**(سائرٌ)و(سيرُك)[(٥)]

---

[(١)] جۆری چوارەمە لە ناوە منصوبەکان، لە شەرحەکەدا پێناسە دەکریٚ ، لە ڕێزمانی کوردیدا زاراوەیەك نیە بەناوی مفعول معە ،ئێمەش لەکاتی شەرح کردندا ووشەی مفعول معە بەکاردێنین.

[(٢)] پوختەی مانای ئەم دوو دیٚرەی ئەلفیە:٣١١/منصوب دەبیٚ ئەو ناوەی لەدوای حەرفی واوی لەگەڵدابوون "واوالمعیة"وە دیٚ ،لە نموونەی((سِيرِى وَالطَّرِيقَ مُسْرِعَةْ))واتا:ڕیٚ بکە لەگەڵ ڕیگەکە بەخێرای. ٣١٢/ عاملی ئەم ناوەش بریتیە لە فعل یان هاوشیێوەی فعل ،نەوەك حەرفی واوەکە لەسەر قسەی بەهێزتر.

[(٣)] واتا:عاملەکەی.

[(٤)] سیری:فعلی ئەمرە ولە (سار-یسیر)ـەوە وەرگیراوە ،بۆ مخاطبة یە ویایەکەی دەبێتە فاعل.

[(٥)] سائرٌ:اسمی فاعلە ،و سیرُك:مصدرە ،دیارە اسمی فاعل ومصدر هەردووکیان هاو وێنەی فعلن وهەمان عەمەلی فعل دەکەن

هەندێ لە زانایان پێیان وایە عاملی مفعول معە بریتیە لە حەرفی واوەکە[1]،ئەم بۆچوونە تەواو نیە،لەبەر ئەوەی هەر حەرفێك تایبەت بێ بە ناوەوەو وەکوبەشێك نەبێ لەوناوە،ئەوە عەمەل ناکات جگە لە حروف جەڕ، جا بۆیە ووترا((وەکو بەشێك نەبێ))بۆ خۆ پاراستن لە ئەلیف ولام،کە تایبەتە بە ناوو هیچ عەمەلێك لەناوەکەی ناکات ،چونکە ئەلیف ولام وەکو بەشێك وایە لەوناوە،بە بەڵگەی تێپەڕبوونی عامل بەسەر ئەلیف ولامدا وعەمەل کردنی لەناوەکەی ،وەکو((مررتُ بالغلامِ)).

هەروەها وەردەگیرێ لەووتەی دانەر((فی نَحْوِ سِیرِی وَالطَّرِیقَ مُسْرِعَهْ))کە ناوی مفعول معە قیاسیە لە هاو شێوەی ئەم نموونەیەدا[2]،کە بریتیە لە:هەموو ناوێك لەپاش حەرفی واوێك کە بەواتای لەگەڵ بوون بێ،ولەپێشێوە فعل یان هاو وێنەی فعل هاتبێ،ئەمەش بۆچوونی تەواوە لە قسەی زانایانی ڕێزمانی عەرەبی.

هەروەها وەردەگیرێ لە ووتەی((بِمَا مِنَ الفِعْلِ وَشِبْهِهِ سَبَقْ))کە عاملی مفعول معە پێویستە لە پێشێوە بێ،کەواتا نالێیت((والنِیلَ سرتُ))ئەمەش بە یەکدەنگی زانایان ، بەلأم پێشکەوتنی مفعول معە بەسەر هاوەڵەکەی[3]- وەکو((سارَ والنِیلَ زیدٌ ))-ئەوە ڕاجیای هەیە دەربارەی ،وبۆچوونی ڕاست وایە کە دروست نیە.

* * *

[1] واتا:واوی معیە.

[2] واتا:نموونەکەی دانەر((سِیرِی وَالطَّرِیقَ مُسْرِعَهْ))

[3] واتا:ئەو ناوەی لەگەڵیدا یە.

٣١٣-وَبَعْدَ(مَا) اسْتِفْهَامٍ أَوْ(كَيْفَ) نَصَبْ بِفِعْلِ كَوْنٍ مُضْمَرٍ بَعْضُ العَرَبْ.[1]

**مفعول معه پێویسته فعل یان هاوشێوەی فعل لە پێشیەوە بێ،وەکو پێشتر نموونە باسکرا،بەڵام بیستراوە لە قسەی عەرەب منصوب بوونی مفعول معە لە دوای((ما))و((کیف))ی پرسیارکردن بەبێ باسکردنی فعل ،وەکو**((ما أنت وزيداً ؟)) و((كيف أنت وقَصْعَةً مِنْ ثَرِيدٍ ؟))**،زانایانی نحو دەڵێن مفعول معە لێرەدا منصوبە بەفعلێکی نادیار کە وەرگیراوە لەماددەی((کون))،تقدیری ئەو دوو نموونەیە:** ما تكون وزيداً ؟ وكيف تكون وقصعةً مِن ثريد ؟،**کەواتا** ((زيداً وقَصْعَةً))**منصوبن بە فعلی((تکونُ)) کە نادیار ومقدّرە.**

* * *

٣١٤- وَالْعَطْفُ إِنْ يُمْكِنْ بِلاَ ضَعْفٍ أَحَقْ وَالنَّصْبُ مُخْتَارٌ لَدَى ضَعْفِ النَّسَقْ

٣١٥-وَالنَّصْبُ إِنْ لَمْ يَجُزِ الْعَطْفُ يَجِبْ أَوِ اعْتَقِدْ إِضْمَارَ عَامِلٍ تُصِبْ.[2]

**ناوی دوای ئەم حەرفی واوە[3]:یان دەکرێ عطف کرێتەوە بۆ پێش خۆی ،یان ناکرێ، جا ئەگەر کرا عطف کردنەوەی ،ئەوە یان بە لاوازی دەکرێ ،یان بەبێ لاوازی.**

**خۆ ئەگەر کرا عطف کردنەوەی بەبێ لاوازی ئەوە عطف کردنەوەکە لە پێشترە لە منصوب کردنی ،وەکو**((كنتُ أنا وزيدٌ كالأَخَوَيْنِ))**لێرەدا ناوی**

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: لەدوای (ما)و(کیف)ی پرسیارکردنەوە منصوب دەبێ مفعول معە بە فعلی(کان)ی نادیارومقدر لای هەندێ لە عەرەب.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣١٤_ئەگەر بکرێ عطف کردنەوەی ناوەکەی دوای حەرفی واو بۆ پێش خۆی بەبێ لاوازی ماناکەی ئەوە عطف کردنەوەکە لە پێشترە لە منصوب کردنی ،بەڵام منصوب کردنی هەڵبژێراوە وباشترە ئەگەر عطف کردنەوەکە لاواز بوو. ٣١٥_وە منصوب بوونی-بەوەی بکرێتە مفعول معە- پێویستە ئەگەر نەکرا عطف کردنەوە ،یان منصوبی بکە بە عاملێکی نادیار ئەوە کارێکی ڕاست وتەواوت کردووە.

[3] واتا:واوی معیە.

((زيدٌ))مرفوع بیٚ لەپێشترە لەوەی بکرێتە مفعول معه لەبەر ئەوەی عطف کراوەتەوە بۆ سەر جێناوە لکاوەکە[1]،چونکە عطف کردنەوەکە دەکریٚ لەبەر ئەوەی بەین(فصل)هەیە[2]،وە هاوبەش کردنەوە[3] لە پێشترە لە هاوبەش نەکردنەوە، هەروەها وەکو((سار زيدٌ وعمرٌو))مرفوع کردنی((عمرٌو))لە پێشترە لە منصوب کردنی.

بەڵاٚم ئەگەر عطف کردنەوەکە لاوازبوو ئەوە منصوب کردنی بە مفعول معه لە پێشترە لە هاوبەش کردنەوەی، چونکە منصوب کردن دوورە لە لاوازی ، وەکو((سرتُ وزيداً)) لێرەدا منصوب کردنی((زيد))لە پێشترە لە مرفوع کردنی،لەبەر ئەوەی عطف کردنەوە بۆ سەر جێناوی لکاو بەبیٚ بەین((فاصل))لاوازە.

خۆ ئەگەر نەکرا عطف کردنەوە ئەوە پێویستە منصوب کریٚ:بەوەی دەکرێتە مفعول معه یان دەکرێتە معمول بۆ فعلێکی نادیاری گونجاو بۆ ئەو ناوە،وەکو ووتەی:

ش١٦٦/ *عَلَفْتُهَا تِبْناً وَمَاءً بَارِداً*.[4]

لێرەدا((مَاءً))منصوبە بەوەی کە مفعول معه ،یان منصوبە بە فعلێکی نادیاری گونجاو بۆی ،وتقديرەکەی((سقيتُها ماءً بارداً))،هەروەها وەکو

---

[1] واتا:جێناوی ((كنتُ)).

[2] مەبەست لە بەینەکە جێناوی(انا)یە کە کەوتۆتە نێوان معطوف عليە((تُ))و معطوف((زيدٌ)).

[3] واتا:هاوبەش کردنەوەی معطوف عليەو معطوف لە حوکم وبڕیارەکە.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم نیو دێڕە :ئاڵفم دا لە کا وتێر ئاوم کرد لە ئاوی سارد. بەڵگەکەی:(( وَمَاءً))لێرەدا ناکریٚ عطف کرێتەوە بۆ سەر((تِبْناً))لەبەر ئەوەی ناوی فعلی ((عَلَفْتُهَا)) ناکریٚ عەمەل لە ناوی((مَاءً)) بکات،بۆیە دەبیٚ یان منصوب بیٚ بەوەی ببێتە مفعول معه ،یان فعلێکی نادیار منصوبی کردووە کە بریتیە لە((سقيتُها)).

فەرموودەی خوای گەورە﴿فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ﴾[1]،لێرەدا((وَشُرَكَاءَكُمْ)) دروست نیە عطف کرێتەوە بۆ سەر((أَمْرَكُمْ)) چونکە لە عطفدا نیەتی دووبارە کردنەوەی عامل هەیە،لێرەشدا ڕاست نیە بوترێ((اجمعتُ شرکائی))،بەڵکو دەوترێ((أجمعتُ أمري ،وجَمَعْتُ شركائي))،کەواتا: شركائي منصوبە لەسەر ئەوەی مفعول معه،وتقدیرەکەی–والله اعلم– فَأَجْمِعُوا أمرَكم مع شركاءَكم ،یان منصوبە بە فعلێکی گونجاو بۆی ،وتقدیرەکەی((فَأَجْمِعُوا أمرَكم واجْمَعُوا شركاءَكم)).

**تێبینی : لێرەدا کۆتای بە بابەتی(( مفعول معه )) هات ،سوپاس وستایش بۆ خوای گەورە ،وداواکارین یارمەتیمان بدات بۆ هەرچی کاروکرداری چاکەیە .**

---

[1] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٧١)ی سورەتی((یونس))،کورتەی ماناکەی {ئێوەش کاروباری خۆتان کۆکەنەوە لەگەڵ هاوبەشەکانتاندا –ئەمەقسەی پێغەمبەر نوحە_علیه السلام_کاتێ ڕووبەڕووی گەلەکەی بۆیەوە.}.إعرابەکەی :فأجمعوا/ فـ:حسب ماقبلها ،أجمعوا/فعل امر مبني على حذف النون ،والواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. أمرَ/مفعول به،وهو مضاف ،كم/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه ،وشركائكم/و:واوالمعية ،شركاءَ/مفعول معه،وهو مضاف ، كم/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه .الشاهد فيها:(وشركائكم)،حيث استوفت الشروط الثلاثة من كونها اسما واقعا بعد الواو الدالة على المصاحبة وقبلها فعل،والتقدير:اجمعوا امركم مع شركائكم.

## الاسْتِثْنَاءُ(١)

٣١٦-مَا اسْتَثْنَتِ الاَّ مَعْ تَمَامٍ يَنْتَصِبْ     وَبَعْـدَ نَفْيٍ أَوْ كَنَفْيٍ انْتُخِبْ

٣١٧-إِتْبَاعُ مَا اتَّصَلَ وَانْصِبْ مَا انْقَطَعْ     وَعَنْ تَمِيمٍ فِيهِ إِبْدَالٌ وَقَـــعْ.(٢)

**حوکمی ئەو ناوەی جیادەکرێتەوە بە((إلاّ))منصوب بوونە ،ئەگەر هات لە دوای تەواو بوونی ڕستەیەکی جێگیر((مثبت))، چوون یەکە ئەو ڕستەیە متصل بێ یان منقطع(٣) بێ،وەکو**((قامَ القومُ إلا زيداً، وضربْتُ القومَ إلا زيداً ،

---

(١) بابەتی پێنجەمە لە منصوبات ، ووشەی استثناء واتا:دەرکردن وجیاکردنەوەی ناوێك لە حوکم وبڕیارێکی گشتی،هەموو ڕستەیەکی (استثناء) سێ پایەی هەیە:١-(مستثني منه):واتا لێدەرکراو کە بریتیە لە ناوە گشتیەکە وبەزۆری لە پێش ئەداتی استثناوە دێ،وناوە(مستثني)کە لەم جیادەکرێتەوە. ٢-(اداة الاستثناء)بریتیە لەو ووشانەی کە جیاکردنەوەکە بەهۆی ئەمانەوە ئەنجام دەدرێ،ئەداتیش سێ جۆرە:أ-حرف:کە بریتیە لە((إلاّ)). ب-الاسم کە بریتیە لە((غیر،وسوی)). ج-فعل کە بریتیە لە((عدا ،حاشا، خلا))وئەم سیانە دەکرێ وەکو حەرفیش بە کار بێن.ووردەکاری زیاتریش لە شەرح وڕاڤەکەدا باس دەکرێ.

(٢) پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣١٦-ئەو ناوەی جیادەکرێتەوە بە هۆی حەرفی((إلاّ))ـەوە لەکاتێدا ڕستەکە تەواوبێ_واتا هەموو پایەکانی استثناء لە ڕستەکەدا بن_ ونەفی کراو نەبێ ئەوە منصوب دەبێ، بەلاّم ئەگەر ناوە((مستثنی))کە لەدوای نەفی یان هاوشێوەی نەفی هات ئەوە هەڵبژێراوە ٣١٧_شوێنکەوتنی ناوە((مستثنی))کە _لە إعرابدا_بۆ ناوە((مستثني منه))کە ئەگەر استثناکە متصل بێ_واتاناوە جیاکراوەکە((مستثنی)) بەشێك بێ لە ناوە لێ جیاکراوەکە((مستثني منه))_، بەلاّم منصوب دەبێ ئەگەر استثناکە منقطع بێ_ واتاناوە جیاکراوەکە ((مستثنی)) بەشێك نەبێ لە ناوە لێ جیاکراوەکە((مستثني منه))_،وە بەلای تەمیمیەکانەوە لەم کاتەشدا دروستە شوێنکەوتن((اتباع)).

(٣) لەبابەتی استثناء ئەم زاراوانە بەکاردێن :١-تمام یان(التام):بریتیە لەوەی هەر سێ پایەکەی استپنا لەڕستەکەدا هاتبن ،پێچەوانەکەی بریتیە لە ناقص

ومررتُ بالقوم إلا زيداً[١]، وقام القوم إلا حمارا وضربت القوم إلا حمارا ومررت بالقوم إلا حمارا[٢]))ناوی(زیداً)لەم نموونانەدا منصوبە لەسەر ئەوەی كە مستثنایە،هەروەها ناوی(حماراً)،جا بۆچوونی ڕاست ودروست لە بۆچوونی زانایانی ڕێزمانی عەرەبی ئەوەیە كە عامل(ناصب)ـی ئەم ناوە[٣] بریتیە لەوەی لەپێشەوەیە[٤] بەهۆی حەرفی(إلاّ)وە،وە دانەر- لە جگە لەم كتێبەدا-ئەو بۆچوونەی هەڵبژاردووە كە عاملی مستثنی بریتیە لە حەرفی((إلاّ))،وە فەرمویەتی ئەمە بۆچوونی پێشەوا سیبویەیە،ئەمە بوو مانای ووتەی دانەر((مَا اسْتَثْنَتِ الاَّ مَعْ تَمَامٍ يَنْتَصِبْ))واتا:منصوب دەبێ ئەوەی جیای دەكاتەوە حەرفی((إلاّ))ئەگەر ڕستەكە تەواو بێ،وجێگیر((موجب))بێ.

جا ئەگەر كەوتە دوای ڕستەیەكی تەواو[٥]وجێگیر نەبوو-كە بریتیە لەو ڕستەیەی كە لە خۆگرێ نەفی یان هاوشێوەی نەفی،ومەبەست لە هاوشێوەی نەفی:نەهی ،واستفهامە-لەم كاتەدا استثناكە یان متصلە ،یان منقطعە،مەبەست لە متصل:ئەوەیە كە ناوە مستثناكە بەشێك بێ لە ناوەكەی پێش خۆی ،وە مەبەست لە منقطع: ئەوەیە كە بەشێك نەبێ لە پێش خۆی.

---

یان((مفرغ)).٢-موجب یان (مثبت) واتا ڕستەكە جێگیر بێ ونەفی كراو نەبێ،پێچەوانەكەی بریتیە لە منفی یان(غیرموجب).٣-متصل:واتا جیاكراو((مستثنی)) بەشێكە لە لێ جیاكراو ((مستثنی منه))،پێچەوانەكەی بریتیە لە منقطع ،جا ئێمە لە كاتی شەرح كردندا ئەم زاراوانە وەكو خۆیان_واتا بەعەرەبی_بەكاردێنین.

[١] ئەم سێ ڕستەیە نموونەن بۆ استثنای متصل،چونكە(زید) بەشێكە لە(القوم).

[٢] ئەم سێ ڕستەیەش نموونەن بۆ استثنای منقطع ،لەبەر ئەوەی(حمار)بەشێك نیە لە(القوم).

[٣] واتا:عاملی مستثنی.

[٤] واتا: مستثنیمنه.

[٥] مەبەست لە ڕستەی تەواو ئەو ڕستەیە كە سێ پایەكەی استثنای تێدا باسكرابێ.

ئەگەر متصل بوو، ئەوە دروستە منصوبی کەی لەسەر استثنا،ودروستیشە إعرابی ناوەکەی پێش خۆی[1] وەرگرێ،ئەمەیان بۆچوونی هەڵبژێراوە، وە بۆچوونی باو و زۆر ئەوەیە کە دەبێتە بری((بدل))ی ناوەکەی پێش خۆی،ئەمەش وەکو((ما قامَ أحدٌ إلا زيدٌ وإلا زيداً [2]، ولا يقُمْ أحدٌ إلّا زيدٌ وإلا زيداً[3]، وهل قامَ أحدٌ إلاّ زيدٌ وإلّا زيداً[4]، وما ضربْتُ أحداً إلاّ زيداً، ولا تضرِبْ أحداً إلاّ زيداً، وهَلْ ضربْتَ أحداً إلاّ زيداً؟[5]))کەواتا دروستە ناوی((زيداً)) منصوب بێ لەسەر ئەوەی کە مستثنایە،وە دروستە منصوب بێ لەسەر ئەوەی کە بدلە بۆ((احداً))،ئەمەشیان بۆچوونی هەڵبژێراوە ، هەروەها دەڵێی((ما مررْتُ بأحدٍ إلا زيدٍ وإلا زيداً، ولا تَمرُرْ بأحدٍ إلا زيدٍ وإلا زيداً، وهل مررْتُ بأحدٍ إلا زيدٍ؟ وإلا زيداً))[6].

ئەمە بوو مانای وتەی((وَبَعْــدَ نَفْيٍ أَوْ كَنَفْيٍ انْتُخِبْ إِتْبَاعُ مَا اتَّصَلَ))واتا: هەڵبژێراوە شوێنکەوتنی استثنای متصل بۆ ناوەکەی پێش خۆی،ئەگەر کەوتە دوای نەفی یان هاوشێوەی نەفی.

وەئەگەر استثنا منقطع بوو ئەوە پێویستە منصوب بێ لای زۆرینەی عەرەب ،کەوابوو دەڵێی((ما قامَ القومُ إلا حماراً))،وە دروست نیە شوێنکەوتن((إتباع))ی پێش خۆی ،بەڵام تەمیمیەکان بە دروستی دەزانن ،

---

[1] واتا: مستثنیمنه.

[2] ئەمە نموونەیە بۆ استثنای تامی متصلی منفی ،کە دوو إعرابی تیا دروستە.

[3] ئەمەیان نموونەیە بۆ استثنای تامی متصلی منهی کە شبهی منفیە، و دوو إعرابی تیا دروستە.

[4] ئەمەیان نموونەیە بۆ استثنای تامی متصلی شبهی منفی کە استفهامە، ودوو إعرابی تیا دروستە.

[5]ئەم سێ ڕستەیەش هاوشێوەی سێ ڕستەکەی پێشوو ترن ،جیاوازیان ئەوەیە کە مستثنی منه لە سێ ڕسەتەکەی پێشوودا مرفوعە ،ولە سێ ڕستەیەی تردا منصوبە.

[6] لەم نموونانەدا ((زيد))دەکرێ بدلی ((احد))بێ ،وە دەکرێ مستثنی بێ.

کەواتا دەڵێی((ما قامَ القومُ إلا حمارٌ، وما ضربتُ القومَ إلا حماراً، وما مررت بالقومِ إلا حمارٍ)) ئەمە بوو مانای ووتەی((وَانْصِبْ مَا انْقَطَعْ))واتا:منصوب بکە استثنای منقطع ئەگەر بکەوێتە دوای نەفی یان هاوشێوەی نەفی لای جگە لە تەمیمیەکان ،بەلاّم تەمیمیەکان بە دروستی دەزانن شوێنکەوتنی ((إتباع))ی.

کەواتا مانای دوو دێڕەکە[1] ئەو ناوەی جیادەکرێتەوە بە((إلاّ))منصوب دەبێ ئەگەر ڕستەکە جێگیر((موجب))بێ،وتەواو((تام))بێ ،جا بەم مەرجە هۆشیاری دا لەو جۆرەی کە جێگیر نەبێ واتا منفی بێ ،وە بەڕەها ووتنی قسەی دەربارەی منفی ئەوە دەگەیێنێ کە منصوب دەبێ ئەگەر متصل بێ، یان منقطع بێ.

بەلاّم ئەگەر قسەکە جێگیر نەبێ_ئەویش ئەوەیە کە نەفی یان هاوشێوەی نەفی تێدا بێ_ئەوە هەڵبژێراوە شوێنکەوتن((إتباع))ی پێش خۆی لە استثنای متصل ،وە پێویستە منصوب بێ لە استثنای منقطع لای جگە لە تەمیمیەکان، بەلاّم تەمیمیەکان بە دروستی دەزانن شوێنکەوتنی((إتباع))ی پێش خۆی.

* * *

[1] واتا:دێڕی ژمارە((٣١٦))و((٣١٧))ی ئەلفیە.

## باسی پێش کەوتنی مستثنی بەسەر مستثنی منە

**٣١٨**- وَغَيْرُ نَصْبِ سَابِقٍ فِى النَّفْيِ قَدْ   يَأْتِى وَلَكِنْ نَصْبَهُ اخْتَرْ إِنْ وَرَدْ.[١]

**هەرکاتێ مستثنی پێش مستثنی منە کەوت،ئەوە بەدەر نیە لەوەی یان ڕستەکە جێگیرە ،یان جێگیر نیە،جا ئەگەر جێگیر بوو ئەوە پێویستە منصوبی کەیت ،وەکو((قام إلا زيداً القومُ)).بەلاّم ئەگەر جێگیر نەبوو[٢] ئەوە بۆچوونی هەڵبژێراو وایە کە منصوب بێ ،کەواتا دەڵێی((ما قام إلا زيداً القومُ))،وە وەکو ووتەی:**

**ش١٦٧/** فَمَالِيَ إِلاَّ آلَ أَحْمَدَ شِيعَةٌ   وَمَالِى إِلاَّ مَذْهَبَ الْحَقِّ مَذْهَبُ.[٣]

**وە بە مرفوع بوونیش گێڕدراوەتەوە،کەواتا دەڵێی((ما قام إلا زيدٌ القومُ))،پێشەوا سیبویە فەرموویەتی((پێشەوا یونس[٤] بۆی گێڕاومەتەوە کە هەندێ لە وانەی جێی متمانەن لە زمانی عەرەبیدا دەڵێن((ما لِي إلا أخوك ناصرٌ))[٥]،وناوی دووەمیان کردۆتە بدل بۆ ناوی یەکەم بەوەی کە نازناو((لقب))ە بۆی[٦]،هەروەها وەکو ووتەی:**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دەکرێ مستثنی منصوب نەبێ لە کاتێکدا ڕستەکە منفی بێ ئەگەر مستثنی پێش مستثنی منە بکەوێت،بەلاّم لەکاتەشدا منصوب بوونی هەڵبژێرە ئەگەر هات؟

[٢] واتا:موجب نەبوو ،ومنفی بوو.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:دۆست وخۆشەویستانی من تەنها شوێنکەوتووانی پێغەمبەرن-ﷺ-،وە تەنها ڕێگەی ڕاست وحەق ڕێگەمە. بەڵگەکەی:(( إلاَّ آلَ أَحْمَدَ))و((إلاَّ مَذْهَبَ الحَقِّ))لێرەدا هەردووکیان مستثنان ومنصوبن لەبەر ئەوەی پێش مستثنی منە کەوتوون،وڕستەکەش منفیە،ئەمەش بۆچوونی هەڵبژێراوە.

[٤] مەبەستی:پێشەوا یونسی کوڕی حەبیبە کە مامۆستای پێشەوا سیبویە یە ویەکێکە لە پێشەوا ناودارەکانی زانستەکانی زمانی عەرەبی ،وساڵی ١٨٣ك کۆچی دوای کردوە ،خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

[٥] لێرەدا اخوك دەبێتە مستثنی وپێش مستثنی منە کەوتووەو مرفوعە.

[٦] واتا:ناوی ناصر لەم ڕستەیەدا بە مانا گشتیەکەی نایا کە بریتیە لە سەرخەر ،بەڵکو بە مانای ناوی کەسێکی تایبەت دێ،بۆیە دروستە ببێتە بدل بۆ اخوك.

ش١٦٨/فَإِنَّهُمْ يَرْجُونَ مِنْهُ شَفَاعَةً وَإِذَا لَمْ يَكُنْ إِلاَّ النَّبِيُّونَ شَافِعُ.[1]

کەواتا مانای دێڕەکە[2]:بێگومان هاتوە لەو مستثنایەی کە پێش مستثنی منە کەی کەوتووە جگە لەمنصوب بوون-کە بریتیە لە مرفوع بوون-ئەمەش لە کاتێکدا ڕستەکە ناجێگیر((غیر موجب))بێ ،وەکو((ما قام إلا زیدٌ القومُ)) بەلأم بۆچوونی هەڵبژێراو ئەوەیە منصوب بێ.

هەروەها زانرا لە تایبەت کردنی ئەم منصوب نەبوونە بە منفی بوونی ڕستەکە ئەوەی کە منفی نەبێ ئەوە پێویستە منصوب بێ،وەکو((قام إلا زیداً القومُ)).

* * *

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: بێگومان ئەوان ئومێدی تکاکردنیان پێیەتی -واتا:بە پێغەمبەرﷺ-،لە کاتێکدا هیچ تکاکارێك نەبێ جگە لە پێغەمبەران-سەلامی خوایان لێ بێ_ ، **بەڵگەکەی**:(( إلاّ النَّبِيُّونَ)) مستثنایەو وپێش مستثنی منە کەوتووەو مرفوعە ،لە کاتێکدا ڕستەکە منفیە.

[2] واتا:دێری (٣١٧)ی ئەلفیە.

## *باسي استثناي مفرغ[1]:

**٣١٩**-وَإِنْ يُفَرَّغْ سَابِقٌ إِلاَّ لِمَا    بَعْدُ يَكُنْ كَمَا لَوِ الاَّ عُدِمَا.[2]

**هەركاتێ یەكلا بۆیەوە وشەكەی پێش((إلاّ))بۆ عەمەل كردن لەدوای ((إلاّ))كە-واتا:خەریكی ئەوە نەبوو داخوازی((إلاّ))جێبەجێ بكا-ئەوە ناوەكەی دوای((إلاّ)) إعراب دەكرێ بەپێی ئەوەی داخوازی دەكا پێش((إلاّ))، وەكو ئەوەی ((إلاّ))ـی لێنەبێ،وەكو**((ما قامَ إلا زيدٌ ،وما ضربْتُ إلا زيداً ،وما مررْتُ إلا بزيدٍ))**لێرەدا ناوی((زیدٌ)):فاعلە بۆ قام ،و((زیداً)):منصوبە بەوەی مفعول بە بۆ** ضربْتُ **،و**((بزيدٍ))**جارومجرورە ومتعلقە بە مررتُ ،هەر وەكو ئەوەی((إلاّ))ـی لێنەبێ.**

**ئەمەش بریتیە لە استثنای مفرّغ ،ولە ڕستەی جێگیر((موجب))دا نایات،كەوابوو نالێیت**((ضربْتُ إلا زيداً)).

* * *

## *باسی دووبارەبوونەوەی((إلاّ)) ئەگەر بۆ توكيد بێ:

**٣٢٠**- وَأَلْغِ إِلاَّ ذَاتَ تَوْكِيدٍ كَلاَ    تَمْرُرْ بِهِمْ إِلاَّ الْفَتَى إِلاَّ الْعَلاَ.[3]

**هەر كاتێ دووبارە بۆیەوە((إلاّ)) بە مەبەستی بەهێزكردن((توكيد))،ئەوە هیچ عەمەل ناكات لەوەی چۆتە سەری، وجگە لە مانای بەهێزكردنی**

---

[1] استثنای مفرغ ئەوەیە كە كۆڵەكەی گەورەی استثنای -كە مستثنى منە-تێدا نەبێ، وپێچەوانەی((التام))ە.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر وشەكەی پێش((إلاّ)) یەكلا بۆیەوە بۆ عەمەل كردن لە دوای((إلاّ))،ئەوە وەكو ئەوە وایە كە ((إلاّ))ـی لێ نەبێ ،واتا:إعرابی وشەكەی دوای ((إلاّ))بەپێی ڕستەكە-حسب موقعە من الجملە-دەبێ.

[3] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: هەڵوەشێنەوە عەمەلی((إلاّ)) ئەگەر دووبارە بۆیەوە وبۆ بەهێزكردن((توكيد))،وەكو نموونەی((لاَتَمْرُرْ بِهِمْ إِلاَّ الْفَتَى إِلاَّ الْعَلاَ))واتا:تێپەڕ مەبە بە لایاندا مەگەر بەلای گەنجەكە وبەلای بەرزەكە.

قسەكەی یەكەم هیچی تر ناگەیێنێت،ئەمەیە مەبەست لە هەڵوەشاندنەوە ((إلغـاء))ـی، ئەمەش لە بدل وعطفدا هەیە،وەكو((ما مررْتُ بأحدٍ إلا زيدٍ إلا أخيكَ)) لێرەدا ناوی((أخيك))بدلە بۆ((زيدٍ))وحەرفی ((إلاّ))هیچ عەمەلی تێدا نەكردووە،واتا نەیكردووە بە استثنایەكی سەربەخۆ،هەر وەكو ئەوەی وتبێتت:(( ما مررتُ بأحدٍ إلا زيدٍ أخيكَ))،وە وەكو((لا تَمْرُرْ بهم إلا الفتى إلا العَلاَ))ئەصڵەكەی:{لا تَمْرُرْ بهم إلا الفتى العَلاَ}لێرەدا ((العَلاَ))بدلە بۆ ناوی الفتى ،وحەرفی((إلاّ))دووبارە بۆتەوە بۆ بەهێزكردن ، وە نموونەی عطف((قام القومُ إلا زيداً وإلا عمراً)) وئەصڵەكەی: إلا زيداً وعمراً، وحەرفی((إلاّ))دووبارە بۆتەوە بۆ بەهێزكردن،وە وەكو ووتەی:

ش١٦٩/ هَلِ الدَّهْرُ إلاَّ لَيْلَةٌ وَنَهَارُهَا وَإلاَّ طُلُوعُ الشَّمسِ ثُمَّ غِيَارُهَا.[1]

ئەصڵەكەی بریتییە لە: وطُلُوعُ الشَّمسِ ،و((إلاّ))دووبارە بۆتەوە بۆ بەهێزكردن.

هەروەها كۆ بۆتەوە دووبارە بوونەوەی((إلاّ))لە بدل وعطفدا لەووتەی:

ش١٧٠/ مَالَكَ مِنْ شَيْخِكَ إلاَّ عَمَلُهْ إلاَّ رَسِيمُهُ وإلاَّ رَمَلُـــهْ.[2]

ئەصڵەكەی: إلا عملُه رسيمُه ورملُه ،((رسيمهُ))بدلە بۆ عملهُ ،و((ورملُه))عطف كراوەتەوە بۆ سەر((رسيمهُ))،وحەرفی((إلاّ))دووبارە كراوەتەوە بۆبەهێزكردن.

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: ڕۆژگار تەنها بریتییەلە شەو وڕۆژێك ، دەركەوتنی خۆر وئاوابوونی بەڵگەكەی:(( وَإلاَّ طُلُوعُ الشَّمسِ))حەرفی ((إلاّ))دووبارە بۆتەوە بۆ بەهێزكردن وعەمەلی لە ناوەكەی دوای خۆی نەكردووە.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:نیە بۆ تۆ لە تەمەنت جگە لە كردەوەكانت ،وە جگە لە ڕێكردنت لە نێوان صەفاومەڕوا. هەروەها ئەم دێرە بەم شێوەیەش ماناكراوە:نیە بۆ تۆ لە ووشترەكەت _واتا: شَيْخِكَ بەمانای ووشتری پیری دێ لەسەر ئەم بۆچوونە_جگە لەم دوو جۆرە ڕێكردنە چاكەی نەبێ. بەڵگەكەی:(( إلاَّ رَسِيمُهُ وإلاَّ رَمَلُهُ))حەرفی ((إلاّ))دووبارە بۆتەوە لە بدل وعطفدا،وتەنها بۆ بەهێزكردنە وعەمەلی لە ناوەكەی دوای خۆی نەكردووە.

٣٢١–وَإِنْ تُكَرَّرْ لاَ لِتَوْكِيدٍ فَمَعْ تَفْرِيغِ التَّأْثِيرَ بِالعَامِلِ دَعْ
٣٢٢–فِي وَاحِدٍ مِمَّا بِإِلاَّ اسْتُثْنِي وَلَيْسَ عَنْ نَصْبِ سِوَاهُ مُغْنِي.[(١)]

**ئەگەر دووبارە بۆیەوە ((إلاّ))بۆ جگە لە بەهێزکردن((توکید))–کە ئەویش بریتیە: لەوەی کە مەبستە لە((إلاّ))ی یەکەم کە بریتیە لە استثنا،وەئەگەر لابرێت ماناکەی زانراو نیە–لەم کاتەدا بەدەر نیە لەوەی:یان استثناکە مفرغە ،یان مفرغ نیە. جا ئەگەر استثناکە مفرغ بێ ئەوە سەرقاڵ((مشغول))ی دەکەی[(٢)] عاملەکە بە یەکێك لە ناوەکان وئەوانی تر منصوب دەکەی،وەدەڵێی((ما قامَ إلّا زيدٌ إلا عمراً إلا بَكْراً))وهیچ کام لە معمولەکان دیاری نەکراوە بۆ عاملەکەی پێش ((إلاّ))،بەڵکو هەرکامیانت بوێ دەیکەیتە معمولی،وئەوانی تر منصوب دەکەی، ئەمەیە مەبەست لەووتەی((فَمَعْ تَفْرِيغ–تاکۆتای))واتا:لە استثنای مفرّغ عاملەکە عەمەل لە یەکێك لە ناوەکانی دوای((إلاّ)) دەکات ، وئەوانی تر منصوب دەکەی.**

**وە ئەگەر استثناکە مفرغ نەبوو[(٣)]–ئەمەیە مەبەست لەووتەی–:**

٣٢٣– وَدُونَ تَفْرِيغٍ مَعَ التَّقَدُّمِ نَصْبَ الْجَمِيعِ احْكُمْ بِهِ وَالْتَزِمِ
٣٢٤–وَانْصِبْ لِتَأْخِيرٍ وَجِئْ بِوَاحِدِ مِنْهَا كَمَا لَوْ كَانَ دُونَ زَائِدِ
٣٢٥–كَلَمْ يَفُوا إِلاَّ امْرُؤٌ إِلاَّ عَلِي وَحُكْمُهَا فِي القَصْدِ حُكْمُ الأَوَّلِ.[(٤)]

---

**(١) کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە: ٣٢١/بەڵام ئەگەر دووبارە بۆیەوە((إلاّ))و بۆ توکید نەبوو،واستثناکەش مفرّغ بوو ئەوە عاملی پێش((إلاّ))ـەکە دانە بۆ عەمەل کردن،٣٢٢/لە یەکێك لەوانەی دوای حەرفی ((إلاّ))ـەکە، وبێنیاز نیە لە منصوب کردنی ئەوانی تر.**

**(٢) مەبەست لە سەرقاڵ کردن واتا:عەمەل پێدان((إعمال)).**

**(٣) پێشتر ووتمان استثناء یان:مفرغە–کە بریتیە لەوەی مستثنی منە باس ناکرێ– ،یان تامە:کە هەموو پایەکانی استثنای تێدایە.**

**(٤) کورتەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:٣٢٣/ وە ئەگەر استثناکە مفرغ نەبوو ومستثناکەش پێش مستثنی منە کەوتبوو،ئەوە پێویستە هەموویان منصوب کەیت**

لەم كاتەدا بەدەر نيە لەوەى يان مستثناكان پێش مستثنى منە دەكەون ، يان پێشى ناكەون. جائەگەر مستثناكان پێش مستثنى منە كەوتن ئەوە پێويستە هەموويان منصوب بن،چوون يەكە ڕستەكە جێگير(موجب)بێ ، يان جێگير نەبێ،وەكو((قامَ إلاّ زيداً إلا عَمراً إلا بَكراً القومُ ،وما قامَ إلاّ زيداً إلا عمراً إلا بكراً القومُ))ئەمەبوو ماناى ووتەى((وَدُونَ تَفْرِيغٍ-تاكۆتاى دێرەكە)).

بەلاّم ئەگەر مستثناكان دوا كەوتن لەم كاتەشدا بەدەر نيە لەوەى:يان ڕستەكە جێگيرە،يان جێگير نيە،جا ئەگەر جێگير بوو ئەوە پێويستە هەموويان منصوب كرێن،كەواتا دەڵێى((قام القومُ إلا زيداً إلا عَمراً إلا بَكراً))،وەئەگەر جێگير نەبوو ئەوە يەكێكيان[1] مامەڵەى ئەوەى لەگەڵدا دەكرێ وەكو ئەوەى كە دووبارە بوونەوەى لێ نەبێ:كەواتا دەكرێتە بدل بۆ ناوەكەى پێش خۆى-ئەمەش بۆچوونى هەڵبژێراوە-،يان منصوب دەكرێ-ئەمەش كەمە-وەكو پێشتر ڕابورد[2]،وە ناوەكانى تر پێويستە منصوب كرێ،ئەمەش وەكو((ما قامَ أحدٌ إلا زيدٌ إلا عمراً إلا بكراً))لێرەدا ((زيدٌ))

---

وبڕيارى منصوب بوونى بۆ بدە.٣٢٤/ بەلاّم ئەگەر مستثناكە پێش نەكەوتبوو، وڕستەكەش جێگير بوو ئەوە پێويستە هەموو ناوەكان منصوب كەيت هەر وەكو ئەوەى تەنها يەك ناوى لێ بێ كە ئەويش مستثنايە.٣٢٥/وەكو نموونەى((لَم يَفُوا إلاّ امرؤٌ إلا عَلِي)) لەم ڕستەيەدا((امرؤٌ))دەبێتە بدل بۆ واوى جماعە لە((يَفُوا))،وە ((عَلِي))دەبێتە مستثنى ومنصوبە بەلاّم لەبەر لەسەر وەستان مرفوع كراوە لەسەر لغەى ربيعە، وەهەر((إلاّ))و مستثنايەكى تر دووبارە بێتەوە هەمووى وەكومستثناى يەكەم وايە،لەڕووى ماناوحوكم وبڕيارەكە.

[1] واتا:يەكێك لەوناوانەى دووبارە بوونەتەوە.

[2] پێشتر لە شەرحى دێرى((٣١٦))و((٣١٧))دا باسى حوكمى استثناى تامى منفى مان كرد،كە دوو بۆچوون هەيە دەربارەى.

بدلە بۆ((أحدُ))،وە دەتوانی ناوەکانی تریش[1] بکەیتە بدل،هەروەها وەکو ووتەی دانەر((لم یَفُوا إلاّ امرؤٌ إلا عَلِي))لێرەدا(((امرؤٌ))دەبێتە بدل بۆ واوی جماعە لە((یَفُوا))ئەمەبوو مانای ووتەی دانەر((وَانْصِبْ لِتَأُخِيرِ- تاکۆتای))واتا:منصوب بکە هەموو مستثناکان کاتێك کەوتنە پاش مستثنی منە ئەگەر ڕستەکە جێگیربوو،بەلاّم ئەگەر جێگیر نەبوو ئەوە یەکێکیان بکە بە معمولیْ بە پێی جێی لەڕستەکە،هەر وەکو ئەوەی کە مستثناکە دووبارە نەبوبێتەوە،وناوەکانی تریش منصوب بکە.

هەروەها مانای ووتەی((وَحُكْمُهَا فی القَصْدِ حُكْمُ الأَوَّلِ))ئەوەیە ئەو ناوانەی دووبارە دەبنەوە لەڕووی ماناوە وەکو مستثنای یەکەم وان ،کەوابو بۆیان جێگیر دەکریْ هەموو ئەو بڕیارومانایانەی بۆ یەکەم ناو هەیە:لەڕووی داخلْ بوونیان ،ودەرچوونیان،بۆ نموونە لەووتەی((قام القومُ إلا زیداً إلا عَمراً إلا بَكراً))هەموویان دەرچوون،وە لە ووتەی((ماقام القومُ إلا زیداً إلا عَمراً إلا بَكراً))هەموویان داخلْن[2]،هەروەها لە ووتەی((ما قامَ أحدٌ إلا زیدٌ إلا عمراً إلا بكراً)) هەموویان داخلْن[3]

* * *

[1] واتا:هەریەك لە((عمرا،وبكرا)).

[2] واتا:قەومەکە هەڵنەساون جگە لە زید وعمروبکر،واتا:ئەمان هەستاون وداخلْی هەستانەکەن.

[3] واتا:داخلْی حوکمی استثناکەن ، کە هەستاون.

**باسی استثنا به(( غیر، سوى ))؛**

٣٢٦- وَاسْتَثْنِ مَجْرُوراً بِغَيْرٍ مُعْرَبَا     بِمَا لِمُسْتَثْنًى بِإِلاَّ نُسِبَا.[١]

**بەكار دێ وەكو مانای((إلاّ))-كە بۆ جیاكردنەوەیە-چەند ووشەیەك:لەوانە هەندێكیان ناون،كە بریتین لە((غَيْرُ ، وسُوَى، وسِوَى، وسَواء))، وە هەندێكیان فعلن،كە بریتین لە((لیس ،ولایكونُ))،وە هەندێكیان دەكرێ فعل بن ،وەدەكرێ حەرف بن ،كە بریتین لە((عدا ،خلا، حاشا))،دانەریش باسی هەموو ئەمانەی كردووە.**

**جا هەر یەكە لە**((غَيْرُ ، وسُوَى، وسِوَى، وسَواء)) **حوكمی مستثناكەیان ئەوەیە كە مجرورە،چونكە ئەمان[٢] إضافە دەكرێن بۆ لای ،وەناوی((غیر))إعراب دەكرێ وەكو إعرابی مستثنای((إلاّ))،كەوابو دەڵێی**((قامَ القومُ غيرَ زيدٍ))[٣]**بە منصوب كردنی**((غيرَ))**هەروەكو دەڵێی**((قام القومُ إلا زيداً))**بە منصوب كردنی**((زيداً))،**هەروەها دەڵێی**((ما قام أحدٌ غيرُ زيدٍ ، وما قام أحدٌ غيرَ زيدٍ))[٤]،**بە شوێن كەوتن((الاتباع))ومنصوب بوون،وە بۆچوونی هەڵبژێراو شوێن كەوتنە،هەروەكو دەڵێی**((ما قام أحدٌ إلا زيدٌ ، و إلا زيداً))،**هەروەها دەڵێی**((ما قام غيرُ زيدٍ))[٥] **لێرەدا پێویستە((غیرُ))مرفوع كەیت،هەروەكو دەڵێی**((ما قام إلا زيدٌ))**بە مرفوع كردنی**((زيدٌ))**بە واجبی،وە دەڵێی**((ما قام أحدٌ غيرَ حمارٍ))[٦] **بە**

---

[١] **پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: استثنا بكە وناوە مستثناكە مجرور بكە بە((غیر))،وە ((غیر))كەش إعرابی ئەو ناوە وەردەگرێ كە بە((إلاّ))استثنا كرابێ.**

[٢] **واتا:هەر یەك لە**((غَيْرُ ، وسُوَى، وسِوَى، وسَواء))**هەموو كاتێ مضافن بۆ ناوەكەی پاشیان ، وناوەكەی پاشیان لە إعرابدا دەبێتە مضاف علیە ولەماناشدا دەبێتە مستثنی.**

[٣] **ئەمە نموونەیە بۆ استثنای تامی متصلی مثبت.**

[٤] **ئەمەیان نموونەیە بۆ استثنای تامی متصلی منفی.**

[٥] **ئەمە نموونەیە بۆ استثنای مفرغ.**

[٦] **ئەمە نموونەیە بۆ استثنای منقطع.**

منصوب كردنی((غيرَ))لای جگە لە تەميميەكان ،وە بە شوێن كەوتن((الاتباع))لای تەميميەكان، هەروەكو دەڵێی((ما قام أحدٌ إلا حِمارٌ،و إلاّ حِمارًا)).

هەروەها((سِوى))زۆرتر وايە كە خوێندراوەتەوە بە كسرەی حەرفی سينەكەی وكورت كردنەوەی كۆتاييەكەی[1]،وە هەندێ لە عەرەب بە ضمە دانان بۆ حەرفی سينەكەی وكورت كردنەوەی كۆتاييەكەی دەيخوێننەوە، وە هەندێكی تر بە كسرەی سينەكەی ودرێژكردنەوەی كۆتاييەكەی دەيخوێننەوە،ئەم جۆرە خوێندنەوەيە دانەر باسی نەكردووە،وكەمن ئەوانەی باسيان كردووە،لەوانە پێشەوا فاسی[2]لە شەرحی كتێبی ((الشاطبية))[3].وە بۆچوونی پێشەوا سيبويه وفەرا وجگە لەوانيش وايە كە ((سوى))هەموو كاتێك ئاوەڵفەرمان((ظرف))ە،كاتێ كە دەڵێی((قامَ القومُ سِوَى زيدٍ))ناوی((سوى))لای ئەو زانايانە منصوبە لەسەر ظرفية ،ومانای جياكردنەوە((الاستثناء)) لەخۆ دەگرێ،و هيچ كات لە ظرفيەت دەرناچێ لای ئەو زانايانە مەگەر لە پێويستی هۆنراوە((الضرورة الشعرية)).

---

[1] كۆتاييەكەی واتا:ئەليفەكەی كۆتای بە كورتی كەپێی دەوتری((قصر))، وپێچەوانەی درێژكردنەوە((مدّ))ە.

[2] ناوی :(محمدی كوڕی حسن)ە ،ولە شاری(فاس)ی ولآتی مغرب لە دايك بووە، دواتر لە ولآتی مصر نيشتەجێ بووە، ويەكێكە لە پێشەوا ناودارەكان لە بواری((القراءات))دا،وشەرحی كتێبە كەی ئيمامی شاطبي كە ناوی((حرز الاماني))لە زانستی((القراءات))دا كردووە بەناوی((اللآلي الفريدة))،ساڵی ٦٥٦ك كۆچی دوای كردووە،خوای گەورە بە باشترين شێوە پاداشتيان بداتەوە.

[3] كتێبەكەی ئيمامی شاطبی ناوی((حرز الاماني))،وشەرحەكەی ناوی((اللآلي الفريدة))،وەكو ئاماژەمان پێكرد.

**وە دانـەر ئـەوەی هەڵبـژاردووە دەربـارەی((سـوی))کـە وەکـو((غـير))مامەڵـەی لەگەڵ دەکریٚ[١]،لـەوەی کـە:مرفـوع دەبـیٚ ،ومنـصـوب ،ومجـروریـش دەبیٚ،بـۆ ئەمەش ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی:**

٣٢٧–ولِسوًى سُوًى سَوَاء اجْعَلا على الأصحّ ما لغيرِ جُعِلا.[٢]

**نموونەی بەکارهێنانی((سوی))بـە مجروری فەرمایـشتی پێغەمبـەر–ﷺ–:((** دَعَـوْتُ رِبّي ألاَّ يُـسَلِّطَ علـى أُمَّـتي عَـدُوّاً مِـنْ سِـوَى أَنْفُـسِها))[٣]،**وە فـــەرموودەی پێغەمبەر–ﷺ–:((** ما أنتم في سِوَاكم مِن الأُمم إلاّ كالشَّعرةِ البيضاءِ في الثَّورِ الأَسودِ ، أو كالشعرةِ السَّوداء في الثَّور الأبيضِ))[٤]، **وە ووتەی شاعر:**

---

[١] کەواتا:بۆچوونی دانەر دەربارەی(سوی)جیاوازە لە بۆچوونی پێشەوا سيبويه وهاوڕاکانی.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:بۆ ناوی((سوی))کە بە((سُوًى،وسَوَاء))يش دەخوێنرێتەوە دانە ،هەموو ئەو حوکم وبڕيارانەی هەيە بۆ((غير))، ئەمەش بۆچوونی ڕاسترە.

[٣] ئەم فەرموودەيە هەر يەك لە پێشەوا أحمد والطبراني ڕيوايەتيان کردووە ، شێخ ئەرناؤوط فەرمووبەتی:ئەم فەرموودەيە((صحيح لغيره))، زۆربەی ڕيوايەتەکان بە((..عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ...))لە بری((عَدُوّاً مِنْ سِوَى...))هاتووە،پوختەی مانای فەرموودەکە:{داوام کرد لە پەروەردگارم کە زاڵ نەکاتە سەر ئوممەتەکەم دوژمنیٚ جگە لە خۆيان}. **إعرابەکەی**:دعوت/فعل وفاعل .ربي/مفعول به منصوب وعلامة نصبه الفتحة المقدرة منع من طهورها اشتغال المحل بحركة مناسبة للياء، وهو مضاف ،ي/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه .ألا/أن:حرف نصب ومصدر واستقبال ،لا:حرف نفي. على امتي/ جارومجرور ، عدواً/مفعول به ،من/حرف جر ،سوىً/اسم مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة منع من ظهورها التعذر ،والجار والمجرور في محل نصب صفة ل((عدواً))،وسوى مضاف ، انفسها/مضاف إلية مجرور ،وهو مضاف ،والهاء/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. **الشاهد فيه**:((من سوى)) حيث جاءت كلمة سوى مجرورة بحرف جر((من)).

[٤] ئەم فەرموودەيەش ئيمامی مسلم ڕيوايەتی کردووە ،کورتەی ماناکەی:{بێگومان ئێوە لە چاو گەلانی تر وەکو تاڵە موويەکی سپی بە پێستی گايەکی ڕەشەوە وان ،يان وەکو تاڵە موويەکی ڕەش بە گايەکی سپييەوە.} **إعرابەکەی**:ما/حرف نفي .أنتم/ ضمير منفصل مبني على السكون في محل رفع مبتدا .في/حرف جر .سواكم/ سوى: اسم

**ش١٧١**/ولاَ يَنْطِقُ الفَحْشَاءَ مَنْ كَانَ مِنْهُمُ      إِذا جَلَسُوا مِنَّا وَلاَ مِـنْ سَوَائِنَا.[١]

**هەروەها لە بەکارهێنای سوی بە مرفوعی ووتەی:**

ش١٧٢/ وَإِذا تُبَاعُ كَرِيمَةٌ أَوْ تُشْتَرَى      فَسِوَاكَ بَائِعُهَا وَأَنْتَ الْمُشْتَرِي.[٢]

**وە ووتەی: ش١٧٣/** وَلَـمْ يَبْقَ سِوَى العُدْوَا      نِ دِنَّاهُمْ كَمَـا دَانُـوا[٣]

**کەواتا((سواك))مرفوعه ومبتدایه،وە((**سِوَى العُدْوَانِ**))مرفوعه وفاعله.**

**هــەروەها لــە بــەکارهێنانی ســوی بــە منــصوبی بــەڵام بــێ ئــەوەی ظــرف بێت،ووتەی:**

**ش١٧٤**/لَدَيْكَ كَفِيلٌ بِالْمُنَى لِمُؤَمِّلٍ      وَإِنَّ سِوَاكَ مَنْ يُؤَمِّلُهُ يَشْقَى.[٤]

---

مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة منع من ظهورها التعذر ،وهو مضاف ، كم/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه ،والجار والمجرور متعلقان بخبر محذوف تقديره موجودون . من الأمم/ جارومجرور ،إلا/أداة حصر ،كالشعرة/جارومجرور .البيضاء/نعت الشعرة مجرور.في الثور/جارومجرور .الأسود/ نعت الثور مجرور. أو/حرف عطف كالشعرةِ السّوداء في الثور الأبيضِ/تعرب مثل ما تقدم. **الشاهد فيه**(( في سِوَاكم)) حيث استُعملت كلمة سوى مجرورة بحرف جر((في)).

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: قسەی ناشیرین ناکات هەرکەس لەوان بێ ،کاتێ لای ئێمە وجگە لە ئێمەش دانیشن .**بەڵگەکەی**:ووتەی((من سَوَائِنَا ))لێرەدا ووشەی((سوی)) اسمی مجرورە،ولە ظرفیەت دەرچووە.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش: ئەگەر پیاوەتی و چاکەکاری بفرۆشرێت و وازی لێ بهێنرێت ،ئەوە جگە لە تۆ دەیفرۆشێت و جەنابت دەیکرێ. **بەڵگەکەی**: ووتەی((فَسِوَاكَ)) لێرەدا ووشەی((سوی))مبتدایە،ولە ظرفیەت دەرچووە.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش:هیچ نەماوەتەوە جگە لە دوژمنکاری ،پاداشتیانمان دانەوە وەکو پاداشتی ئەوان. **بەڵگەکەی**:ووتەی((سِوَى العُدْوَانِ))لێرەدا ووشەی((سوی)) فاعلە،ولە ظرفیەت دەرچووە.

[٤] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش: بێگومان تۆ خاوەن ڕەوشت وپیاوەتیت کە مایەی دڵخۆشی وکەفالەت کردنی بۆ ئەو کەسەی هیوای بە تۆیە ،وە جگە لە تۆ ئەو کەسەی

لێرەدا((سواك))اسمی((إنّ))یە ،ئەمەش[١] بۆچوون وڕوونکردنەوەی دانەر بوو.بەڵام پێشەوا سیبویە وزۆربەی زانایان پێێن وایە کە((سوی))لە ظرفیەت دەرناچێ،مەگەر لەبەر زەروورەتی شیعری ،ئەوەشی بەبەڵگە هێنراوەتەوە بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە ئەوە تأویل ولێکدانەوەی تر هەڵدەگرێ.[٢]

* * *

٣٢٨–وَاسْتَثْنِ نَاصِباً بِلَيْسَ وَخَلاَ وَبِعَدَا وَبِيَكُونُ بَعْدَ لاَ.[٣]

واتا:جیاکەرەوە بە فعلی((لیس))وئەوانەی لە دوایەوەن ومنصوب بکە مستثناکەیان، دەڵێی((قامَ القومُ لیس زیداً، وخلا زیداً، وعدا زیداً، ولا یکونُ زیداً))ناوی((زیداً))لە((لیس زیداً، ولا یکونُ زیداً))منصوبە ودەبێتە خبری((لیس ،ولایکونُ))،وە ناوەکەیان جێناوێکی نادیارە،وبۆچوونی زۆریش وایە کە ئەو جێناوە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك((البعض))کە وەرگیراوە لە ناوی((القوم))،وتقدیری ڕستەکە((لیس بعضُهم زیداً، ولا یکونُ بعضُهم زیداً))،ئەم

---

هیوای پێیە مایەی بەدبەختیە بەڵگەکەی:ووتەی((وَإِنَّ سِوَاكَ))لێرەدا ووشەی ((سوی)) اسمی (إنّ)یە، ولە ظرفیەت دەرچووە.

[١] واتا:هێنانەوەی ئەو بەڵگانە لەسەر ئەوەی کە ((سوی))بە جگە لە ظرفیەتیش بەکار دێ وهاتووە.

[٢] پوختەی ئەوەی باسکرا ئەوەیە:کە زانایانی نحو ڕایان جودایە دەربارەی بە کارهێنانی ووشەی((سوی))،پێشەوا سیبویە وبەصریێکان زۆربەیان پێیان وایە تەنها بە ظرفیەت بەکاردێ ومانای استثناش لە خۆ دەگرێ، بەڵام ابن مالك وکوفیێکان پێیان وایە وەکو هەموو ناوێکی تری معرب بەکاردێ–دیارە ماناکەی بۆ استثنایە– ،وهەموو حاڵەتە إعرابیەکان وەردەگرێ وکۆمەڵێ بەڵگەی بە هێزیشیان هێناوەتەوە لە دەقەکان وشعری عەرەبی کە ئاماژەمان پێکرد.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:منصوب بکە مستثنای هەریەك لە{لیس ،وخلا ،وعدا ،ولایکون }،واتا:یکون کاتێ دەبێتە فعلی استثنا ئەگەر بکەوێتە دوای حەرفی((لا)).

جێناوەش پێویستە نادیار((واجب الاستتار))بێ،هەروەها ناوی((زیداً)) لەڕستەی((وخلا زيداً، وعدا زيداً))منصوبە ودەبێتە مفعول بە،وهەریەك لە((خلا ،وعدا))دەبنە فعل وفاعلەكەیان-لەوەی كە باوە-جێناوێكە دەگەڕێتەوە بۆ هەندێك((البعض))كە وەرگیراوە لە ناوی((القوم)) وەكو ڕابورد،وتقدیرەكەی: خلا بعضُهم زيداً، وعدا بعضهم زيداً.

وە دانەر ئاگاداری دا بەووتەی((وَبِكُونُ بَعْدَ لاَ))-ئەم مەرجە تایبەتە بۆ((یكونُ))-بەوەی كە فعلی یكون كاتێك بۆ استثنا بەكاردێ كە مضارع بێ ولە دوای((لا))وە بێ،وە لە دوای حەرفەكانی تری نەفیەوە نابێ،وەكو:لم ،وإن ،ولن ،ولمّا،وما.

* * *

٣٢٩/ وَاجْرُرْ بِسَابِقَيْ يَكُونُ إِنْ تُرِدْ      وَبعْدَ مَا انْصِبْ،وَانْجِرَارٌ قَدْ يَرِدْ.[١]

وتا:ئەگەر ((ما))نەكەوتە پێش ((خلا ،وعدا))ئەوە ناوەكەی پاشیان مجرور بكە ئەگەر ویستت،كەوابوو دەڵێی((قام القوم خلا زيدٍ ، وعدا زيدٍ))لێرەدا خلا،وعدا:حەرفی جەڕن،وە نەبیستراوە لە پێشەوا سیبویە مجرور كردن پێیان[٢]،بەڵكو تەنها لە پێشەوا ئەخفەشەوە گێڕدراوەتەوە،جا نموونەی مجروركردن بە((خلا))ووتەی:

ش١٧٥/ خَلاَ اللهِ لا أَرْجُو سِوَاكَ وَإِنَّمَا      أَعُدُّ عِيالِى شُعْبَةً مِنْ عِيَالِكَا.[٣]

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:مجرور بكە بە دووناوەكەی پێش((یكون))-واتا:بە خلا وعدا-ئەگەر ویستت ،بەمەرجێ ((ما))لەپێشیانەوە نەبێ، وە ئەگەر لە پاش ((ما))وە هاتن ئەوە دوای خۆیان منصوب دەكەن ،وە بەكەمی هاتووە مجرور بوونی.

[٢] واتا:پێشەوا سیبویە لێی نەبیستراوە كە(( خلا وعدا))ناوەكەی پاشیان مجروربكەن.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:جگە لە خوای گەورە هیوام بە جگە لە تۆ نیە،وە بێگومان من خاوخێزانی خۆم بە بەشێك لە خاوخێزانی تۆ دادەنێم. بەڵگەكەی:ووتەی((خَلاَ اللهِ)) لێرەدا خلا حەرفی جەڕە وناوەكەی پاش خۆی مجرور كردووە.

**وه نموونه‌ی مجرورکردن به((عدا)) ووته‌ی:**

ش١٧٦/ تَرَكْنَا فِي الْحَضِيْضِ بَنَاتِ عُوْجٍ        عَوَاكِفَ قَدْ خَضَعْنَ إِلَى النُّسُورِ
أَبَحْنَا حَيَّـهُمْ قَتْـــلاً وَأَسْـرًا        عَدَا الشَّمْطَاءِ وَالطِّفْلِ الصَّغِيـرِ.[١]

**به‌لاّم ئه‌گه‌ر((ما))كه‌وته پێشیان ئه‌وه پێویسته ناوه‌كه‌ی پاشیان منصوب بێ،كه‌واتا ده‌ڵێی((قام القوم ما خلا زيداً ،و ما عدا زيداً))لێره‌دا((ما))مصدريه، و((خلا ،وعدا))ده‌بنه صله‌ی[٢]،وفاعلی((خلا وعدا))جێناوێكی نادیاره،وده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ هه‌ندێ له‌((القوم)) وه‌كو ڕابورد،وه((زيداً))مفعوله،ئه‌مه‌بوو مانای ووته‌ی((وَبعْدَ مَا انْصِبْ))ئه‌مه‌ش بۆچوونی زانراووباوه.**

**وه پێشه‌وا كسائی به‌دروستی داناوه مجرور كردنی ناوی دوای((خلا وعدا))كاتێ ((ما))له‌پێشیانه‌وه بێ،وپێی وایه ((ما))زیادكراوه،و((خلا وعدا))حه‌رفی جه‌ڕن،كه‌وابوو له‌سه‌ر ئه‌م بۆچوونه ده‌ڵێی((قام القوم ما خلا زيدٍ ،و ما عدا زيدٍ))،ئه‌مه بوو مه‌به‌ست له ووته‌ی((وَانْجِرَارٌ قَدْ يَرِدْ))، وه پێشه‌وا جه‌رمی[٣] له شه‌رحه‌كه‌یدا گێڕاوێتیه‌وه مجروركردنی ناو له‌پاش((خلا وعدا))له هه‌ندێ عه‌ره‌ب.**

---

[١] ماناو به‌ڵگه‌ی ئه‌م دوو دێڕه به جێمان هێشت له دامێنی جیاكه به‌جكه ئه‌سپه ناوازه‌كان ،كه مابوونه‌وه‌وملكه‌چی هه‌ڵۆكان بوون،دامان به‌سه‌ر ئه‌و هۆزه‌دا وله‌ناوماندان وهه‌ندێكمان لێ كوشتن وهه‌ندێكمان ده‌ستبه‌سه‌ركرد جگه له پیره‌ژنان ومنداڵی بچووك. به‌ڵگه‌كه‌ی:((عَدَا الشَّمْطَاءِ)) ) لێره‌دا عدا حه‌رفی جه‌ڕه وناوه‌كه‌ی پاش خۆی مجرور كردووه.

[٢] چونكه(ما)ی مصدری پێویستی به ڕسته‌یه‌كه كه ده‌بێته صله بۆی وبه هه‌ردووكیان ده‌بنه مصدرێك ومانای قسه ته‌واو ده‌كه‌ن ،وه صله‌ی(ما)ی به‌زۆری جمله‌ی فعلييه.

[٣] ناوی:صالحی كوڕی إسحاقه ونازناوی جه‌رمیه ،كه له هۆزه‌كه‌ی به‌ناوی ((جرم))وه‌رگیراوه ،ویه‌كێكه له زانا ناوداره‌كانی زانسته‌كانی ڕێزمانی عه‌ره‌بی، وساڵی٢٢٥ك كۆچی دوای كردووه ،وچه‌ند كتێبێكی له زانستی نحو نوسیوه،

٢٣٠-وَحَيْثُ جَرَّا فَهُمَا حَرْفَانِ        كَمَا هُمَا إِنْ نَصَبَا فِعْلاَنِ[١].

**واتا: ئەگەر ناوەکەی پاش((خلا وعدا))ت مجرورکرد ئەوە ((خلا وعدا))دەبنە حەرفی جەڕ،وە ئەگەر ناوەکەی پاشیانت منصوب کرد ئەوە دەبنە فعل،ئەمەش هیچ ڕاجیاییەکی تێدا.**

* * *

٢٣١-وَكَخَلاَ حَاشَا وَلاَ تَصْحَبُ مَا        وَقِيلَ حَاشَ وَحَشَا فَاحْفَظْهُمَا.[٢]

**ئەوەی کە باوە ئەوەیە((حاشا))تەنها حەرفی جەڕە،دەڵێی((**قامَ القومُ حاشا زيدٍ**))بە مجرور کردنی ناوی((زید))،بەڵام هەریەك لەپێشەوا ئەخفەش وجەرمی ومازنی ومُبرد وچەن زانایەکی تر-لەوانە دانەر-پێیان وایە حاشا وەکو((خلا))وایە:بەکاردێ بەوەی فعل بێ وناوەکەی پاشی منصوب بکات،وەدەکرێ حەرفی جەڕ بێ وناوەکەی پاشی مجرور بکات،کەوابوودەڵێی((**قامَ القومُ حاشا زيداً ،وحاشا زيدٍ**))،وەچەند زانایەکی تر گێڕاویانەتەوە-لەوانە پێشەوا فەڕا ،وئەبو زیدی ئەنصاری،وشەیبانی- منصوب کردنی ناوەکەی پاش((حاشا))، لەوەشە:**

---

وشەرحی کتێبەکەی پێشەوا سیبویە کردووە،خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتیان داتەوە.

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەرکاتێ ((خلا وعدا))ناوەکەی پاشیان مجرور کرد ئەوە حەرفن،وە ئەگەر ناوەکەی پاشیان منصوب کرد ئەوە فعلن.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ووشەی((حاشا))وەکو((خلا))وایە لەڕووەوەی کە ناوەکەی پاش خۆی منصوب دەکات ،وەدەکرێ مجروری کات بەڵام حاشا((ما))ی لەگەڵدا نایات،وە ووتراوە دەربارەی خوێندنەوەی حاشا((حاشَ، وحَشَا))لەبەریان کە وبزانە.

(( اللهمَّ اغفرْ لِي ولِمَنْ يَسمعُ حاشا الشيطانَ ، وأَبَا الإصْبَعِ))[١]،وە وەكو ووتەی:

ش١٧٧/حاشا قريشاً فإنّ الله فَضَّلَهُم على البَرِيَّةِ بالإسلامِ والدِّينِ.[٢]

وە ووتەی دانەر:((وَلاَ تَصْحَبُ مَا))مانای ئەوەیە كە ((حاشا))وەكو ((خلا))وایە لەوەی پاش خۆی منصوب یان مجرور دەكا،بەلآم((ما))پێشی ناكەوێ،وەكو پێش((خلا))دەكەوت،كەوابوو نالێی((قامَ القومُ ما حاشا زيداً))،ئەمەش كە دانەر باسی كرد زۆرە،بەلآم بەكەمی هاتووە((ما))لەگەڵ حاشا،وەكو لە مسندی[٣]،ئەبی ئومەیەی طرسوسیدا[٤] هاتووە لە ابن عمرەوە-ﷺ-كە پێغەمبەری خواﷺفەرموویەتی:(( اسامةُ احبُّ الناسِ إليَّ ماحاشا فاطمةَ))[٥]،هەروەها ووتەی:

---

[١] ئەم قسەیە ووتەی پیاوێكی ئەعرابیەو یەكێك لە زانایانی ڕێزمانی عەرەبی-كە مازنیە- لێی بیستوەوكردوویەتی بە بەڵگە لەسەر دروستێتی منصوب كردنی ناوی پاش حاشا.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:جگە لە قورەیش،چونكە بێگومان خوای گەورە پایەی ئەوانی داوە بەسەر خەڵكیدا بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە. بەڵگەكەی:((حاشا قريشاً))لێرەدا حاشای بەكارهێناوە وەكو فعل وناوەكەی دوای منصوب كردووە.

[٣] مسند:بەو كتێبانەی فەرموودە دەوترێت كە فەرموودەكانی بە پێی ناوی صحابیەكان_ﷺ_ڕیزكردبێ.

[٤] ناوی محمدی كوڕی إبراهیمی بغدادیە ،ویەكێكە لە زانایانی فەرموودە،وساڵی ٢٧٣ك كۆچی دوای كردووە،خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

[٥] ئەم فەرموودەیە هەریەك لە پێشەوا ئەحمەد وطیالسی وطرسوسی وغەیری ئەوانیش ڕوایەتیان كردووە وشێخ ئەلبانیش بە صحیحی داناوە ، بەلآم بڕگەی((ماحاشا فاطمةَ)) قسەی ڕاوییە وفەرموودەی پێغەمبەرﷺنیە، پوختەی مانای فەرموودەكە{ئوسامەی كوڕی زەیدﷺخۆشەویسترن كەسە لای من واتا لای پێغەمبەرﷺ،جا پێغەمبەر فاطمەی كچیشی جیا نەكردەوە }.إعرابەكەی:اسامة/مبتدا مرفوع .احبُ/خبر مرفوع ،وهو مضاف .الناسِ/مضاف اليه مجرور .إليَ/جارومجرور متعلقان

ش١٧٨/رَأَيْتُ النَّاسَ ما حاشَا قريشاً    فَإِنَّا نَحْـنُ أَفْضَلُـهُمْ فَعَالاً.[1]
هەروەها وتراوە لە خوێندنەوەی((حاشا)):((حاشَ ،وحَشَا)).

## ۞لێرەدا بابەتی ((الاستثناء)) کۆتای پێهات إنشاء الله لە بابەتی داهاتوو ،باسی ((الحال))دەکەین ،کە دەکاتە بابەتی شەشەم لە ناوە منصوبەکان .

بـ(احبّ). ما/مصدرية .حاشا/فعل ماضٍ جامد مبني على الفتح المقدر للتعذر، وفاعله ضمير مستتر تقديره هو عفاطمة/مفعول به منصوب. الشاهد فيه: ما حاشا،حيث صحبت(ما) الفعل(حاشا)،وهذا قليل في نظر النحاة،لأنّ الكثير ان(ما)لا تصحب حاشا.

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: بینیم خەڵکی جگە لە قورەیش ،بێگومان ئێمە لە هەمووان کردەوە چاکترین    بەڵگەکەی:((ما حاشا قريشاً)) ((ما))ی مصدری چۆتە سەر فعلی((حاشا)) ئەمەش کەمە.

# الْحَالُ[١]

٣٣٢- الْحَالُ وَصْفٌ فَضْلَةٌ مُنْتَصِبُ مُفْهِمُ فِي حَالِ كَفَرْداً أَذْهَبُ[٢]

**پێناسەی حالی کردووە بەوەی:سیفەتێکە[٣]، وبناغەی ڕستە نیە ،ومنصوبە، بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازی خاوەن حاڵەکە،وەکو:(( فَرْداً أذهبُ))لێرەدا(فَرْداً)حالە ،چونکە هەموو مەرجەکانی باسکران تێدایە.**

**جا[٤]دەرچوو بە وتەی((فَضْلَة))[٥]،ئەو سیفەتەی کە بناغە((عمدة))یە،وەکو((زيدٌ قائمٌ))[٦]،هەروەها دەرچوو بە وتەی((بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازی شتەکە))ئەو جۆرە تمییزەی کە وەرگیراو((مشتق))ە[٧]،وەکو:**

---

[١] بابەتی شەشەمە لە ناوە منصوبەکان ،ووشەی حال لە زمانی عەرەبیدا واتا: ئەو حاڵ وبالەی مرۆڤی لەسەرە خۆش بێ،یان ناخۆش، وە زۆرتر وایە لە زمانی کوردیشدا ووشەی حاڵ بە کار بێنین ، لەڕووی زاراوە ابن عقیل پێناسەی دەکات ، وەوشەی((الحال)) لەزمانی عەرەبیدا بە مذکری ،وبەمؤنثي بەکار دێ ،ودەوترێ:حال ،وحالة.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:حال سیفەتێکە ،کە ڕستەکە بەبێ بوونی ئەویش دروست دەبێ ومانای هەیە،ومنصوبە، ودێ بۆ ڕوون کردنەوەی شێوازی ئەو شتەی باسکراوە ،وەکونموونەی((فَرْداً أذهبُ))واتا:بە تەنها دەڕۆم،لێرەدا((فَرْداً))ی پێشی خستووە لەبەر کێش(وزن)ی شعرە کە.

[٣] مەبەست لە سیفەت لێرەدا ،واتا:جامد نیە ومشتقە.

[٤] لێرەوە ابن عقیل شەرح وڕاڤەی پێناسە دەکات.

[٥] پێشتر باسمان کرد ئەو ووشانەی ڕستە پێك دێنن دوو جۆرن:یەکێکیان پێی دەوترێ((عمدة))کە دەکاتە بناغەی ڕستەکە وبەبێ ئەم ڕستە دروست نابێ ئەوی تریان پێی دەوترێ((فَضْلة))کە بناغەی ڕستەکە نین وبەبێ ئەمیش ڕستە دروست دەبێ بەڵام ئەم جوان وتەواوی دەکات ،جا حال لە بەشی دووەمە.

[٦] واتا:ناوی((قائمٌ)) وەسفە-اسمی فاعلە-وبەڵام خبرە ،بۆیە دەبێتە بناغە((عمدە))ی ڕستەکە.

[٧] دواتر باسی جۆرەکانی تمییز دەکەین_إنشاء الله_.

(( للهِ دَرُّه فارساً))[1] لێرەدا ناوی((فارس)) دەبێتە تمییز لەسەر بۆچوونی ڕاست،چونکە مەبەست پێی ڕوون کردنەوەی شێوازی خاوەن حاڵەکە نیە،بەڵکو مەبەست پێی سەرسوڕمان((التعجب))کردنە لە سوار چاکێتی کەسەکە،وبۆ ڕوونکردنەوەی سەرسوڕمان لێکراوەکەیە،نەوەك بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازەکەی،هەروەها((رأيت رجلاً راكباً))بێگومان((راكباً)) نابێتە حال چونکە بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازەکە نەهاتووە ،بەڵکو بۆ تایبەت کردنی پیاوەکە هاتووە[2]،جاووتەی دانەر((مفهم في حال)) بریتیە لە ووتەمان بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازی شتەکە((للدلالة على الهيئة)).

* * *

٣٣٣- وَكَوْنُهُ مُنْتَقِلاً مُشْتَقًّا يَغْلِبُ لَكِنْ لَيْسَ مُسْتَحَقًّا.[3]

زۆرتر وایە حال سیفەتێکی جیگیر نەبێ،و وەرگیراو بێ. جا مەبەست لە جێگیر نەبێ:ئەوەیە کە سیفەتێکی پەیوەست((لازم))نەبێ بۆ وەسفکراوەکە،وەکو((جاء زيدٌ راكباً))لێرەدا((راكباً)):سیفەتێکی جێگیر نیە،چونکە زید هەموو کاتێ سواری نیە،ودەکرێ پیادەش بێ. وە کەم جار هاتووە حال بەوەی سیفەتێکی جێگیروپەیوەست بێ،وەکو

---

[1] واتای ئەم ڕستەیە:هەر خوای گەورە دەتوانێ پاداشتی زۆری ئەو بداتەوە ئەوەندە سوار چاکە. لەم ڕستەیەدا((فارساً))ناوەو سیفەتە-اسمی فاعلە-،بەڵام نابێتە حال چونکە بۆ ڕوونکردنەوەی شێوازی خاوەن حاڵەکە نیە.

[2] واتا:((راكباً))تەنها سیفەت((نعت))ە بۆ ((رجلاً))وحال نیە ،سیفەتیش وەکو پێشتر باسکرا بۆ تایبەت کردن((تخصيص))ە.

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:حال بەزۆری وایە سیفەتێکی جێگیرنیە واتا کاتیە ووەرگیراو((مشتق))ەوجامد نیە،ئەمەش بەزۆری وایە ،ودەکرێ کەم جاریش وانەبێ.

((دعوتُ الله سَمِيعاً))(١) ،وە وەكو((خلقَ اللهُ الزَّرافةَ يَدَيْها أطولَ من رِجْلَيها))،وە وەكو ووەتی:

ش١٧٩/فَجَاءَتْ بِهِ سَبْطَ العِظَامِ كَأَنَّمَا عِمَامَتُهُ بَيْنَ الرِّجَالِ لِوَاءُ.(٢)

كەواتاهەریەك لە((سَمِيعاً، و أطولَ،و سَبْطَ))حالن ،وسیفەتی جێگیر وپەیوەستن. هەروەها حال دەكرێ وەرنەگیراو((جامد))بێ،ئەمەش لە چەن شوێنێكدا دەبێ،دانەر باسی هەندێكیانی كردووە بە ووتەی:

٣٣٤- وَيَكْثُرُ الجُمُودُ فِي سِعْرٍ،وَفِي مُبْدِي تَأَوُّلٍ بِلاَ تَكَلُّفِ
٣٣٥- كَبِعْهُ مُدًّا بِكَذَا يَداً بِيَدْ وَكَرَّ زَيْدٌ أَسَداً أَيْ كَأَسَدْ.(٣)

زۆرە هاتنی حال بە وەرنەگیراوی ئەگەر بۆ نرخ وسعر بێ،وەكو((بِعْهُ مُدّاً بِدِرْهَمٍ))لێرەدا((مُدّاً))حالە وجامدە،ولەماناد ا وەرگیراو((مشتقه))،چونكە ماناكەی دەبێتە((بِعْه مُسَعَّراً كلَّ مُدٍّ بدرهمٍ))(٤)،هەروەها زۆرە هاتنی حال بە

---

(١) سیفەتی بیستن((السمع))جێگیر و هەمیشەییە بۆ خوای گەورە،كەواتا دەبێتە حالێكی جێگیرولازم.

(٢) ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:ئەو ژنە منداڵەكەی هێنا-بووی-بە قەڵەوی وهێزو بازوو، جامانەكەی وەكو ئاڵا وایە لەناو پیاواندا،واتا كەتەرگەورە بوو. بەڵگەكەی:((سَبْطَ العِظَامِ))حالەو سیفەتێكی جێگیرە،ئەمەش كەمە.

(٣) لە دوو دێرەدا ابن مالك باسی ئەو شوێنانە دەكات كە حال تێیدا بە جامدی دێت:٣٣٤/زۆرە هاتنی حال بە جامدی لە:١-نرخ(سعر)دا،٢-وە لەو شتەی كە بەئاشكراو ساناى ڕاڤە وتأويل بكرێ،وەكو ئەوەی كارەكە بۆ هاوبەشی لەنێوان دوواندا بێ،وە یان بۆ لێكچواندن((التشبيه))بێ .٣٣٥/نموونەی یەكەم وەكو بیفرۆشە مستێ بەوەندە، نموونەی دووەمیش وەكو((دەست بە دەست))،وە وەكو هەڵمەتی برد زید شێرانە،واتا وەكو شێر.

(٤) ووشەی((مُسَعَّراً))حالە ومشتقە-اسمی مفعولە-، وە اسمی فاعلیش بێ ماناكەی دروستە.

جامـدی لـەو شـتەی مانـای((تفاعُـل))لـە خـۆ گـریٚ وەکـو((بِعْتُه يداً بِيَدٍ)) واتـا:دەستاودەسـت((مناجزةً))،یـان مانـای لیٚکـچوون((التـشبیه)) لـەخۆگریٚ،وەکو((كَرَّ زيدٌ أسداً))واتـا:هاوشـیٚوەی شـیٚر،لیٚرەدا هـەردوو ناوی((یـداً ،وأسـداً))جامـدن ،ودروسـتە ببنـە حـال لەبـەر ئـەوەی بەئاشـکرا تأویل دەکریٚن بە ناویٚکی مشتق،وەکو ڕابورد،بۆ ئەمەش ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی((وَفى مُبْدِى تَأَوُّلٍ))واتا:زۆرە هاتنی حال بە جامدی لەو شویٚنانەی بە ئاشکرا لیٚکدریٚنەوە بە مُشتق.

کەواتا زانرا بەمـەو بەوەی ڕابورد کە ووتـەی زانایـانی نحـو((بیٚگومـان حـال پیٚویـستە نـاجیٚگیر و وەرگـیراو بـیٚ))مانـای وایـە ئەمـە زۆرترەوباوە،نـەوەك پیٚویست بیٚ،ئەمە بوو مانای ووتەی دانەر کەڕابورد((لكن ليس مُستحقاً)).

* * *

***حال دەبیٚ نەناسراو((نکرة))بیٚ:**

٣٢٦- وَالْحَالُ إِنْ عُرِّفَ لَفْظاً فَاعْتَقِدْ تَنْكِيرَهُ مَعْنىً كَوَحْدَكَ اجْتَهِدْ[١].

بۆچوونی زۆرینەی زانایانی نحو وایە کە حال دەبیٚ نەناسراو بیٚ،وە ئەوەی هاتبیٚ بەناسراوی لە لفظدا ئەوە لـە مانـادا نەناسـراوە،وەکو ووتـەیان: جاءوا الجَمَّاءَ الغَفِيرَ[٢].وە وەکو:

ش١٨٠/ و*أَرْسَلَها الْعِرَاكَ...*.[٣]

---

[١] پوختەی مانای ئەم دیٚڕەی ئەلفیە:حال ئەگەر بە ناسراو((معرفه))ی هات ئەوە دڵنیابە لەوەی کە لە مانادانەناسراو((نکره))یەوبە نەناسراوی لیٚکدریٚتەوە ،وەکو نموونەی((وَحْدَكَ اجْتَهِدْ))واتا:بە تەنهایی تیٚکۆشە،لیٚرەدا ناوی((وَحْدَكَ))حالە وناسراوە بەلاَم لەمانادا نەناسراوە.

[٢] ئەم ڕستەیە بەکار دیٚ بۆ هاتنی کەسانیٚ بە زۆری،ماناکەی:هاتن بەزۆری وسەر ڕووی زەوییان دادەپۆشی.

[٣] تەواوی ئەم شعرە: فَأَرْسَلَها الْعِرَاكَ وَلَمْ يَذُدْهَا وَلَمْ يُشْفِقْ عَلَى نَغَصِ الدِّخَالِ. **ماناکەی** :ووشترەکانی بەڕەلاَکرد بۆ ئاودانیان بە تیٚکەلاَوی،وڕیٚی لیٚنەگرتن،وبەزەییشی

**وەوەکو**((اجتهدْ وَحْدَكَ))،و((كلَّمته فَاهُ إلى فِيَّ))[1]،**جا هەریەك لە**((الجماءَ، والعِرَاكَ، ووحْدَكَ، وفاهُ))**حالن ،وناسراون،بەلاَم هەموویان بە نەناسراوی لێكدەدرێنەوە،وتقدیرەكەیان:** جاءوا جميعاً، وأرسلها معتركةً، واجتهد منفرداً، وكلمته مشافهةً.

**بەلاَم بەغدادییەكان**[2]**,وپێشەوا یونس پێیان وایە دروستە ناسراوی حال بە ڕەهای((مطلق))ـی،بەبێ تأویل كردن،بۆیە بەدروستیان داناوە**(( جاءَ زيدٌ الرَّاكبَ))[3]

**بەلاَم كوفێكان ڕایەكی وردتریان هەیە،ودەڵێین**[4]**:ئەگەر حالەكە مانای مەرج((شرط))ـی لەخۆگرتبوو ئەوە دروستە ناسراوبێ،ئەگەرنا نا،جا نموونەی ئەوەی مانای مەرجی لەخۆگرتووە**((زيدٌ الرَّاكبَ أحسنُ منه الماشِيَ))**لێرەدا هەردوو ناوی**((الرَّاكبَ والماشِيَ))**:حالن ودروستە ناسراو بن چونكە بە مەرج لێك دەدرێنەوە،وتقدیرەكەی:** زيدٌ إذا رَكِبَ أحسنُ منه إذا مَشَى، **خۆ ئەگەر مانای مەرجی لەخۆ نەگرت ئەوە دروست نیە ناسراو بێ،كەوابوو ناڵێی**((جاءَ زيدٌ الرَّاكبَ))**،چونكە دروست وڕاست نیە**((جاء زيدٌ إنْ رَكِبَ)).

* * *

---

نەهاتەوە بە تێرنەبوونی هەندێكیان. بەڵگەكەی:(( العِرَاكَ))حالە وناسراوە،بەلاَم لەمانادا نەناسراوە وبە((معتركةً))یان((مزدحمةً))لێك دەدرێتەوە.

[1] واتا:دواندم دەماودەم.

[2] مەبەست لە بەغدادیەكان،یان مدرسەی بەغدادی:ئەو زانایانەن كە لە شاری بغداد قوتابخانەیەكی تایبەتیان دروست كرد لە بواری ڕێزمانی عەرەبی،چەند ساڵێك دوای دروست بوونی هەردوو مدرسەی بەصرێكان وكوفێكان،دیارترین پێشەوایانی مدرسەی بغداد{الزجاجي،وابو علي الفارسي،وابن جنّي،والزمخشري،وابن الشجريّ، ابن الانباري، والعكبري ،وابن يعيش،...}.

[3] لەم ڕستەیەدا((الرَّاكبَ))حالەو ناسراوە.

[4] ئەمە دەبێتە بۆچوونی سێیەمە دەربارەی هاتنی حال بە ناسراوی.

٣٣٧- وَمَصْدَرٌ مُنَكَّرٌ حَالاً يَقَعْ بِكَثْرَةٍ كَبَغْتَةً زَيْدٌ طَلَــعْ.[١]

حال دەبێ سيفه بێ-سيفەش بريتيه :لەو ووشەيەی ماناوخاوەنەكەی تێدا بێ،وەكو:قائم،وحسن،ومضروب-،جا هاتنی حال به مصدری[٢] پێچەوانەی ئەصڵە،چونكه مصدر خاوەن ماناكەی لەخۆ نەگرتووە.

وەلە زمانی عەرەبيدا زۆرە هاتنی حال بەوەی مصدرێكی نەناسراوبێ،بەڵام ئەمــە قياســـی نيه،چونكەپێـــچەوانەی ئەصـــڵە،وەكو((زيـدٌ طلـعَ بغتـةً))، لێرەدا((بغتةً))حاله ونەناسراوە ومصدرە،ومنصوبه ،وتقديرەكەی:(( زيدٌ طلعَ بَاغِتاً))،ئەمەش بۆ چوونی پێشەوا سيبويه وزۆربەی زانايانه.

وە هەريەك له پێشەوا ئەخفەش ومُبرّد پێيان وايه كه((بغتةً)) منصوبه لەسەر مصدريەت[٣]،وعاملەكەی حذفكراوە،وتقديرەكەی: طلعَ زيدٌ يَبْغُتُ بَغْتَةً،كەواتا ڕستەی((يَبْغُتُ))بەلای ئەمانەوە دەبێته حال ،ونەوەك((بغتةً)).

وە كوفيێكـان پێيـان وايـه كـه((بغتةً)) [٤] منـصوبه لەسـەر مـصدريەت وەكـو بۆچوونەكەی ئەخفەش ومُبرّد ،بەڵام ئەوەی منصوبی كردووە بريتيـه لـەو فعلەكـەی لەڕسـتەكەدا هـاتووە-كەبريتيەلـه طلعَ-چـونكه ئـەم فعلـه تأويـل دەكـرێ بــه لفــظێكــی هاوشــێوەی لفظــی مــصدرەكە،وتقديرەكەی لــه ڕستەی((زيدٌ طلعَ بغتةً))،دەبێته((زيدٌ بَغَتَ بغتةً))،،كوفيێكان تأويلی((طلعَ))دەكەن به((بَغَتَ)).

* * *

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيه: زۆرە له زمانی عەرەبيدا هاتنی حال به چاووگی نەناسراو((مصدرنكرة))وەكو: زيدٌ طلعَ بغتةً، لێرەدا((بغتةً))حاله ونەناسراوە ومصدرە.

[٢] واتا:ناوێك كه مصدرە ودەبێته حال.

[٣] واتا:بەلای ئەمانەوە((بغتةً))منصوبه و مفعولی مطلقه وحال نيه.

[٤] بغتة: له ڕستەی (زيد طلع بغتة)

***باسی خاوەن حال((صاحب الحال)):**

٣٣٨- وَلَمْ يُنَكَّرْ غَالِباً ذُو الْحَالِ إِنْ     لَمْ يَتَأَخَّرْ أَوْ يُخَصَّصْ أَوْ يَبِنْ

٣٣٩-مِنْ بَعْدِ نَفْيٍ أَوْ مُضَاهِيهِ كَـلاَ     يَبْغِ امْرُؤٌ عَلَى امْرِىءٍ مُسْتَسْهِلاَ[1]

**خاوەن حال پێویستە ناسراو بێ ،وناکرێتە نەناسراو بەزۆری مەگەر لە کاتی بوونی پاساوێك،کە بریتیە لە یەکێك لە مانە:**

**یەکێکیان:کاتێ حال پێش خاوەن حالە نەناسراوەکە بکەوێ،وەکو((فیها قائماً رجلٌ))[2]، پێشەوا سیبویە هۆنیوێتێوە:**

ش١٨١/وَبِالْجِسْمِ مِنِّي بَيِّناً لـو عَلِمْتِهِ     شُحُوبٌ وإنْ تَسْتَشْهِدِي العَيْنَ تَشْهَدِ[3]

**وە وەکو ووتەی:**

ش١٨٢/ ومَا لاَمَ نَفْسي مِثْلَهَا لِى لاَئِمٌ     ولا سَدَّ فَقْري مِثْلُ ما مَلَكَتْ يَدِي.[4]

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە:٣٣٨/بەنەناسراوی نایا خاوەن حالە بەزۆری-واتا:خاوەن حال دەبێ ناسراو بێ-مەگەر لە سێ شوێندا:ا/ئەگەر خاوەن حال دوا کەوێت-واتا حال پێش= خاوەنەکەی بکەوێت-.ب/یان تایبەت کرێ بەهۆی وەصفکردن یان إضافە. ج/یان بکەوێتە دوای نەفی یان هاوشێوەی نەفی،وەکو((لاَ يَبْغِ امْرُؤٌ عَلَى امْرِىءٍ مُسْتَسْهِلاَ))واتا:با کەس دەست درێژی نەکاتە سەر کەسدا بە سانای،لەم ڕستەیەدا((مْرُؤٌ))خاوەن حالە ونکرە،بۆیە دروستە چونکە نەفی لەپێشێەوە هاتووە.

[2] لەم ڕستەیەدا((رجلٌ))خاوەن حالە ونەناسراوە ،وبۆیە دروستە چونکە حالەکەی((قائماً))پێشی کەوتووە.

[3]ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:بێگومان ڕەنگم تێکچووەو لاواز بووم ئەگەر بزانی بەزەییت پێمدا دێتەوە،وە ئەگەر بەڵگەت دەوێ بە چاو تەماشاکە.بەڵگەکەی:(( شُحُوبٌ))ناوێکی نەناسراوە وخاوەن حالە،بۆیە دروستە چونکە حالەکە-کە((بَيِّناً))- پێشی کەوتووە.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:بێگومان ئەو سەرزەنشتەی کاریگەری هەیە لەسەر مرۆڤ سەرزەنشتنی خۆیەتی،وەئەوەی کە جێی نەبوونی وپێداویستی مرۆڤ پڕ دەکاتەوە ئەوەی دەستی خۆیەتی. بەڵگەکەی:(( لائمٌ))ناوێکی نەناسراوە وخاوەن حالە،بۆیە دروستە چونکە حالەکە-کە((مثْلَها))یە- پێشی کەوتووە.

کەواتا((قائماً)):حالە بۆ((رجلٌ))،وە((بيّناً))حالە بۆ((شُحُوبٌ))،وە((مِثْلَهَا))حالە بۆ((لأَئِمٌ)).

**یەکێکی تر[1]:ئەوەیە کە ناوە نەناسراوەکە تایبەت کریٚ بەهۆی وەصف کردن،یان إضافە ،نموونەی ئەوەی تایبەت کرابیٚ بە وەصف کردن فەرموودەی خوای گەورەی:**

﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ، أَمْرًا مِنْ عِنْدِنَا﴾[2]،**وە وەکو ووتەی شاعر:**

**ش١٨٣/** نَجَّيْتَ يا ربِّ نُوحاً واسْتَجَبْتَ لَهُ  في فُلْكٍ مَاخِرٍ في اليَمِّ مَشْحُونَا

وعاش يدعـو بآيات مبينـــةٍ  في قومِهِ ألفَ عامٍ غيرَ خمسينا.[3]

**وەنموونەی ئەوەی تایبەت کرا بیٚ بە هۆی إضافەوە فەرموودەی خوای گەورە**﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ﴾[4].

---

[1] **ئەمە حاڵەتی دووەمە لەوحاڵەتانەی کەدروستە خاوەن حال نەناسراو بیٚ.**

[2] **ئایەتی ژمارە(٣و٤)ی سورەتی((الدخان))،پوختەی ماناکەی{لەو شەوە پیرۆزەدا-کە شەوی قدرە- هەموو کاروبارێکی بەجیٚ وگرنگ لێك جیادەکرێنەوە ، فەرمانێکە لە لایەن ئێمەوە.}.**

**إعرابەکەی:** فيها/جارومجرور متعلقان بـ(يفرق)، يفرق/فعل مضارع مبني للمجهول مرفوع ،كلُ/نائب فاعل مرفوع ،وهو مضاف ،امر/مضاف إليه مجرور. حكيم/نعت مجرور. امراً/حال من امرِ منصوب .من عند/جارومجرور ،و(عند)مضاف ،نا/ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه.:(( أَمْرٍ حَكِيمٍ ، أَمْرًا)) ،

**بەڵگەکەی :لێرەدا ((امرٍ))خاوەن حالە ونكرەیە وتایبەت کراوە بە هۆی وەصف کردنی بە((حکیمٍ)).**

***تێبینی***:**زانایان لە إعراب کردنی ووشەی((أمْرًا))شەش بۆچوونیان هەیە:١-مفعول بە بۆ((مُنذرين)). ٢-مفعول لە .٣-مفعول مطلق((مصدر))ە.٤- حالە بۆ جێناوی ((حکیم)).٥-بدلە. ٦- نائب مصدرە.**

[3] **ماناو بەڵگەی ئەم دوو دێڕە:ڕزگارت کرد ئەی پەروەردگار نوح ،و وەڵامت دایەوە ،لەناو کەشتیە تیژەکە لە دەریادا کەشتیەکەی پڕبوو. ژیاوبانگەوازی کرد بەبەڵگەی روون وئاشکرا لەناو گەلەکەیدا ١٠٠٠ساڵ جگە لە ٥٠واتا(٩٥٠)ساڵ دەعوەی کردووە. بەڵگەکەی:(( فلكٍ))ناوێکی نەناسراوە وخاوەن حالە بۆیە دروستە چونکە تایبەت کراوە بەهۆی وەصفکردنەوە.**

[4] **ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٠)ی سورەتی((فصلت))،پوختەی ماناکەی{لەماوەی چوار ڕۆژدا-خوای گەورە بژێووی هەموو گیاندارانی لەزەویدا**

هەروەها حاڵەتێکی تر[1]:ئەوەیە ناوە نەناسراوەکە لەپاش نەفی یان هاوشێوەی نەفیەوە بێ،هاوشێوەی نەفی بریتیە لە استفهام ونەهی،ئەمەیە مەبەست لەووتەی((أَوْ يَبِنْ مِنْ بَعْدِ نَفْيٍ أَوْ مُضَاهِيهِ))،جا نموونەی ئەوەی لە پاش نەفیەوە بێ ووتەی:

ش١٨٤/ مَا حُمَّ مِنْ مَوْتٍ حِمًى وَاقِياً ولا تَرَى مِنْ أَحَدٍ بَاقِيَا[2]

لەم جۆرەیە فەرموودەی خوای گەورە﴿وَمَا أَهْلَكْنَا مِنْ قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَعْلُومٌ﴾[3]لێرەدا ڕستەی((لها كتابٌ))لە محلی نصبی حالە بۆ((قرية))وە دروستە هاتنی حال بۆ ناوی نەناسراو لەبەر ئەوەی نەفی لەپێشێوە هاتووە، وەدروست نیە ئەم ڕستەیە ببێتە

---

دیاریکرد- بەیەکسانی بۆ گشت داواکەران}. إعرابەکەی: في أربعة/جارومجرور متعلقان بـ(جعل)المتقدم ،وأربعة مضاف ،أيام/مضاف إلية مجرور. سواءً/حال من الضمير في (أقواتها) ،للسائلين/جارومجرور متعلقان بـ(سواءً). بەڵگەکەی((سواءً)) حالە بۆ( أربعة)کە ناوێکی نەناسراوە وتایبەت کراوە بەهۆی إضافە کردن.

[1] واتا:حاڵەتی سێیەم لەو حاڵەتانەی کە دروستە خاوەن حال نەناسراو بێ.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: هیچ شتێك لە مردن پارێزەر نیە ،وەهیچ کەسیش لەم دونیایە نەمر نیە. بەڵگەکەی: هەریەك لە((وَاقِياً،و بَاقِياً)) حالن بۆ ((حمىً ،واحد))کە نەناسراون ،وبۆیە دروستە چونکە هەردووکیان کەوتونەتە پاش نەفی.

[3] ئایەتی ژمارە(٤)ی سورەتی((الحجر))،پوختەی ماناکەی {خەڵکی هیچ ئاوەدانیەکمان لەناو نەبردووە مەگەر کاتی دیاریکراو بۆ لە ناوچوونیان هەبووە.} إعرابەکەی: و/حسب ماقبلها .ما/نافية غير عاملة .أهلكْ/فعل ماضٍ مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك ،نا/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. مِنْ/حرف جر زائد .قريةٍ/ مجرور لفظا منصوب محلا على أنه مفعول به. إلا/أداة حصر. ولها/ و:واوالحال ،لها:جارومجرور في محل رفع خبر مقدم .كتاب/مبتدا مؤخر معلوم/نعت مرفوع. وجملة((لها كتاب معلوم))في محل نصب حال من قرية. الشاهد فيه: جملة((ولها كتاب معلوم))حالية ،وصاحب الحال هو((قرية))اسم نكرة وصح مجئ الحال منه لتقدم النفي عليها.

**صفە بۆ((قریة))،بەپێچەوانەی بۆچوونی زمخشری[١]،چونکە حەرفی((واو))[٢]ناکەوێتە نێوان صفەوموصوف،هەروەها بوونی حەرفی((إلاّ))ڕێگرە لەوەی ڕستەی((لها کتابٌ)) صفە بێ،چونکە((إلاّ))ناکەوێتە نێوان صفەو موصوف، لەو زانایانەی ڕاشکاوانە ئەمەیان فەرمووە،ئەبولحەسەن ئەخفەش لە کتێبی(المسائل)،وە ئەبو علی فارسی لە کتێبی((التذکرة)).**

**وە نموونەی ئەوەی لە پاش استفهامەوە هاتبێ ووتەی:**

**ش١٨٥/** یاصَاحِ هَلْ حُمَّ عَیْشٌ بَاقِیاً فَتَرَی لِنَفْسِكَ العُذْرَ فِي إبْعَادِهَا الأَمَلاَ[٣].

**وە نموونەی ئەوەی لە پاش نەهیەوە هاتبێ ووتەی دانەر((**لاَ یَبْغِ امْرُؤٌ عَلَی امْرِیءٍ مُسْتَسْهِلاً**))،وە ووتەی قطريّ بن الفجاءة :**

**ش١٨٦/** لا یَرْکَنَنْ أحدٌ إلی الإحْجَامِ یومَ الوَغَی مُتَخَوِّفاً لِحِمَامِ.[٤]

**دانەر خۆی پاراست بەووتەی((غالباً))[٥] لەوەی کە بە کەمی هاتووە حال بۆ ناوی ناسراو بەبێ بوونی هیچ کام لەو پاساوانەی باسکران،وەکو ووتەیان((**مررت بِمَاءٍ قِعْدَةَ رَجُلٍ**))[٦]،**

---

[١] **پێشەوا زمخشری وچەند زانایەکی تر پێیان وایە ڕستە((لها کتابٌ)) دەبێتە صفە بۆ((قریة))ونابێتە حال بۆی.**

[٢] **مەبەست :واوی ((ولها کتابٌ)).**

[٣] **ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: ئەی هاوەڵم ئایە ژیان پاراستوێتی نەمری ،تا تۆ پاساوی دوور کەوتنەوەت هەبێ لە چاکەکردن. بەڵگەکەی:((باقیاً))حالە بۆ((عیشٌ))کە ناوێکی نەناسراوە،بۆیە دروستە چونکە لەپاش استفهامەوە هاتووە.**

[٤] **ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:باهیچ کەس بیری بە لای ڕاکردندا نەچێ لە ڕۆژی جەنگدا لە کاتێکدا لە مردن بترسێ. بەڵگەکەی:((مُتخوّفاً))حالە بۆ((أحدٌ))کە ناوێکی نەناسراوە،بۆیە دروستە چونکە لەپاش نەهیەوە هاتووە.**

[٥] **کە لە دێڕی (٣٣٨)دا هاتووە.**

[٦] **لەم ڕستەیەدا((قِعْدَةَ))حالەو خاوەن خالەکەش کە((بِمَاءٍ))نەناسراوە،وهیچ کام لەو پاساوانەی باسکران تێیدا نیە،واتای قسەکەش:تێپەڕبووم بەلای ئاوێکدا کە بەئەندازەی جێ دانیشتنی پیاوێك بوو.**

وە ووتـەیان((علیه مائةٌ بِیضاً))[1]، وە پێـشەوا سـیبویە بەدروسـتی دانـاوە((فیها رجلٌ قائماً)).هەروەها لەم فەرموودەیەدا:((صلَّى رسولُ الله ﷺقاعداً وصَلَّى وراءَه رجالٌ قِياماً))[2].

* * *

٣٤٠/ وَسَبْقَ حَالٍ مَا بِحَرْفٍ جُرَّ قَدْ     أَبَـوْا وَلاَ أَمْنَعُـهُ فَقَـدْ وَرَدْ[3].

بۆچوونی زۆرینەی زانایانی نحو وایە دروست نیە پێشکەوتنی حال بەسـەر خاوەن حالەکەی کە مجرورە بە حەرفی جەڕ، کەواتا نالێیت لەڕستەی((مررتُ بِهندٍ جالسةً)): مررت جالسةً بِهندٍ. بەلاّم هەریەك لـە پێشەوا فارسـی،وابن کیسان ،وابن برهان، پێیان دروستە،ودانەریش هاوڕایانە،چونکە لەزمانی عەرەبیـدا هاتووە،وەکو ووتەی:

ش١٨٧/ لَئِنْ كانَ بَرْدُ الماءِ هَيْمَانَ صَادِياً     إِلَيَّ حَبِيبـاً إِنَّها لَحَبِيـبُ.[4]

---

[1] واتا:لەسەرێتی ١٠٠درهەمەی زیو،ووشەی((بِیضاً))حالە وبەواتای زیو دێ ،وخاوەن حالەکە بریتیە لە((مائةٌ))نە ناسراوە.

[2] ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە بە لەفزێکی تر، پوختەی ماناکەی:{پێغەمبەری خواﷺ نوێژی بەدانیشتنەوە کرد ،ووە چەند کەسێك لەدوایەوە بە پێوە نوێژیان کرد.}. إعرابەکەی: صلی/فعل ماضٍ .رسولُ/فاعل مرفوع ،وهو مضاف ،اللهِ/لفظ الجلالة مضاف إليه مجرور، قاعداً/حال —من رسول-منصوب ،و/حرف عطف ،صلى/ معطوفة على صلى الاولى وتعربُ إعرابها .رجالٌ/فاعل مرفوع ،قياماً/حال من رجال منصوب . الشاهد فيه:((قياماً)) حيث جاء الحال((قياما))من نكرة((رجال))،وهذا قليل نادر.

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: زۆربەی زانایان ڕێگەیان نەداوە پێشکەوتنی حال بەسەر خاوەن حاڵێکی مجرور بەحەرفی جەڕ،بەلاّم من —واتا:ابن مالك—بە نادروستی نازانم ،چونکە هاتووە.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: سوێند بێ ئەگەر ئاوی سارد لە کاتێکدا زۆر تینوم بێ ، زۆر لام خۆشەویستە ،بێگومانیش خۆشەیستە. بەڵگەکەی:(( هَيْمَانَ صَادِياً)) هەردووکیان حالن بۆ جێناوی((ي))لکاو بە حەرفی((إلى)) وپێش خاوەن حالەکەی کەوتووە.

لێرەدا((هَیْمَانَ،وصَادِیاً)) حالن بۆ جێناوی((ی))لكاو به حەرفی((إلی))،وه ووتەی: ش١٨٨/ فَإِنْ تَكُ أَذْوادٌ أُصِبْنَ وَنِسْوَة   فَلَنْ يَذْهَبُوا فَرْغاً بِقَتْلِ حِبَالِ.[١]

لێرەدا((فَرْغاً))حاله بۆ(قتل).

بەلام پێشكەوتنی حال بەسەر خاوەنەكەی كه مرفوع ومنصوبه ئەوه دروسته،وەكو((جاء ضاحكاً زیدٌ ،و وضربْتُ مجردةً هنداً)).

*   *   *

***باسی هاتنی حال بۆ مضاف إلیه:**

٣٤١- وَلاَ تُجِزْ حَالاً مِنَ الْمُضَافِ لَهْ   إلاَّ إِذَا اقْتَضَى الْمُضَافُ عَمَلَهْ

٣٤٢-أَوْ كَانَ جُزْءَ مَا لَهُ أُضِيفَا   أَوْ مِثْلَ جُزْئِهِ فَلاَ تَحِيفَا[٢].

دروست نیه هاتنی حال له مضاف إلیه ،مەگەر ناوه مضافەكه لەوانه بێ كه دروسته عەمەل له حالەكه بكات:وەكو اسمی فاعل ،ومصدر، و هاوشێوەكانیان لەوانەی كه مانای فعل لەخۆ دەگرن،كەواتا دەڵێی:(( هذا ضاربُ هندٍ مُجرّدةً[٣]، وأعجبني قیامُ زیدٍ مسرعاً[٤]))،

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:ئەگەر كۆمەڵێ ووشتر وئافرەتتان دەست كەوتبێ ،ئەوه ئەتان بردووه به سانای وبەلاش كوشتنی حبالی برام  بەڵگەكەی:(( فَرْغاً))حاله بۆ(قتل)كه مجروره به حەرفی(بـ)،وپێشی خاوەن حالەكەی كەوتووه.

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیه:٣٤١/دروست نیه هاتنی حال بۆ ناوێ كه مضاف إلیه بێ ،مەگەر لەسێ حاڵەتدا:ا-ئەگەر ناوه مضافەكه عاملی حالەكه بێ. ٣٤٢/ب-یان ئەگەر ناوه مضافەكه بەشێك بێ له ناوه مضاف إلیه كه. ج-یان وەكو بەشێك وابێ له مضاف إلیه كه ،جا ئەگەر هیچ كام لەمانه نەبوو ئەوه له یاساكه لامەده ودەرمەچۆ.

[٣] لەم ڕستەیەدا((مُجَرّدةً))حاله بۆ ((هندٍ))كه مضاف إلیه ،بۆیه دروسته چونكه ناوه مضافەكه- ضاربُ-اسمی فاعله وعاملی حالەكەیه.

[٤] لەم ڕستەیەشدا((مسرعا)) حاله بۆ ((زیدٍ))كه مضاف إلیه ،بۆیه دروسته چونكه ناوه مضافەكه- قیامُ-مصدرەو عاملی حاله كەیه.

وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا..﴾[1]، وە وەکو ووتەی شاعر:

ش١٨٩/ تَقُولُ ابْنَتِي إنَّ انْطِلاَقَكَ وَاحِداً إلى الرَّوعِ يوماً تَارِكِي لا أَبَا لِيَا.[2]

هەروەها دروستە هاتنی حال لە مضاف الیە:کاتێك[3] ناوە مضافەکە بەشێك بێ لە مضاف إلیە کە،یان[4] وەکو بەشێك بێ لێی لەو ڕووەوەی کە مضاف إلیە کە بێنیاز بێ لە مضافەکە ،نموونەی ئەوەی مضافەکە بەشێك بێ لە مضاف إلیە فەرموودەی خوای گەورە﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا﴾[5]،لێرەدا((إخوانا)):حالە بۆ جێناوی مضاف إلیە لکاو بە ناوی((صدور))،وە صدوریش:بەشێکە لە مضاف إلیە کە

---

[1] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٤)ی سورەتی(یونس)،پوختەی ماناکەی{تەنها بۆ لای ئەوە گەڕانەوەتان تێکڕا..}. إعرابەکەی: إلیە: جارومجرور في محل رفع خبر مقدم .مرجعکُم/مرجع:مبتدأ مؤخر،وهو مضاف ،کم:ضمیر متصل مبني في محل جرّ مضاف إلیه. جمیعا/حال من الضمیر في(مرجعکم) منصوب. **الشاهد فیها**:((جمیعاً)) حال من المضاف إلیه ،وصحّ مجئ الحال من المضاف إلیه لأن المضاف-مرجع-مصدر متضمن معنی الفعل ،وعمل في الحال.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: کچەکەم دەڵێ: بێگومان چوونت بەتەنها بۆ جەنگ وا دەکات بێ باب بم **بەڵگەکەی**:(( وَاحِداً))حالە بۆ جێناوی لکاو بە((انْطِلاَقَكَ)) کە مضاف إلیە ،بۆیە دروستە لەبەر ئەوەی ناوە مضافەکە- انطلاقَ-مصدرەو عاملی حالە کەیە.

[3] ئەمە دەبێتە حاڵەتی دووەم لەو سێ حاڵەتەی کە دروستە حال لە مضاف إلیە بدرێتەوە.

[4] ئەمیش حاڵەتی سێیەمە.

[5] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٤٧)ـی سورەتی((**الحجر**))،پوختەی ماناکەی:{دەرمان هێناوە لە دڵیاندا-واتا:دڵی بەهەشتیان-هەموو ڕق وکینەیەك }، **إعرابەکەی**: و/حسب ما قبلها .نزعنا/نزع:فعل ماضٍ مبني علی السکون لاتصاله بضمیر رفع .نا/ضمیر متصل مبني علی السکون في محل رفع فاعل .ما/اسم موصول مبني في محل نصب مفعول به لـ(نزع). في صدور/جارومجرور،وهو مضاف ،هم/ضمیر مبني علی السکون في محل جرَ مضاف

نموونەی ئەوەی كە مضافەكە وەكو بەشێك بێ لە مضاف إليه كە- لەو ڕووەوەی كە مضاف إليه كە بێنیاز بێ لە مضافەكە-فەرموودەی خوای گەورە﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا﴾[1]،لێرەدا((حنيفاً))حالە بۆ((إبراهيم))،وملةَ وەكو بەشێك لە مضاف إليه كەيە ،چونكە دروستە بێنیاز بوون لە مضافەكە بە هۆی مضاف إليه كەيە،ئەگەر بوترێ لە جگە لەقورئان ((أَنِ اتَّبِعْ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا))ڕاست ودروستە.

جا ئەگەر ناوە مضافەكە عاملی حالەكە نەبوو،يان ئەگەر ناوە مضافەكە بەشێك نەبێ لە ناوە مضاف إليه كە، يان وەكو بەشێك نەبێ لە مضاف إليه كە ،ئەوە دروست نيە هاتنی حال بۆی،كەواتا دروست نيە بڵێی((جاء غُلاَمُ هندٍ ضاحكةً))بە پێچەوانەی بۆچوونی پێشەوا فارسی، وە ووتەی كوڕی دانەر[2]-ڕەحمەتی خوای لێ بێ-:((بێگومان ئەم نموونەيە[3] ڕێگە

---

إليه،وشبه الجملة لامحل لها من الاعراب صلة الموصول .من غلّ/جارومجرور في محل نصب حال بيان للذي استقر في صدورهم .إخوانا/ حال من الضمير((صدورهم))منصوب . **الشاهد فيها**:((إخواناً)) حال من المضاف إليه ،وصحّ مجئ الحال من المضاف إليه لأن المضاف جزءٌ من المضاف إليه ف(إخوانا) حال من الضمير المضاف إليه(صدور)،والصدور:جزء من المضاف إليه.

[1] ئەم ڕستەيە بەشێكە لە ئايەتی ژمارە(١٢٣)ی سورەتی(**النحل**)،پوختەی ماناكەی{پاشان نيگامان بۆ كردی كە پەيڕەوی ئاينی پێغەمبەر إبراهيم-عليه السلام-بكەی؛ چونكە پاك وڕاست بوو}. **إعرابەكەی**:ثمّ/حرف عطف .أوحينا/فعل وفاعل .أن/ تفسيرية.اتبع/فعل وفاعل .ملة/مفعول به،وهو مضاف، إبراهيمَ/مضاف إليه مجرور وعلامة جره الفتحة لأنه ممنوع من الصرف، حنيفا/ حال منصوب. **الشاهد فيها**:((حنيفاً)) حال من المضاف إليه ،وصحّ مجئ الحال من المضاف إليه لأن المضاف-ملة- كجزءٍ من المضاف إليه.

[2] واتا: كوڕی ابن مالك

[3] واتا:نموونەی((جاء غُلاَمُ هندٍ ضاحكةً))وهاوشێوەكانی.

پێنەدراوە بەبێ خیلاف))ئەم ووتەیە بەهێز نیە،چونکە بە بۆچوونی پێشەو فارسی دروستە،وەکو ڕابورد، لەوانەی ئەم بۆچوونەیان باس کردووە پێشەوا شەریف باوکی سعادات کوڕی شەجەری لە کتێبی(امالی)یەکەی.

*    *    *

***باسی پێشکەوتنی حال بەسەر عاملەکەی:**

٣٤٣-وَالْحَالُ إِنْ يُنْصَبْ بِفِعْلٍ صُرِّفَا        أَوْ صِفَةٍ أَشْبَهَتِ الْمُصَرَّفَا

٣٤٤-فَجَائِــزٌ تَقْدِيمُهُ كَ مُسْرِعاً        ذَا رَاحِلٌ وَمُخْلِصاً زَيْدٌ دَعَـا.[1]

دروستە پێشکەوتنی حال بەسەر عاملەکەی ئەگەر فعلی متصرف بێ،یان صیفەتێك بێ هاو وێنەی فعلی متصرف بێ،مەبەست:ئەو ناوەیە کە مانای فعل وحەرفەکانی فعلی لەخۆگرتبێ،وکردن بە مێ((تأنیث))ودووان ((تثنیة))وکۆ((جمع))وەرگرێ:وەکە اسمی فاعل،واسمی مفعول ،وصفەی مُشبّهە[2]،نموونەی پێشکەوتنی حال بەسەر فعلی متصرف:((وَمُخْلِصاً زَيْدٌ دَعَا))لێرەدا دعا:فعلێکی متصرفە[3]،وحالەکە پێشی کەوتووە، وە نموونەی پێشکەوتنی بەسەر صفەی هاوشێوەی فعل:(( مُسْرِعاً ذَا رَاحِلٌ)).

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٤٣/حال ئەگەر منصوب بێ بە فعلێکی متصرف ،یان منصوب بێ بە صیفەتێکی هاوشێوەی فعلی متصرف-واتا:اسمی فاعل واسمی مفعول و...-. ٣٤٤/ئەوە دروستە حالەکە پێش عاملەکەی کەوێت ،وەکو نموونەی((مُسْرِعاً ذَا رَاحِلٌ، وَمُخْلِصاً زَيْدٌ دَعَا))واتا:ئەو گەشتیارە حالی وایە پەلەیە،و زیدیش پاڕایەوە بە دڵسۆزی.

[2] صفەی مشبە ئەو صیفەتەیە کە جێگیرە لە وەصفکراوەکەی ،وەکو((طویل ،وقصیر، وحسنٌ ،...هتد))،بە پێچەوانەی اسمی فاعل کە بۆ صیفەتی کاتیە.

[3] واتا:جامد نیە.

**جا ئەگەر عاملی حالەکە فعلێکی متصرف نەبوو ئەوە دروست نیە پێشی کەوێ،کەواتا دەڵێی:**(( ما أحسنَ زيداً ضاحكاً))**وە ناڵێی**((ضاحكاً ما أحسنَ زيداً))**چونکە فعلی تعجب متصرف نیە بۆ خودی خۆی،کەواتا ناتوانێ متصرف بێ لە معمولەکەی**[1]**، هەروەها ئەگەر عاملەکەی صفەتێك بێ هاوشێوەی فعلی متصرف نەبێ،وەکو((افعل التفضيل))،لەو ڕووەوەی ناکرێتە دوان((تثنية))وکۆ،مێ((تأنيث))،ئەمیش لەخودی خۆیدا متصرف نەبێ ،ئەوە بۆ جگە لەخۆیشی ناتوانێ متصرف بێ،کەواتا ناڵێی**((زيدٌ ضاحكاً أحسنُ من عمرٍو))،**بەڵکو پێویستە بڵێی**((زيدٌ أحسنُ من عمرٍو ضاحكاً)).

* * *

**٣٤٥- وَعَامِلٌ ضُمِّنَ مَعْنَى الفِعْلِ لاَ حُرُوفَهُ مُؤَخَّراً لَنْ يَعْمَلاَ**

**٣٤٦-كَ((تِلْكَ لَيْتَ وَكَأَنَّ)) وَنَدَرْ نَحْوُ((سَعِيدٌ مُسْتَقِرًّا فِى هَجَرْ))**[2]

**دروست نیە پێشکەوتنی حال بەسەر عاملە معنوییەکەی**[3] **، عاملی معنوی بریتیەلە:ئەوەی مانای فعل ی لەخۆ گرتوە ،بەبێ حەرفەکانی فعل، وەکو**

---

[1] مەبەست لە معمولەکەی لێرەدا حالەکەیە.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٤٥/ئەگەر عاملێك مانای فعل لەخۆگرێ بەڵام حەرفەکانی فعلی تێدا نەبێ ئەوە نابێ دوا بکەوێ وحالەکەی پێش کەوێ.٣٤٦/وەکو((تِلْكَ، لَيْتَ ،وَكَأَنَّ))،وە بەکەمی هاتووە نموونەی((سَعِيدٌ مُسْتَقِرًّا فِى هَجَرٍ))واتا:زید جێگیر بووە لە شاری هجر،لێرەدا((مُسْتَقِرًّا))حالە وپێش عاملەکەی-کە فى هجر(جارومجرور)ە-کەوتووە ئەمەش کەمە.

[3] عاملی معنوی لە ڕێزمانی عەرەبیدا بە دوو مانا دێت:یەکەمیان:ئەوەیە کە لەبەرامبەری عاملی لفظی بەکاردێ بریتیە لە:عاملی:مبتدا وفعلی مضارعی مرفوع. دووەمیان -کە لێرەدا مەبەستە-بریتیە لەو ووشانەی مانای فعل لەخۆ دەگرن وعەمەلیش دەکەن بەڵام حەرفەکانی فعل لە خۆ ناگرن

**ئەسمای ئیشارە، حەرفی تمنّی ،وتشبیە،وظرف ،وجارومجرور،وەکو:((** تلك هندٌ مُجرّدةً، وليت زيداً أميراً أخوك ، وكأنّ زيداً راكباً أسَدٌ ، وزيدٌ في الدار-أوعندك -قائماً)).**دروست نیە پێشکەوتنی حال بەسەر عاملە معنویەکەی لەم نموونانەو هاوشێوەکانیان ،کەواتا نالّێی**((مُجرّدةً تلك هندٌ))**وەناوترێ**((وليت أميراً زيداً أخوك))**وە ناوترێ**((راكباً كأنّ زيداً أسَدٌ)).

**وە بەکەمی هاتووە پێشکەوتنی حال بەسەر عاملەکەی کە ظرف بێ وەکو**((قائماً زيدٌ عندك))**،وە جارومجرور بێ وەکو**((سَعِيدٌ مُسْتَقِرًّا فى هَجَر))**،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە:**﴿وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ﴾[1]**، لە خوێندنەوەی ئەوانەی حەرفی(تا)ی((مطويات))یان بە کسرە خوێندۆتەوە[2]،وە پێشەوا ئەخفەش بەدروستی دەزانێ بەقیاسی[3]**

---

[1] **ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٦٧)ی سورەتی(الزمر)،پوختەی ماناکەی ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی ئەو-خوای گەورە-پێچراونەتەوە}. إعرابەکەی: و/حسب ما قبلها. السماوات/مبتدأ مرفوع .مطويات/خبر مرفوع ،وفي قراءة-وهي مقصودة هنا- مطوياتٍ بالكسر تكون:حال من الضمير في((بيمينه))،منصوب وعلامة نصبه الكسرة بدل الفتحة لأنه جمع مؤنث سالم. بيمينه/جارومجرور متعلقان بـ(مطويات)، أو هما الخبر في قراءة(مطوياتٍ). الشاهد فيها:((مطوياتٍ))حيث جاء تقديم الحال-نادراً-على عاملها الجار والمجرور(بيمينه)في قراءة من قرأ (مطوياتٍ)بالكسر.**

[2] **زۆربەی زانایان ((مطوياتٌ))یان بە مرفوعی خوێندۆتەوە وئەو کات دەبێتە خبر وەکو لە إعرابەکەدا ئاماژەمان پێکرد،بەلاّم هەندێکیان بە منصوبی خوێندوویانەتەوە ،ودەیکەنە حال.**

[3] **واتا:بەبۆچوونی پێشەوا ئەخفەش دروستە پێشکەوتنی حال بەسەر عاملەکەی کاتێك عاملەکەی جارومجرور بێ بەپێی یاساوقیاس .**

٣٤٧- وَنَحْوُ((زَيْدٌ مُفْرَداً أَنْفَعُ مِنْ عَمْرٍو مُعَاناً)) مُسْتَجَازٌ لَنْ يَهِنْ.[1]

**پێشتر ڕابورد کە افعلی تفضیل عەمەل ناکات لەحال کاتێ حالەکەی پێشی کەوێ،بەڵام جیای کردەوە لەم یاسایە ئەم حاڵەتە،کە بریتیە :لەوەی فەزڵی شتێك بە حاڵێکەوە بدەی بەسەرخۆیدا یان بەسەر شتێکی تردا لە حاڵتێکی تردا[2]،ئەوە بێگومان عاملەکە عەمەل لە دوو حال دەکات یەکێکیان پێشی کەوتووە،وئەوی تریان لەپاشیێتی،ئەمەش وەکو نموونەی:**((زيدٌ قائماً أحسنُ منه قاعداً))و(( وزيدٌ مفرداً أنفعُ من عمرو مُعَاناً ))**لەم دووڕستەیدا هەریەك لە**((قائماً ،ومفرداً))**حالن ومنصوبن بە**((أحسنُ ،وأنفع))،**هەروەها((قاعداً،ومعاناً))یش بەهەمان شێوە،ئەمەش بۆچوونی زۆربەی زانایانە.**

**بەڵام پێشەوا سیراف پێی وایە هەریەك لەو دوو حالە منصوبن بە فعلی(کان)ی حذفکراو،وتقدیرەکەی:**((زيدٌ إذا كان قائماً أحسنُ منه إذا كان قاعداً ، وزيد إذا كان مفرداً أنفعُ من عمرو إذا كان مُعَاناً)).

**وە دروست نیە لەم کاتەدا پێشکەوتنی هەردوو حالەکە بەسەر افعلی تفضیلەکە ،وە دواکەوتنی هەردووکیان لێی،کەواتا دروست نیە بڵێی**((زيدٌ قائماً قاعداً أحسنُ منه)) **وە ناڵێی**((زيدٌ أحسنُ منه قائما قاعداً )).

* * *

---

[1] **پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:وێنەی ئەم ڕستەی**((زَيْدٌ مُفْرَداً أَنْفَعُ مِنْ عَمْرٍو مُعَاناً))**- واتا:کاتێك عاملی حال افعلی تفضیل بێ وبکەوێتە نێوان دوو حالەوە-لەم کاتەدا دروستە حالەکەی پێش کەوێ ولاواز نیە.مانای ڕستەکە:زید بەتەنها بێ بەسوودترە لەعەمر کە یارمەتی دەری هەبێ.**

[2] **واتا:لەم کاتەدا دوو حال هەیە لەڕستەکەدا وعاملەکەی-کە افعلی تفضیلە- دەکەوێتە نێوانیان.**

***باسی فرەحالی لە ڕستەدا((تعدد الحال))؛**

٣٤٨-وَالْحَالُ قَدْ يَجِيءُ ذَا تَعَدُّدِ لِمُفْـرَدٍ فَاعْلَمْ وَغَيْرِ مُفْـرَدِ.[1]

**دروستە حال فرە بێ وخاوەنەکەی یەك بێ،وە دروستە خاوەنەکەیشی فرە بێ. نموونەی یەکەم:((** جاء زيدٌ راكباً ضاحكاً**))لێرەدا هەریەك لە((**راكباً،وضاحكاً**)) حالن بۆ زید،وعاملەکەیان بریتیە لە فعلی((**جاء**)).**
**نموونەی دووەم[2]:((** لقيتُ هِنداً مُصْعِداً مُنْحَدِرةً**))لێرەدا((**مُصْعِداً**))حالە بۆ جێناوی((**تُ**))،وە((**مُنْحَدِرةً**))حالە بۆ((هند))،وعاملی هەردووکیان بریتیەلە((**لقيتُ**))، وە وەکو ووتەی:**

ش١٩٠/ لَقِيَ ابْنِي أَخَوَيْهِ خَائِفاً مُنْجِدَيْهِ فَأَصَابُوا مَغْنَماً.[3]

**لەم شعرەدا((خائفاً))حالە بۆ((ابني))،وە((ومُنجديە))حالە بۆ((أخويە))،وعاملی هەردووکیان فعلی((لقيَ)).**
**جا لەکاتی دەرکەوتنی مانادا هەر حالێك دەبرێتەوە بۆ ئەو ناوەی شایستەیەتی ولەگەڵی دەگونجێ، بەڵام لەکاتی دەرنەکەوتنی مانادا حالی یەکەم دادەنرێ بۆ ناوی دووەم،وە حالی دووەم دادەنرێ بۆ ناوی یەکەم، بۆ نموونە لە ڕستەی:((**لقيتُ زيداً مُصْعِداً مُنْحَدِراً**))،((مُصعداً))دەبێتە حال بۆ زید،وە((مُنحدراً))دەبێتە حال بۆ جێناوی((تُ)).**

* * *

---

[1] پوختەی ماناى ئەم دێرەی ئەلفیە:حال دەکرێ بە فرەی بێ بۆ یەك کەس ،وەبۆ زیاتر لە یەك کەسیش.

[2] واتا:نموونەی ئەوەی هەریەك لە حال وخاوەنەکەی فرە بن.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:گەشت کوڕەکەم لە حاڵێکدا دەترسا بە دوو براکەی لە حاڵێکدا بە هانەیەوە هاتن ،ودەستکەوتی زۆریان دەستکەوت. بەڵگەکەی:((خائفاً ،ومنجديە)) هردووکیان حالن بۆ هەریەك لە((ابني ،واخويە)).

***باسي حالي مُؤكّدة:**

**٣٤٩/وَعَامِلُ الْحَالِ بِهَا قَدْ أُكِّدَا فِى نَحْوِ:((لاَ تَعْثَ فِى الأَرْضِ مُفْسِدَا))[١]**

**دابەش دەبیٚ حال[٢]بۆ:بەهێزکەری عاملەکەی((مُؤكّدة))[٣]،وغير مؤكّدة، مؤكّدة کەش دابەش دەبیٚ بۆ دووجۆر .جۆری یەکەم لە حالی مؤكّدة:ئەوەیە کە عاملەکەی بەهێز دەکات ،ئەمەیە مەبەستی ئەم دێڕە[٤]،ئەویش بریتیە لە:هەموو وەصفێك کە مانای عاملەکەی لەخۆ گرتبیٚ ،وبەلاّم لە لفظدا لێی جیابیٚ،ئەمەش زۆرترە ،یان لە لفظیشدا هاوتای بیٚ ،ئەمەیان زۆرترنیە ،جانموونەی یەکەم((لاَ تَعْثَ فِى الأَرْضِ مُفْسِدَا))[٥]،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾[٦]، وە فەرموودەی خوای گەورە:**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەندیٚ جار حال مانای عاملەکەی بەهێز دەکات ،وەکو نموونەی ((لاَ تَعْثَ فِى الأَرْضِ مُفْسِدَا))واتا:خراپە مەکە لەسەر زەویدا حالّت وابیٚ خراپەکار بی.

[٢] حال چەند دابەش بوونێکی هەیە یەکێکیان ئەمەی ئێرەیە.

[٣] ووشەی توکید لە زمانی عەرەبیدا واتا:بەهێزکردن ، (مؤكّدة)واتا:بەهێزکار،جا ئێمە لەکاتی شەرح کردندا ووشەی مؤكّدة بە کاردێنین.

[٤] واتا:دێڕی ٣٤٩ی ئەلفیە.

[٥] لەم ڕستەیەدا((مُفْسِدَا))حالە بۆ جێناوی نادیاری((تعث))وعاملەکەی بریتیە لە((تعثَ))کە لەڕووی مانانەوە لە گەلّ حالەی یەکن ،بەلاّم لە لفظدا جیاوازن.

[٦] ئەم ڕستەیە ڕستەی کۆتاییە لە ئایەتی ژمارە(٢٥)ی سورەتی((**التوبة**))، ماناکەی{پاشان پشتان کردە دوژمن وهەلّهاتن}.إعرابەکەی: ثم/حرف عطف ،وليتم/فعل وفاعل ،مُدبرين/حال من الضمير في(وليتم) منصوب ،وعلامة نصبه الياء **الشاهد فيها**: ((مدبرين))وهي حال مؤكدة لعاملها ،وهي وصف دلَ على معنى عامله ،وخالفه لفظاً، فـ((مدبرين))وافقت ((ولَيتم))معنىً ،وخالفتها لفظاً.

﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾[(١)]،وە نموونـەی دووەم[(٢)] فـەرموودەی خـوای گـەورە:﴿وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا﴾[(٣)]،وە فـەرموودەی:﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ﴾[(٤)].

---

(١) ئەم ڕستە قورئانیە لە کۆتای پێنج ئایەت لە قورئاندا هاتووە:١-سورەتی البقرة ئایەتی(٦٠)، ٢-الأعراف(٧٤)،٣-هود(٨٥) ،٤-الشعراء(١٨٣)،٥-العنكبوت(٣٦). ماناکەی{خراپەکاری مەکەن لە زەویدا بە خراپەکاری}. إعرابەکەی: و/حرف عطف .لا/حرف نهي وجزم .تعثوا/فعل مضارع مجزوم بـ(لا)الناهية وعلامة جزمه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة ،والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل.في الأرض/جارومجرور متعلقان بـ(تعثوا). مفسدين/ حال من الواوفي(تعثوا) منصوب ،وعلامة نصبه الياء . **الشاهد فيها:** ((مفسدين))وهي حال مؤكدة لعاملها وهي وصف دلّ على معنى عامله ،وخالفه لفظاً، فـ((مفسدين))وافقت ((تعثوا))معنىً ،وخالفتها لفظاً.

(٢) واتا:نموونەی ئەوەی حاڵەکە هاوواتای عاملەکەی بێ لە ماناولفظدا.

(٣) ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٧٩)ی سورەتی(النساء)،پوختەی ماناکەی {ئێمە تۆمان ناردووە بۆ خەڵکی بە پێغەمبەر}. إعرابەکەی: و/حسب ماقبلها .أرسلناك/فعل وفاعل ومفعول به.للناس/جارومجرور متعلقان بـ(أرسلناك). رسولاً/حال مؤكدة منصوبة **الشاهد فيها:** ((رسولاً))حال مؤكدة لعاملها، وهي وصف دلّ على معنى عامله ،ووافقه لفظاً.

(٤) ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٢)ی سورەتی(النحل)،پوختەی ماناکەی{ڕامی هێناوە بۆتان شەو وڕۆژ وخۆر ومانگ ،هەروەها ئەستێرەکانیش ڕامهێنراون بە فەرمانی خوا} إعرابەکەی: و/حسب ماقبلها . سخر/فعل ماض ، وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره((هو)).لكم/جارومجرور متعلقان بـ(سخر). الليلَ/مفعول به ،والنهارَ/و:حرف عطف ،النهار والشمسَ والقمرَ والنجومَ/ كلها معطوفة على الليل منصوبة. مسخراتٍ/حال منصوب-على قراءة- وعلامة نصبه الكسرة لأنه جمع مؤنث سالم. بأمره/جارومجرور متعلقان بـ(مسخرات). **الشاهد فيها:** ((مسخراتٍ))حال مؤكدة لعاملها، وهي وصف دلّ على معنى عامله ،ووافقه لفظاً(سخرَ...مسخراتٍ) على إحدى القراءات.

٣٥٠- وَإِنْ تُؤَكِّدْ جُمْلَةً فَمُضْمَرُ        عَامِلُهَا وَلَفْظُهَا يُؤَخَّرُ[١].

**ئەمە بەشی دووەمە لە حالی مُؤكِّدە،کە بریتیە لە:وەی کە توکیدی ناوەڕۆکی ڕستە دەکات،مەرجی ڕستەکەش ئەوەیە:کە اسمی بێ،وهەردوو بەشەکەی[٢] ناسراو (معرفە)، ونەگۆڕ(جامد)بن ،وەکو:((زيدٌ أخوك عطوفاً ، وأنا زيدٌ معروفاً))،وە وەکو ووتەی:**

**ش١٩١/**أَنَا ابْنُ دَارَةَ مَعْرُوفاً بِهَا نَسَبِي        وَهَلْ بِدَارَةَ يَالَلنَّاسِ مِنْ عَارِ.[٣]

**هەریەك لە((عطوفاً،و معروفاً))حالن ومنصوبن بە فعلێکی نادیاروحذفکراو بە واجبی،وتقدیرەکەی لە یەکەمدا[٤]((** أحقهُ عطوفاً**))وە لەدووەمدا((**أحقهُ معروفاً**)).**

**وە دروست نیە پێشکەوتنی ئەم جۆرە حالە بەسەر ڕستەکەدا،کەواتا نالێیت((**عطوفاً زيدٌ أخوك**))وە نالێی((**معروفاً أنا زيدٌ**))،هەروەها دروست نیە حالەکە بکەوێتە نێوان مبتداو خبرەکەوە ،کەواتا نالێی((**زيدٌ عطوفاً أخوك**)).**

*  *  *

***باسی حالی جملە:**

٣٥١- وَمَوْضِعَ الْحَالِ تَجِيءُ جُمْلَهْ        كَجَاءَ زَيْدٌ وَهْوَ نَاوٍ رِحْلَهْ.[٥]

---

**[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەگەر حالە توکیدی ناوەڕۆکی ڕستەیەکی دەکرد- واتا توکید بوو بۆ جملەیەك نەوەك ناوێکی تاك-ئەوە پێویستە عاملەکەی نادیار بێ ،وحالەکەش دەبێ لە دوای جملەکەوە بێ ونابێ پێشی کەوێ.**

**[٢] واتا:مبتدا وخبرەکەی.**

**[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: من کوڕی ئەو ئافرەتەم کە ناوی دارەیە ،ونەسەب ونەژادم لێی زانراوە، خۆ هیچ نەنگی وخراپەیەکی تێدا نیە. بەڵگەکەی:((**مَعْرُوفاً**))حالە وناوەڕۆکی ڕستەکەی پێش خۆی بەهێزکردووە.**

**[٤] واتا:لەڕستەی((**زيدٌ أخوك عطوفاً**)).**

**[٥] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: حال هەندێ جار دێ بەوەی کە ڕستە((جملە))یە،وەکو نموونەی((**جَاءَ زَيْدٌ وَهْوَ نَاوٍ رِحْلَهْ**))واتا:هات زید لە کاتێکدا نیەتی وایە گەشت بکات.لێرەدا ((**وَهْوَ نَاوٍ رِحْلَهْ**))جملەیە ولە محلی نصبی حالە.**

ئەصل وبنچینە وایە هەر یەك لە حال وخبر وصِفە تاك بیٚ وڕستە نەبیٚ ،بەلاٌم دەكریٚ هەندیٚ جار حال ڕستە بیٚ،هەروەكو چۆن دەكریٚ هەریەك لە خبر وصفەش ڕستەبن ،لەم كاتەدا كە ڕستە بیٚ پیٚویستە لە ڕستەكەدا شتیٚك هەبیٚ پەیوەندی((رابط)) بیٚ لە نیٚوان ڕستەكەو ناوەكەی پیٚش ڕستەكە، جا لە ڕستەی حالی ئەم پەیوەندیكارە:یان جیٚناوە وەكو:(( جاء زيدٌ يَدَهُ على رأسه))[1]،وە یان حەرفی واوە-كەپیٚی دەوتریٚ واوی حالی،و واوی سەرەتا((الابتدا))،نیشانەكەی ئەوەیە كە ڕاست ودروستە دانانی((إذ))لە جیٚگەی-،وەكو((جاء زيدٌ وعمرو قائمٌ))[2]،تقدیرەكەی: إذ عمرو قائمٌ. وە یان جیٚناو و واو پیٚكەوە ،وەكو((جَاءَ زَيْدٌ وَهُوَ نَاوٍ رِحْلَةً))[3].

* * *

*باسی مەرجەكانی جملەی حالی:

٣٥٢- وَذَاتُ بَدْءٍ بِمُضَارِعٍ ثَبَتْ    حَوَتْ ضَمِيراً وَمِنَ الْوَاوِ خَلَتْ

٣٥٣-وَذَاتُ وَاوٍ بَعْدَهَا انْوِ مُبْتَدَا    لَهُ الْمُضَارِعَ اجْعَلَنَّ مُسْنَدَا[4]

---

[1] لەم ڕستەیەدا ڕستەی((يَدَهُ على رأسه))حالە ورابطەكەی بریتیە لە جیٚناوی لكاو بە((يَدَهُ))، كە دەگەڕیٚتەوە بۆ((زيدٌ))كە خاوەن حالە.

[2] لەم ڕستەیەدا ڕستەی((وعمرو قائمٌ))لە محلی نصبی حالە ودەبیٚتە جملەی حالی،و رابطەكەی بریتیە لە واوی سەرەتای ڕستەكە.

[3] لەم ڕستەیەدا ڕستەی((وهو ناوٍ رحلةً))لە محلی نصبی حالە ودەبیٚتە جملەی حالی،و رابطەكەی بریتیە لە جیٚناوی((هو))و واوی سەرەتای ڕستەكە.

[4] پوختەی مانای ئەم دوو دیٚڕەی ئەلفیە:٣٥٢/ ئەگەر جملەی حالی بە فعلی مضارع دەستی پیٚكردبوو ئەوە تەنها جیٚناو لە خۆ دەگریٚ ،وخالیە لە واو-واتا:واوی حالی-. ٣٥٣/ خۆ ئەگەر فعلیٚكی مضارع هات لە دوای واوی حالی ئەوە ئەو فعلە مضارعە بكە بەخبر بۆ مبتدایەكی محذوف ونادیار.

ئـەو ڕسـتـەیەی دەبێتـە حـال:ئەگـەر سـەرەتاکەی فعلـی مـضارعـی جێگیر((مثبت))بێ ئەوە دروست نیە واوی حالی لەگەڵ بێ،بەڵکو تەنها بە هۆی جێناوەوە ربط دەکرێ، وەکو:(( جاء زیدٌ یضحك ،وجاء عمرو تُقَادُ الجَنَائِبُ بین یدیه[1]))،وە دروست نیە واو بچێتە سەری،کەوابوو نالێی((جاء زیدٌ و یضحك))، جا ئەگەر هات لە زمانی عەرەبیدا شتێك کە بەئاشکرا وادیار بوو واوی حالی چۆتە سەر فعلی مضارع ،ئەوە لێکدەدرێتەوە بەوەی کە لەدوای واوەکەوە مبتدایەکی نادیار هەیە،وفعلە مضارعەکەش دەبێتە خبری ئەو مبتدایە،وەکو وتەیان:((قمتُ وأَصُكُّ عینَه))،وە وەکو وتەی:

ش١٩٢/فَلَمَّا خَشِيتُ أَظَافِيرَهُمْ نَجَوْتُ وَأَرْهَنُهُمْ مَالِكاً.[2]

هەریەك لە ڕستەی((وأَصُكُّ ،و أَرْهَنُهُمْ))دەبنە خبر بۆ مبتدایەکی حذفکراو ،وتقدیرەکەی: وأنا أَصُكُّ ،وانا أَرْهَنُهُمْ.

* * *

٣٥٤- وَجُمْلَةُ الْحَالِ سِوَى مَا قُدِّمَا بِـوَاوٍ أَوْ بِمُضْمَرٍ أَوْ بِـهِمَا[3].

جملەی حالی:یان اسمیە ،یان فعلیە ،فعلیش یان مضارعە،یان ماضیە،وە هەریەك لە جملەی اسمی وجملەی فعلی:یان جێگیر((مثبت))ە ،یان

---

[1] واتای ئەم ڕستەیە:عەمر هات لە کاتێکدا ئەسپە تایبەتەکان لە بەردەستیەوە دەڕۆیشتن.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: کاتێ ترسام لە چەکەکانیان ،خۆم دەربازکرد لە کاتێکدا من مالکم کردە بارمتەیان. بەڵگەکەی: ((وَأَرْهَنُهُمْ)) بەئاشکرا وا دیارە کە فعلی مضارعی جێگیر((مثبت)) بوبێتە جملەی حالی ،و واوی لەپێشەوە بێ،بەڵام وانیە بەڵکو فعلە مضارعەکە وفاعلەکەی ومفعولەکەی دەبێتە خبر بۆ مبتدایەکی نادیار.

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: جملەی حالی جگە لەوەی ڕابورد-کە بریتی بوو لە فعلی مضارعی جێگیر((مثبت))- ربط دەکرێتەوە بەهۆی واو بەتەنها یان بە تەنها جێناو یان بە هەردووکیان.

ناجێگیر((منفی))ە ،پێشتر ڕابورد کە ئەگەر سەرەتای جملەی حالی فعلی مضارعی جێگیر بوو ئەوە واوی حالی لە پێشیێوە نایات،بەڵکو تەنها بە جێناوە پەیوەندی دەبێ لەگەڵ ناوەکەی پێشی، دانەر لەم دێڕەدا باسی ئەوە دەکات کە جگە لەو[1] دروستە ربط بکرێتەوە بە تەنها بە واو،یان بەتەنها بە جێناو،یان بەهەردووکیان،کەواتا دەگرێتەوە ئەمە جملەی اسمی: جێگیر((مثبت))و ناجێگیر((منفی))،وە فعلی مضارعی نەفیکراو ،وە ماضی:جێگیر وناجێگیر.

کەوابوو دەڵێی:(( جاء زيدٌ وعمرٌو قائمٌ ، وجاء زيدٌ يده على رأسه ، وجاء زيدٌ ويدُهُ على رأسِه))،هەروەها ڕستەی نەفیکراویش،دەڵێی:(( جاء زيد لم يضحكْ ،أو ولَمْ يضحك، أو ولم يقُمْ عمرٌو، وجاء زيدٌ وقد قام عمرٌو، وجاء زيد قَدْ قامَ أبوه، وجاء زيد وقد قام أبوه))،هەروەها نەفیکراویش[2] وەکو:(( جاء زيدٌ وما قامَ عمرٌو، وجاء زيدٌ ما قامَ أبوهُ، أَوْ وَما قام أبوه)).

هەروەها ئەمە لە خۆ دەگرێ مضارعی نەفیکراوبە حەرفی((لا))،کەوابوو لەسەر ئەم بۆچوونە دەڵێی:(( جاء زيد ولا يضربُ عمراً)) بە واو.

جا دانەر لە جگە لەم کتێبەدا[3]،باسی ئەوەی کردووە کە مضارعی نەفیکراوبە حەرفی((لا))، دروست نیە واوی حالی بچێتە سەر وەکو مضارعی جێگیر،وە ئەوەی هاتبێ لەم شێوەیە ئەوە لێکدەدرێتەوە_تأويل دەکرێ_ بەوەی کە مبتدایەکی حذفکراو لە دوای واوەکەوە هەیە،وەکو خوێندنەوەی ابن ذکوان[4] بۆ ئایەتی﴿فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِ﴾[5]بە

---

[1] واتا:جگە لە مضارعی جێگیر((مثبت)).

[2] ئەمەیان نەفیکراوی ماضیە.

[3] مەبەست کتێبی((التسهيل))ی ابن مالکە.

[4] ناوی :عبدالرحمن ی کوڕی احمده وناسراوە بە ابن ذکوان ،ویەکێکە لە گەورە قورئان خوێنانی شام ،ساڵی ٢٠٢ك کۆچی دوای کردووە،خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

[5] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٨٩)ی سورەتی(یونس)،پوختەی ماناکەی{جا بەردەوام وخۆڕاگروبن -لەسەر ئاینی خوا-،ومەکەونە شوێن ڕێگای..} .إعرابەکەی:

سووك((تخفيف))خويندنەوەى نونەكە[1]،وتقديرەكەى:وانتما لاتتبعانّ، كەوابوو((لاتتبعانّ)) دەبيتە خبر بۆ مبتدايەكى حذفكراو.

* * *

## *باسى حذف كردنى عاملى حال:

٣٥٥–وَالْحَالُ قَدْ يُحْذَفُ مَا فِيهَا عَمِلْ وَبَعْضُ مَا يُحْذَفُ ذِكْرُهُ حُظِلْ.[2]

حذف دەكرێ عاملى حال:بە دروستى((جوازاً))،وە يان بە پێويستى ((وجوباً)).نموونەى ئەوەى حذف كراوە بەدروستى ئەوەيە بوترێ:(( كيف جئتَ))؟ تۆش دەڵێى:(( راكباً))،وتقديرەكەى:(( جئتُ راكباً))، وە وەكو قسەت:(( بَلَى مُسْرِعاً))، لە وەڵامى ئەو كەسەى پێيت دەڵێ: ((لَمْ تَسِرْ))، وتقديرەكەى:((بلى سِرْتُ مسرعاً))،وە وەكو فەرموودەى خواى گەورە:﴿أَيَحْسَبُ الْإِنْسَانُ أَلَّنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ (٣) بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَنْ نُسَوِّيَ بَنَانَهُ﴾[3]، تقديرەكە_والله اعلم_:بلى نجمعها قادرين.

---

ف/حسب ما قبلها. استقيما/ فعل امر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة ، والألف/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. ولا/ ،:حرف عطف لا/ناهية حرف جزم تتبعانِ/فعل مضارع مجزوم بلا وعلامة جزمه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة ، والألف/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. والنون/حرف توكيد لامحل لها من الاعراب ،وكسرت النون لوقوعها بعد الف الاثنين. **الشاهد فيها**: ((ولاتتبعانِ)) حيث وقع الجملة الفعلية–فعلها مضارع منفي– مقترنة بالواو،فيؤول ذلك على إضمار مبتدأ ،والتقدير: وانتما لاتتبعان.

[1] لاى زۆربەى قورئان خوێنان نونى((وَلَا تَتَّبِعَانِّ))بە قورس((مُشدّد))ى خوێندراوەتەوە ،بەڵام ابن ذكوان بە سووك((مُخفف))ى خوێندووێتيەوە.

[2] پوختەى ماناى ئەم ديڕەى ئەلفيە: هەندێ جار حذف دەكرێ عاملى حال،وەهەندێ لەوانەى حذف دەكرێن دروست نيە باس كرێن،واتا:هەندێ جار عاملى حال جائزە حذف كرێ ،وهەندێ جاريش واجبە.

[3] ئايەتى ژمارە(٣و٤)ى سورەتى(القيامة)،پوختەى ماناكەى{ئايە مرۆڤ وادەزانێ كە ئێسقانە (ڕزيوەكانى) كۆناكەينەوە، بەڵێ بە توانايين لەسەر ڕێك خستنەوەى نەقشى

وەنموونەی حذف کردنی عاملی حال بە واجبی ووتە:(( زيدٌ أخوك عطوفاً))،وە هاو شێوەکەی لەو حالانەی ناوەرۆکی ڕستەکە بە هێزدەکەن،ئەمەش پێشتر ڕابورد، هەروەها وەکو ئەو حالەی لە جێی خبر دادەنیشێ،وەکو((ضَرْبي زيداً قائماً))تقديرەکەی:إذا كان قائماً، وەپێشتر ئەم باسە کرا لە بابەتی مبتداوخبر[1].

هەروەها لەو شوێنانەی عاملی حالی تێدا حذف دەکرێ بە واجبی ووتەیان:((اشتريته بدرهمٍ فَصَاعِداً ، و تصدَّقت بدينارٍ فَسَافِلاً)) لێرەدا هەریەك لە ((فصاعِداً ، وسَافِلا))حالن ،وعاملەکەیان حذفکراوە بە واجبی،وتقديرەکەی: ((فَذَهَبَ الثَّمنُ صاعداً ، وذَهَبَ المتَصَدَّقُ به سافلاً))،ئەمە بوو مانای ووتەی:(( وَبَعْضُ مَا يُحْذَفُ ذِكْرُهُ حُظِلْ))واتا هەندێ لەو عاملی حالانەی حذف کراوە ڕێگە نەدراوە باسکرێ.

❁ تێبینی/لێرەدا بابەتی حال کۆتایی پێ هات .

---

سەرپەنجەکانی .}.إعرابەکەی: أ/حرف استفهام إنكاري يفيد التوبيخ. يحسب/فعل مضارع مرفوع الانسان/فاعل مرفوع .أن/مخفف من المثقل ،واسمه ضمير الشأن المحذوف والتقدير((أنه)). لن/حرف نصب ونفي ومستقبل. نجمع/ فعل مضارع منصوب بـ(لن)،وفاعله ضمير مستتر فيه وجوباً تقديره(نحن). عظامه/ مفعول به منصوب ،وهو مضاف ،والهاء/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. وجملة(لن نجمع عظامه)في محل رفع خبر(أن)المخففة. وأن واسمها وخبرها سدت مسدّ مفعولي يحسب. بلى /حرف جواب .قادرين/ حال من فاعل الفعل المقدر(نجمعها)،منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه جمع مذكر السالم. على/حرف جر .أن/حرف نصب ومصدر ومستقبل.نسوي/ فعل مضارع منصوب بـ(أن)،وفاعله ضمير مستتر فيه وجوباً تقديره(نحن). بنانه/ مفعول به منصوب ،وهو مضاف ،والهاء/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. والمصدر المؤول من أن وما بعدها-تقديره تسوية- في محل جر اسم مجرور لـ(على)،والجار والمجرور متعلقان بـ(قادرين). **الشاهد فيه:** ((قادرين)) حيث حذف عامل الحال جوازاً،والتقدير: بلى نجمعها قادرين. وتعليل ذلك الاستفهام الانكاري الوارد في الآية،فالحال وقعت هنا جوابا لهذا الاستفهام .

[1] پێشتر لە شەرحی دێڕی(١٤١)ـی ئەلفیە باسکرا.

## التمييز[١]

٣٥٦–اسْمٌ بِمَعْنَى مِنْ مُبِينٌ نَكِرَهْ    يُنْصَبُ تَمْيِيزاً بِمَا قَدْ فَسَّرَهْ

٣٥٧–كَشِبْرٍ أَرْضاً وَقَفِيزٍ بُرًّا    وَمَنَوَيْنِ عَسَلاً وَتَمْرَا [٢].

**پێشتر ڕابورد لەو ناوانەی کە کۆلەکە نین لەڕستەدا:مفعول بە ،ومفعولی مطلق ،ومفعول لە ،و مفعول فیە ،ومفعول معە ،ومستثنی ،وحال ، ئەوەی ماوەتەوە بریتیە لە تمییز–کە لەم بەشەدا باس دەکرێ–و بە ڕاڤەکار،وڕاڤەکردن ،وڕوونکەرەوە،وڕوونکردنەوە،وجیاکەرەوە ناودەبرێ.**

**ئەویش بریتیە لە:هەموو ناوێکی نەناسراو،لەخۆبگرێ مانای حەرفی((من))[٣]، بۆ ڕوونکردنەوەی ناڕوونیەکی پێش خۆی،وەکو:**((طابَ زيدٌ نفساً [٤]، وعندي شِبْرٌ أَرْضاً[٥])).

---

[١] **کۆتا بابەتە لە ناوە منصوبەکان ، ووشەی ((التمییز))لە زمانی عەرەبیدا واتا:جیاکردنەوە ،و لە ڕێزمانی عەرەبیدا وەکو–هەر یەك لە ابن مالك وابن عقیل– پێناسەیان کردووە،بریتیە لەو ناوەی کە دێ بۆ ڕوون کردنەوەی پێش خۆی،یان لادانی ناڕوونی پێش خۆی. لە ڕێزمانی کوردیدا جۆرێکە لەناوی دەست نیشان کراو بە ئاوەڵناو. جا ئێمە لە کاتی شەرح کردندا ووشە تمییز بەکاردێنین.**

[٢] **پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٥٦/ تمییز برێتیە لە ناوێکی نەناسراو کە مانای حەرفی((من)) لە خۆدەگرێ ،وڕوونکردنەوە بۆ پێش خۆی دەکات ،ومنصوبە بەو شتەی کە ڕوونی کردۆتەوە.٣٥٧/ وەکو نموونەی((لە شبرٌ ارضاً))واتا:ئەو هەیەتی بستێك زەوی، و((قفیزٌ بُرّاً)) وە هەیەتی قسناغێ گەنم ،و((منوین عسلاً وتمراً)) وە دوو ڕتڵ هەنگوین وخورما.**

[٣] **حەرفی جەڕی(من) چەند مانایەکی هەیە: لەوانە:(بیان الجنس) واتا:ڕوونکردنەوەی پێش خۆی،تمییزیش وایە.**

[٤] **واتا:چاك وپاکە زید دەروونی، لەم ڕستەیەدا: طاب:فعلی ماضیە و،زیدٌ:فاعلە ،و نفساً:تمییزە.**

[٥] **واتا:هەمە بستێك زەوی ، لەم ڕستەیدا: عندی: خبری مقدمە ، شبرٌ: مبتدای مؤخرە ، وأرضاً: تمییزە.**

جا خۆی پاراست دانەر بەووتەی[١] :((مُتَضمن معنى مِنْ)) لە حال ،چونكە حال لەخۆدەگرێ مانای حەرفی((في)). هەروەها ووتەی:((لبيانِ ما قبله)) خۆپاراستنە لەوەی مانای((من))لە خۆ دەگرێ،ورِوونكردنەوەی پێش خۆی ناكات: وەكو اسمی((لا))ـی نافيه للجنس،نموونەی((لا رجلَ قائمٌ)) تقديرەكەی: ((لا مِنْ رجلٍ قائمٌ)).

هەروەها ووتەی:((لبيان ما قبله مِن إجمال)) دەگرێتەوە هەردوو جۆرەكەی تمييز،كە بریتین لە:رِوونكردنەوەی ناڕوونی خود((ذات))،وە ناڕوونی پاڵدانی شتێك بۆ ناوێك((نسبة))[٢].

جا ئەوەی كە رِوونكردنەوی خودە بریتیە لەو تمییزەی دەكەوێتە پاش ئەو ناوانەی ئەندازەیان هەیە-ئەوانیش بریتین لە پێوەردارەكان ((ممسوحات))،وەكو((لە شِبْرٌ أرضاً))، وە پێوانەدارەكان ((مكيلات))،وەكو((لە قَفِيزٌ[٣] بُرًّا))،وە كێشانەدارەكان ((موزونات))،وەكو((لە مَنَوَانِ[٤] عَسَلاً وتَمْراً))- یان دەكەوێتە پاش ژمارەوە((الاعداد))،وەكو((عندي عِشرون دِرهماً)).

جا تمییز منصوبە بەو ناوەی رِوونی دەكاتەوە[٥]،كە بریتیە لە:شبرٌ ، وقفيزٌ ،ومنوان ،وعشرون.

وە ئەو تمییزەی كە دێ بۆ رِوونكردنەوەی پاڵدانی شتێك بۆ ناوێك بریتیە لەوەی كە دێ بۆ رِوونكردنەوەی ئەوەی كە پەیوەستی عاملەكەیە[٦]: كە

---

[١] لێرەوە ابن عقيل شەرحی پێناسەكەی تمییز دەكات.

[٢] لەزمانی عەرەبیدا تمییز بەشێوەیەكی گشتی دوو جۆرە: یەكەمیان:پێی دەوترێ((تمييز الذات ،یان تمييز المفرد))،دووەمیان پێی دەوترێ((تمييز النسبة ، یان تمييز الجملة))، جا ابن عقيل باسی هەردووكیان دەكات.

[٣] قفيز:پێوانەیەكی كۆنە وەكو قسناغی ئێستا.

[٤] منوان: كێشانەیەكی كۆنە ،وەكو هۆقەی كوردی ،لەجێی كیلۆی ئێستا.

[٥] واتا:عاملی تمییز بریتیە لەو ناوەی كە تمییزەكەی بۆ هاتووە.

[٦] واتا:ئەم جۆرە تمییزە بۆ رِوونكردنەوەی ناوێكی تایبەت نیە ،بەڵكو بۆ رِوونكردنەوەی رِێژەیەكە لە رِستەكەدا،واتا:بۆ رِوونكردنەوەی مانای گشتیە نەوەك مانای تایبەت.

**بریتیـە لـە فاعل، یـان مفعـول ، وەکـو:**((طابَ زیدٌ نفساً))[١]**،وە وەکـو:**﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا﴾[٢]**، وە وەکـو**((غرستُ الأرضَ شجراً))**، وەکـو**﴿وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا﴾[٣]**.**
**کەوابوو((نفساً))تمییزە ولە فاعلەوە نەقڵکراوە،وئەصڵی ڕستەکە**((طابَ نفسُ زیدٍ))**،وە((شجراً))تمییزە ولە مفعولەوە وەرگیراوە،وئەصڵەکەی**((غرستُ شجرَ الأرضِ))**، ((نفساً)) ڕوونـی کردۆتـەوە ئـەو فاعلـەی کـە پەیوەسـتی فعلەکەیـە ،وە((شجراً))ڕوونی کردۆتەوە ئەو مفعولەیەی کە پەیوەستی فعلەکەیە.**
**ئەوەی ئەم جۆرە تمییزەی منصوب کردووە عاملەکەی پێشێتی**[٤]**.**

* * *

**٣٥٨**-وَبَعْدَ ذِي وَشِبْهِهَا اجْـرُرْه إِذَا أَضَفْتَهَا كَ ((مُدُّ حِنْطَةٍ غِـذَا))

---

[١] **لەم ڕستەیەدا((نفساً))تمییزە و بۆ ڕوونکردنەوەی ناوی((زید))نەهاتووە ،بەڵکو مەبەست پێی پاڵدانی چاکی وپاکیە بۆ زید.**

[٢] **ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٤)ـی سورەتی(مریم)،پوختەی ماناکەی:{-پێغەمبەر زەکریا_علیە السلام_پاڕایەوە لە خوای گەورەو لێی کڕوزایەوە و ووتی- لەبەر پیری مووی سەرم بریقە دەداتەوە...}. إعرابەکەی : و/حسب ما قبلە . اشتعل/فعل ماض مبني علی الفتح .الراسُ/فاعل مرفوع .شیباً/تمییز منصوب. الشاهد فیها: شیباً: حیث جاء التمییز مُبیناً إجمال النسبة، لبیان ما تعلق بە الفاعل ، والتقدیر((اشتعل شیبُ الراسِ)).**

[٣] **ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٢)ـی سورەتی(القمر)،پوختەی ماناکەی:{وە کانیاوی زۆرمان لە زەویدا هەڵقوڵاند}.إعرابەکەی: و/حسب ما قبلە .فجّرْنا/فعل وفاعل ،الأرضَ/ مفعول بە منصوب ، عیوناً/ تمییز منصوب الشاهد فیها: عُیُوناً: حیث جاء التمییز مبیناً إجمال النسبة، لبیان ما تعلق بە المفعول، والتقدیر:((وفجّرنا عیون الأرض)).**

[٤] **زانایانی نحو ڕایان جیایە دەربارەی ئەوەی ئەم جۆرە تمییزەی منصوب کردووە،بۆیە ابن عقیل وا دەفەرمووێ.**

٣٥٩-وَالنَّصْبُ بَعْدَ مَا أُضِيفَ وَجَبَا إِنْ كَانَ مِثْلَ(مِلْءُ الأَرْضِ ذَهَبَا).[(١)]

**ئامـاژەی کـرد دانـەر بـە((ذِی)) بـۆ ئـەوەی ڕابـوردی لـە دێـڕی پێـشوو لـە ئەنـدازەدارەکان-کـە بـریتین لـە: پێوەردارەکـان، یـان پێوانـەدارەکان ،یـان کێـشانە دارەکـان-جـا دروسـتە مجرورکردنـی تمییـز دوای ئەمانـە ئەگـەر إضـافـەکرێن بـۆلای تمییزەکـە وإضـافـە نـەکرێن بـۆ لای جگـە لەتمییزەکـە ،وەکو:**((عندي شبرُ أرضٍ ، وقفيزُ بُرٍّ، ومَنوا عسلٍ وتمرٍ))[(٢)].

**بەڵام ئەگەر إضافەکران ئەوانەی ئەندازەدارن بۆ لای جگە لە تمییزەکە ئەوە پێویستە تمییزەکە منصوب کرێت ،وەکو**((ما في السَّماءِ قَدْرُ راحةٍ سَحَاباً))[(٣)]، **وە وەکو فەرمودەی خوای گەورە:**﴿فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِمْ مِلْءُ الْأَرْضِ ذَهَبًا﴾[(٤)].

**وە حوکمی تمییزی عددیش لەمەو دوا دێ لە بابی عددا**

---

[(١)] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٥٨/ لە پاش ئەو ناوانەی بۆ ئەندازەن وهاوشێوەکانیان تمییزەکە مجرور بکە ئەگەر ناوەکە إضافەکرا بۆ لای تمییزەکە.٣٥٩/ وە پێویستە تمییزەکە منصوب کەیت ئەگەر وەکو هاوشێوەی ئەم ڕستەیە بوو((مِلْءُ الأَرْضِ ذَهَبَا))-واتا ئەگەر ناوە ئەندازە دارەکە إضافەکرابوو بۆ لای جگە لە تمییزە کە.

[(٢)] لەم سێ ڕستەیەدا هەریەك لە((أرضٍ ،و بُرٍّ،و عسلٍ))تمییزن ومجرورن ، چونکە لەپاش ئەندازەدارەکانەوە هاتوون.

[(٣)] ئەمە قسەیەکی سادەیەو واتاکەی:نیە لەئاسمان ئەندازەی ناو لەپێ هەور.

[(٤)] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٩١)ی سورەتی(ال عمران)،پوختەی ماناکەی:{-بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕبوون وبەبێ باوەڕی مردن -ئەوە هەرگیز بری((فدیە))لە هیچ کامێکیان وەرناگیرێ ،با پڕ بە هەموو زەویش زێڕ بێت.}إعرابەکەی: فلن/فـ:حسب ماقبلها. لن:حرف نفي ونصب واستقبال. يقبل/ فعل مضارع مبني للمجهول منصوب بـ(لن)وعلامة نصبه الفتحة. من أحد/جارومجرور متعلقان بـ(يقبل)، واحد مضاف ،هم/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه.ملْ/نائب فاعل مرفوع ،وهو مضاف ،الأرض/مضاف إليه مجرور. ذهبا/تمييز منصوب **الشاهد فيها:** (ذهباً)تمييز جاء منصوباً،وذلك لأنّ (ملءُ)الدال على مقدار من الأرض اضيف إلى غير التمييز،فوجب نصب التمييز.

٣٦٠- وَالْفَاعِلَ الْمَعْنَى انْصِبَنْ بِأَفْعَلاَ مُفَضِّلاً كَ((أَنتَ أَعْلَى مَنْزِلاً))[1].

ئەو تمییزەی دەکەوێتە پاش افعلی تفضیل:ئەگەر لە ماناداا فاعل بوو[2] ئەوە پێویستە منصوب بێ،بەلأم ئەگەر لە مانادا فاعل نەبوو ئەوە پێویستە مجرور بێ بەوەی مضاف إلیه بێ.

نیشانەی ئەوەی لەمانادا فاعلە: ئەوەیە بگونجێ تمییزەکە ببێتە فاعل دوای کردنی افعلی تفضیل بە فعل،وەکو((أنت أَعْلَى مَنْزِلاً، وأكثرُ مالاً))لێرەدا هەریەك لە((منزلاً ،ومالاً))تمییزن وپێویستە منصوب بن،لەبەر ئەوەی دەگونجێ ببنە فاعل دوای کردنی افعلی تفضیل بە فعل، کەوابو دەڵێی:((أنت عَلاَ منزلُك ، وَكَثُرَ مَالُكَ)).

وەنموونەی ئەوەی لەمانادا فاعل نیە((زيدٌ أفضلُ رجلٍ ، وهندٌ أَفْضَلُ امرأةٍ))[3]،پێویستە مجرور بن بەوەی مضاف إلیه ،مەگەر افعلی تفضیلە کە إضافەکرابێ بۆلای جگە لە تمییزەکە،لەم کاتەدا منصوب دەبێ وەکو((أنت أفضلُ النَّاسِ رَجُلاً)).

* * *

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەو تمییزەی دەکەوێتە پاش افعلی تفضیل منصوبی بکە ئەگەر لەمانادا فاعل بوو،وەکو نموونەی:((أَنتَ أَعْلَى مَنْزِلاً))واتا:تۆ پلەت بەرزترە.

[2] واتا:تمییزەکە لە مانادا فاعل بوو.

[3] لەم دوو ڕستەیەدا هەریەك لە((رجلٍ ،وامرأةٍ))تمییزن ومجرورن ودروست نیە منصوب بن چونکە لە مانادا فاعل نین.

***باسی ئەوەی لەدوای (فعلی تعجب)ـەوە تمییز دێ:**

٣٦١- وَبَعْدَ كُلِّ مَا اقْتَضَى تَعَجُّبَا    مَيِّزْ كَ((أَكْـرِمْ بِأَبِي بَكْرٍ أَبَا))[1].

**تمییز دێ لەپاش هەموو ئەوانەی بۆ (تعجب)ـن،وەکو**((ما أَحْسَنَ زيداً رجلاً ، وأَكْرِمْ بأبي بكرٍ أباً ، وللهِ دَرُّكَ عالماً ، وحَسْبُكَ بزيدٍ رَجُلاً ، وكفى به عالماً))[2]

**ش١٩٣/** يَا جَارَتَا مَا أَنْتِ جَارَهْ[3].

* * *

***مجرور کردنی تمییز بەحەرفی(مِنْ):**

٣٦٢- وَاجْرُرْ بِمِنْ إِنْ شِئْتَ غَيْرَ ذِي الْعَدَدْ    وَالفَاعِلِ الْمَعْنَى كَ(طِبْ نَفْساً تُفَدْ)[4].

**دروستە مجرورکردنی تمییز بە حەرفی(من)ئەگەر تمییزەکە لەماناداا فاعل نەبێ، هەروەها جیاکراوە((ممیِّز)) کەش عدد نەبێ ،کەوابوو دەڵێی:**(( عندي شبْرٌ من أرضٍ ، وقَفِيزٌ من بُرّ ، ومَنَوانِ من عَسَلٍ وتَمْرٍ ، وغرستُ الأرضَ من شجرٍ))، **وە ناڵێی**((طابَ زيدٌ من نفسٍ))**وە ناڵێی**((عندي عشرون من دِرهمٍ)).

* * *

---

[1] **پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: تمییز دێ لە پاش هەموو شتێك مانای تعجب لەخۆگرێ ،وەکو((أَكْرِمْ بِأَبِي بَكْرٍ أَبَا))واتا:چەند بەرێزە ئەبو بەکر لەڕووی باوکایەتیەوە.**

[2] **لەم پێنج ڕستەیەدا هەریەك لە{رجُلاً ،واباً ،وعالماً ،ورجلاً ،وعالماً}}تمییزن ،چونکە لە پاش تعجبەوە هاتوون.**

[3] **ماناو بەڵگەی ئەم نیوە دێڕە: هۆ هاوسێکەمان تۆ چون هاوسێیە بووی. بەڵگەکەی: ((جارە))تمییزە ولە پاش تعجبەوە هاتووە کە بریتیە لە((ما انت)) تعجبی سماعیە.**

[4] **پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دروستە مجرورکردنی تمییز بە حەرفی(من)،بەمەرجێ تمییزی عدد نەبێ ،ولەماناداا فاعل نەبێ،ئەوەی لەماناداا فاعلە وەکو((طِبْ نَفْساً)) ئەصلی ئەم ڕستەیە((طاب نفسُ زيدٍ))،کەواتا نفساً لە ماناداا فاعلە ،وا بکە ئەوە سوود دەگەێنی واتا پێکاوتە.**

***حوكمى پێشكەوتنى تمييز بەسەر عاملەكەى:**

٣٦٣–وَعَامِلَ التَّمْيِيزِ قَدِّمْ مُطْلَقَا    وَالفِعْلُ ذُو التَّصْرِيفِ نَزْراً سُبِقَا[١]

**بۆچوونى پێشەوا سيبويه–رەحمەتى خواى لێ بێ–وايە كەدروست نيە پێشكەوتنى تمييز بەسەر عاملەكەى ،چوون يەكە ئەو عاملە متصرف بێ ،يان متصرف نەبێ، كەوابوو نالێى**:(( نفساً طابَ زيدٌ))[٢] **،وە نالێى**(( عندي درهماً عشرون))[٣].

**وە هەريەك لە پێشەوا كسائى ،ومازنى ،ومبرد ،بەدروستى دەزانن پێشكەوتنى تمييز بەسەر عاملەكەى ئەگەر متصرف بێ،كەوابوو دەلێى**:(( نفساً طابَ زيدٌ ،وشَيْباً اشْتَعَلَ رأسي))**، وە وەكو ووتەى:**

**ش١٩٤/** أَتَهْجُرُ لَيْلَى بِالْفِرَاقِ حَبِيبَهَا؟    وَمَا كَانَ نَفْساً بِالْفِرَاقِ تَطِيبُ.[٤]

**هەروەها وەكو ووتەى:**

**ش١٩٥/** ضَيَّعْتُ حَزْمِي فِي إِبْعَادِي الأَمَلاَ    وَمَا ارْعَوَيْتُ وَشَيْباً رَأْسِي اشْتَعَلاَ.[٥]

---

[١] **پوختەى ماناى ئەم ديڕەى ئەلفيە: عاملى تمييز بەرەهايى پێشى دەكەوێ ،واتا:تمييز دروست نيە پێش عاملەكەى بكەوێ، بەلام ئەگەر عاملەكە فعلى متصرف بێ ئەوە دەكرێ بە كەمى تمييزەكەى پێش كەوێ.**

[٢] **لەم ڕستەيەدا(نفساً)تمييزە وعاملەكەى بريتيە لە فعلى(طاب) كە فعلێكى متصرفە.**

[٣] **لەم ڕستەيەشدا (درهماً) تمييزە وعاملەكەى بريتيە لە (عشرون)كە عاملێكى متصرف نيە.**

[٤] **ماناو بەلگەى ئەم ديڕە: ناگونجێ خاتوو ليلى جيا بێتەوە لە خۆشەويستەكەى ولێى دوور كەوێتەوە ،لە كاتێكدا دەروونى ئەو بە جيابوونەوە خۆش نيە. بەلگەكەى:**(( نَفْساً بِالْفِرَاقِ تَطِيبُ))**لێرەدا ((نفساً))تمييزە وپێش عاملەكە كەوتووە كە بريتيە لە((تَطِيبُ))،ئەمەش لاى كوفيێكان ومازنى ومبرد دروستە**

[٥] **ماناو بەلگەى ئەم ديڕە: لەدەستم دا ڕێكخستنى كاروبارم بە دوور خستنەوەم هيواكانم ،ودەستم هەلنەگرت ، تا مووەكانى سەرم سپى بوو. بەلگەكەى:**(( وَشَيْباً

وە دانـەر هاوڕایانـە لـە جگـە لـەم کتێبـە[1]،بـەڵام لـەم کتێبەیـدا فەرموویـەتی کەمـە[2]. خـۆ ئەگـەر عاملەکـە متـصرف نەبوو،ئـەوە هـەموویان بەدروسـتی نـازانن تمییزەکـەی پـێش کـەوێ:چوون یەکـە ئـەو عاملـە فعل بـێ وەکـو((ما أحسنَ زیداً رجلاً))،یان فعل نەبێ وەکو((عندي عشرون درهماً)).

وە هەندێ جار دەکرێ عاملەکە متصرف بێ ،ودروست نـەبێ پێشکەوتی تمییز بەسەر عاملەکـەی لای هـەموو زانایـان ،ئـەویش وەکـو نموونـەی((کفی بزید رجلا))لێرەدا دروست نیە ((رجلاً))پێش فعلـی((کفـی))بکـەوێ هەرچـەندە فعلێکی متصرفە ،لەبەر ئەوەی ((کفی))بە مانای فعلی جامد دێ ،کە بریتیە لە فعلی تعجب ،کەوابوو ((کفی بزید رجلا)) بە مانای ((ما أکْفَاه رجلا)) هاتووە.

* * *

<u>تێبینی/</u> کۆتـایی بـە بابـەتی((التمییـز))هـات ،کـە کۆتـا بابـەت بـوو لـە نـاوە منصوبەکان((المنـصوبات))،و بـەڕێز بەنـدی شـەرحی ابـن عقیـل دەکاتـە کۆتـایی بەشی دووەمی کتێبەکە. لە خوای بەرزو بێ هاوتـا داواکـارم یارمـەتیمان بـدات بـۆ تەواوکردنی ،وبۆمان بکات بە توێشووی ڕۆژی هەمیشەیمان .

---

رَأسِی اشْتَعَل))لێرەدا ((شیباً))تمییزە وپێش عاملەکە کەوتووە کە بریتیە لە((اشتعل))، ئەمەش بەبۆچوونی کوفیکان ومازنی ومبرد دروستە .

[1] واتا:ابن مالك لە کتێبی( التسهیل)دا پێی وایە دروستە تمییز پێش عاملی متصرف بکەوێ .

[2] ئاماژەیە بۆ نیوەی کۆتای دێڕی(٣٦٣)ی ئەلفیە: وَالفِعْلُ ذُو التَّصْرِیفِ نَزْراً سُبِقَا.

## حەرفە جەڕەکان[١]

٣٦٤-هَاكَ حُرُوفَ الجَــرِّ وَهْيَ: مِنْ، إِلَى حَتَّى، خَلاَ ،حَاشَا، عَدَا، فِي،عَنْ،عَلَى
٣٦٥-مُذْ، مُنْذُ، رُبَّ ،اللاَّمُ ،كَيْ، وَاوٌ وَتَا وَالكَـافُ، وَالبَـــاءُ ،وَلَعَــلَّ، وَمَتَى[٢].

ئەم بیست حەرفە هەموویان تایبەتن بە اسمەوە[٣]،و مجروری دەکەن،پێشتر باسی هەر یەك لە((خلا،وحاشا،وعدا))مان لە بابەتی((الاستثناء))دا کرد[٤]،کەمن ئەوانەی باسی حەرفی((کي ،ولعلّ،ومتی))یان لە حەرفە جەڕەکان کردووە. ((کي))لە دوو شوێندا دەبێتە حەرفی جەڕ:

یەکەمیان:ئەگەر بچێتە سەر((ما))ی استفهامی،وەکو:

(( کَيْمَهْ ؟))واتا: لِمَهْ؟،واتا:بۆچی؟

---

[١] پاش ئەوەی لە باسەکانی پێشوودا باسی ناوە مرفوع ،وناوە منصوبەکان وجۆرەکانیمان کرد، لەم بەشەدا دانەر باسی ئەو ناوانە دەکات کە پێیان دەوترێ(مجرورات)،ولە سەرەتای کتێبەکەدا ڕابورد کە ناوە مجرورەکان لە زمانی عەرەبیدا سێ جۆرن:١-اسمی مجرور. ٢-مضاف إليه. ٣-مجرور بە شوێنکەوتن(التبعية). جا لێرەوە دانەر باسی ئەم سێ جۆرە دەکات بە تفصیل.

ووشەی جەڕ(الجر) واتا:ڕاکێشان وبەستنەوە،وە بۆیە بەم حەرفانە ووتراوە جەڕ لەبەر ئەوەی مانای فعل ڕادەکێشن بۆ لای ناو ومانای فعلەکە دەبەستنەوە بە ناوەکەوە،بۆ نموونە کە دەڵێین:((کتبتُ بالقلم))لێرەدا حەرف (ب)مانای نوسینەکەی-کە فعلەکەیە- بەستۆتەوە بە پێنووسەکەوە-کە ناوەکەیە-.هەروەها هەموو حەرفە جەڕێکی تریش.

[٢] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٦٤-بگرە حەرفە جەڕکان- ژمارەیان(٢٠)حەرفە-کە ئەمانەن:{مِنْ، إِلَى،حَتَّى، خَلاَ ،حَاشَا، عَدَا، فِي،عَنْ،عَلَى،٣٦٥- مُذْ، مُنْذُ، رُبَّ ،اللاَّمُ ،كَيْ، وَاوٌ وَتَا وَالكَـافُ، وَالبَـــاءُ ،وَلَعَــلَّ، وَمَتَى}.دواتر مانا وواتای ئەم پیتانە باس دەکات.

[٣] پێشتر لە دێڕی(١٢)ی ئەلفیەدا باسی ئەوەمان کرد کە حەرف لە ڕێزمانی عەرەبیدا دوو جۆرە:١-تایبەت(مختص). ٢-نا تایبەت(غير مختص).،وە ووتمان مەبەست لە تایبەت ئەو حەرفانەن یان دەچنە سەر اسم،وە یان دەچنە سەر فعل. جا حەرفە جەڕەکان تایبەتن بە اسمەوە.

[٤]بڕوانە شەرح ووڕاڤەی دێڕی(٣٢٩)و(٣٣٠)ی ئەلفیە.

لێرەدا((ما))استفهامیە ولە محلدا مجرورە بە((کَي))، ئەلیفەکەی کۆتای حذفکراوە لەبەر ئەوەی حەرفی جەڕ چۆتە سەری،ودواتر((ها))ی لەسەر وەستان((سكت))ی[1] بۆ هێنراوە.

دووەم:نموونەی ووتەت:(( جئتُ کي أکرمَ زيداً))،لێرەدا(أُکرمَ) فعلی مضارعی منصوبە بە(ان)[2]،لە دوای (کي)،وە (ان)وفعلە دەبنە مصدر- واتا ناوێك- ومجرور دەبێ بە حەرفی جەڕی(کی)،وتقدیرەکەی دەبێتە:(( جئتُ کي إکرامِ زيدٍ)) ،واتا:لإکرامِ زيد[3].

وە حەرفی(لعلّ) لەسەر لوغەو شێوازی خوێندنەوەی (عُقيل)[4]دەبێتە حەرفی جەڕ،ووەکو ووتەی:

١٩٦- لَعَلَّ أَبِي المِغْوَارِ مِنْكَ قَرِيبُ[5].

وە ووتەی:

---

[1] لە زمانی عەرەبیدا هەر کاتێ بوەستێ لەسەر ووشەیەك کۆتاییەکەی حەرەکەیەك بێت وپێویست بێ ئەو حەرەکەیە بوترێ وساکن نەکرێ،حەرفی (ها) دەلکێنین بە کۆتای ووشەکەوە بۆ ئەوەی حەرەکەی کۆتایی ووشەکە بخوێنرێتەوە،و بەم حەرفی(ها)یە دەوترێ ((هاء السکت)).

[2] واتا:(ان)ی مقدرە،دواتر لە باسی فعلی مضارع بە تفصیل ئەم بابەتە باس دەکەین إنشاء الله، وە بەم ((ان))ە دەوترێ مصدریە لەبەر ئەوەی لە گەڵ فعلە مضارەکەی پاشی دەکرێنە مصدرێك ودەبنە ناوێك بۆ پێش خۆیان،وپێی دەوتری(مصدر مؤول).

[3] مەبەستی ئەوەیە کە حەرفی (کی)مانای حەرفی(لام)دەگەیەنێ ،کە بریتیە لە هۆ(تعلیل).

[4] پێشتر باسی ئەوەمان کرد لە ناو عەرەبدا چەند بنەماڵەو هۆز هەن کە لەهجەو شێوازی خوێندنەوەی تایبەت بە خۆیان هەیە،یەکێك لەوانە بریتیە لە عُقيل.

[5] ماناو بەڵگەی ئەم نیو دێرە شعرە:ئومێدە ئەو پیاوە بەرێزە کە نازناوەکەی(ابی المغوار) لێتەوە نزیك بێ. بەڵگەکەی:(لعلّ ابی المغوار)لێرەدا لعلّ حەرفی جەرە وناوەکەی پاش خۆی مجرور کردووە،لەسەر لەهجەی عقیل.

١٩٧- لَعَلَّ اللهِ فَضَّلَكُم علينا بِشَيءٍ أنَّ أُمَّكُمُ شَرِيمُ[(١)]

جا هەر یەك لە((أبی المغوار))وناوی پیرۆزی خوای گەورە((لعلّ الله)):دەبنە مبتدا و((قريبٌ))و((فَضَّلَكُم))دەبنە خبریان،و لەم حاڵەتەدا ((لعلّ))دەبێتە حەرفی جەڕی زیادکراوە وچۆتە سەر مبتداکە[(٢)]،وەکو حەرفی(بـ)ـی زیادکراو لە((بِحَسبِكَ درهمٌ))[(٣)]

هەروەها لەسەر بۆچوونی عُقیل حەرفی لامی کۆتای(لعلّ)بە مفتوحی وبە مکسوری خوێندراوەتەوە،هەروەها لێیان گێڕدراوەتەوە حذف کردنی لامی یەکەمی ودەڵێی:(علّ)بە فتحە وکسرەی لامەکەی کۆتای.

هەروەها حەرفی((متى))ناوەکەی پاش خۆی مجرور دەکات لەسەر لوغەوبۆچوونی هُذیل[(٤)]،یەکێك لە ووتەکانیان:((أخْرَجَهَا مَتَى كُمِّهِ))[(٥)]،مەبەستیان((من كُمّه))،وە وەکو ووتەی:

---

[(١)] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:هیوام وایە خوای گەورە پلە وپایەی ئێوەی دابێ بەسەرماندا،بە شتێك کە دایکتان پێش وپاشی یەکە-مەبەستی گاڵتە پێکردنە-. بەڵگەکەی:( لَعَلَّ اللهِ) لعلّ حەرفی جەڕە وناوەکەی پاش خۆی مجرور کردووە،لەسەر ڕای عُقیل.

[(٢)] پێشتر باسمان کرد کە حەرفی جەڕ سێ جۆرە:١-حەرفی جەڕی ئەصڵی کە هەم مانای هەیە و هەم(تعلق)دەبەستێ،ئەمەش زۆربەی حەرفەکان دەگرێتەوە. ٢-حەرفی جەڕی زائد کە نەمانای هەیە ونە(تعلق)دەبەستێ. ٣-هاوشێوەی زیادکراو(شبیه بالزائد)کە مانای هەیە بەڵام(تعلق)نابەستێ. جا حەرفی(لعلّ) لە جۆری سێیەمە، هەرچەندە ابن عقیل لە شەرحەکەدا لە جۆری دووەمی داناوە،بەڵام ڕاستر ئەوەیە لە جۆری سێیەمە.

[(٣)] حەرفی جەڕ لە ڕستەی:(بِحَسبِكَ درهمٌ)زیادکراوە.

[(٤)] یەکێکن لە بنەماڵە وهۆزە ناودارەکانی عەرەب کە لەهجەو شێوازی تایبەت بە خۆیان هەیە.

[(٥)] واتا:ئەو شتەی لە ناو گیرفانی دەرکرد.

١٩٨-شَرِبْنَ بِمَاءِ البَحْرِ ثُمَّ تَرَفَّعَتْ مَتَى لُجَجٍ خُضْرٍ لَهُنَّ نَئِيجُ[1].

دواتر باسی حەرفە جەڕەکانی تر دەکەین لەو شوێنەی دانەر[2] باسیان دەکات.

هەروەها دانەر لەم کتێبەیدا ((لولا))ی بە حەرفی جەڕ دانەناوە،بەڵام لە کتێبەکانی تریدا لە حەرفە جەڕەکانی داناوە.

وە بۆچوونی پێشەوا سیبویە وایە کە((لولا))حەرفی جەڕە،بەڵام تەنها جێناو(الضمیر) مجرور دەکات[3]،دەڵێی:((لولايَ ,ولولاكَ ,ولولاهُ))هەریەك لە جێناوەکانی(یا،وکاف ،ها)-لای پێشەوا سیبویە-مجرورن بە حەرفی((لولا)).

وە پێشەوا ئەخفەش پێی وایە کە ئەم جێناوانە[4]،لە محلی رفعدان ومبتدان، وە ئەم جێناوە مجرورانە لە شوێنی جێناوی مرفوعدان[5]،و حەرفی((لولا))کەش هیچ عملی تێیاندا نەکردووە،هەر وەکو چۆن عمل لە ناوی ئاشکرا(الظاهر)دا ناکات،وەکو:((لولا زیدٌ لأتيتُك)).

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئەو هەورانە لەئاوی سوێری دەریاکەیان خواردەوە وپاشان بەرزبوونەوە ودەنگی بەرزیان لێدەهات.بەڵگەکەی:( مَتَى لُجَجٍ..)لێرەدا متی وەکو حەرفی جەڕ بەکار هاتووە.

[2] مەبەستی ئەوەیە دواتر ابن مالك-رەحمەتی خوای لێ بێ-باسی ماناو یاسای سەرجەم حەرفە جەڕەکانی تر دەکات.

[3] واتا:جێناوەکە لە محلدا مجرور دەبێ،چونکە جێناو مبنیە،وەکو پێشتر باسکرا.

[4] واتا:ئەو جێناوانەی لکاون بە حەرفی(لولا).

[5] واتا:هەر یەك لە جێناوەکانی(ی ،ك،ه)کە لکاون بە(لولا)وە،هەرچەندە بۆ حاڵەتی رفع نین بەڵام لە جێی رفعدان،چونکە ئەم سێ جێناوە بۆ حاڵەتی نصب وجەڕ بە کاردێن،وەکو لە بابەتی جێناوەکاندا باسمان کرد.

هـەروەها پێـشەوا مُـبرد پێـی وایـە ئـەم جـۆرە لێکدراوانـە-مەبەسـت ((لولاك))وهاوشێوەکانێتی-لە زمانی عەرەبیدا نەهاتووە،بەلآم بۆچوونەکەی وەلآم دراوەتـەوەو بەڵگـەی بـۆ هێنراوەتـەوە بـە هـاتنی[1] لـە عەرەبـەوە،وەکو ووتەی:

١٩٩- أَتُطْمِعُ فِينا مَنْ أَرَاقَ دِمَاءَنَا     وَلَوْلاَكَ لم يَعْرِضْ لأَحْسَابِنَا حَسَنْ[2].

هەروەها وەکو ووتەی:

٢٠٠- وكم مَوْطِنٍ لَوْلاَيَ طِحْتَ كما هَوَى     بأَجْرَامِهِ مِـنْ قُنَّةِ النِّيقِ مُنْهَوِى.[3]

## *ماناو تايبەتمەندى هەندێ لە حەرفە جەڕەکان:

٣٦٦- بِالظَّاهِرِاخْصُصْ مُنْذُ مُذْ وَحَتَّى     وَالكَـافَ ،وَالوَاوَ، وَرُبَّ، وَالتَّا

٣٦٧-وَاخْصُصْ بِمُذْ وَمُنْذُ وَقْتاً وَبِرُبّْ     مُنَكَّـرًا وَالتَّـاءُ لِلَّـهِ وَرَبّْ

---

[1] واتا:هاتنی ئەم جۆرە لێکدراوانەی- مەبەست((لولاك))وهاوشێوەکانێتی- کە مُبرد پێی وایە لە زمانی عەرەبیدا نەهاتووە.

[2] ئەم دێرە شعرە هاوەڵی بەرێزعەمری کوڕی عاص ڕووبەڕووی معاویەووتویەتی لەکاتێکدا صولح وئاشتەوای لە گەڵ حەسەنی کوڕی ئیمای عەلیدا-ڕەزای خوا لەسەرجەم هاوەڵان بێ- کردووە،ماناکەی:ئایە هیوات بە کەسێکە کە خوێنمانی ڕشتووە،ئەگەر تۆ نەبای ئەو نەیدەتوانی ڕووبەڕووی نەژادو کەسایەتیمان بێتەوە. **بەڵگەکەی**:بەکار هێنانی ووشەی((لولا))یە لە گەڵ جێناودا،ئەمەش ڕەدە بۆ پێشەوا مبرد کە پێی وایە شتی وا لە زمانی عەرەبیدا نەهاتووە.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش:زۆرێك لە کات وشوێنەکانی جەنگ ئەگەرمن نەبوومایە ئەوە تیادەچووی ودەکەویتی وەکو کەوتنی ئەوکەسەی لە لووتەکەی کێوەوە بەهەموو قورسایی وقەبارەی دەکەوێتە خوار. بەڵگەکەی: بەکار هێنانی ووشەی((لولا))یە لە گەڵ جێناودا،ئەمەش ڕەدە بۆ پێشەوا مبرد کە پێی وایە شتی وا لە زمانی عەرەبیدا نەهاتووە.

٣٦٨-وَمَـا رَوَوْا مِنْ نَحْـوِ رُبَّهُ فَتَى نَزْرٌ، كَـذَا كَـهَا وَنَحْـوُهُ أَتَى.[١]

هەنـدێ لـە حەرفـە جـەڕکان تـەنها نـاوی ئاشـکرا(ظـاهر)[٢] مجـرور دەکەن،ئـەوانیش بیریـتین لـەو حـەوت حەرفـەی لـە دێـڕی یەکەمـدا باسکرا،کەواتا دروست نیە بڵێی: ((مُنـذهُ،یـان مُـذهُ))هـەروەها ئـەوانیش تریش.

هـەروەها هەریـەك لـە((مُنذُ،ومُـذْ)) لـە نـاوە ئاشـکراکان تـەنها نـاوی کاتـەکان((أسمـاء الزمـان))مجـرور دەکـەن،جا ئەگـەر کاتەکـە بـۆ ئێـستا بـوو ئـەوە((مُنذُ،ومُـذْ))کـە بـە مانـای حـەرفی((في))دێـت وەکـو:((مـا رأيتُـهُ مُنْذُ يومِنـا))واتـا:في يومِنـا،وە ئەگـەر کاتەکـە ڕابـردوو بـوو ئـەوە بـە مانـای حەرفی((مِن))دێن وەکو:((ما رأيتهُ مُذْ يومِ الجمعةِ))واتا:مِنْ يومِ الجمعة. دواتر دانـەر لـە کۆتـای ئـەم بابەتـەوە باسـی ئەمـە دەکـات، ئەمـە بـوو مانـای ووتـەی:(( وَاخْصُصْ بِمُذْ وَمُنْذُ وقتا)).

وە حەرفی((حتی))دواتر قسە لەسەر ناوەکەی دێت کە دانەر باسی دەکات، وە بە شاذی هاتووە((حتی))جێناو مجرور کات،وەکو ووتەی:

---

[١] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:٣٦٦-تایبەت کە بە مجرور کردنی ناوی ئاشکرا((الاسم الظاهر))ئەم حەوت حەرفە جەڕە{منذ،مُذ،حتی،کاف، واو،رُبَّ،تا}. واتا:ئەم حەوت حەرفە جێناو نابێتە ناویان. ٣٦٧-هەروەها تایبەت کە هەردوو حەرفی((منذ ،مُذ))بە مجرورکردنی ناوی کات، هەروەها تایبەتە حەرفی((رُبَّ))بە مجرورکردنی ناوی نەناسراو، وە تایبەتە حەرفی((تا))بەمجرورکردنی ناوی پیرۆزی ((الله)) یان ناوی((رَبّ)). ٣٦٨-وە ئەوەی گێڕدراوەتەوە لە وێنەی((رُبَّهُ فَتَى))-کە حەرفی((رُبَّ))ناوەکەی جێناوە-کەمە،هەروەها وێنەی((کَـهَا))-کە حەرفی((کاف)) جێناوی مجرور کردووە-و هاوشێوەی هاتووە کەمن و شاذن.

[٢] پێشتر ووتمان ناوی ئاشکرا((ظاهر))پێچەوانەی جێناو((ضمیر))ە.

٢٠١- فَلاَ واللهِ لا يُلْفِي أُنَاسٌ فَتَى حَتَّاكَ يابْنَ أَبِي زِيَادِ[١].

ئەمـەش قیـاس ناکرێتـە سـەری[٢]،بـە پێـچەوانەی بۆچـوونی هەنـدێ لەزانایان،هەروەها لە خوێندنەوەو بۆچوونی(هُذیل)حەرفی حای(حتی)بە عین دەخوێننـەوە،وە عەبـدولای کـوڕی مـسعود ئـەم ئایەتـەی بـەم شـێوەیە خوێندۆتەوە﴿فَتَرَبَّصُوا بِهِ عَتَّى حِينٍ﴾[٣].

وە حـەرفی جـەڕی واو تایبەتـە بـە سـوێندخواردن،هەروەها حـەرفی(تـا)ش بـۆ سوێندخواردنە،وە دروست نیە باس کردنی فعلی سوێندخواردنەکە[٤] لە گەڵ ئەم دوو حەرفە،کەوابوو دروست نیە بڵێی:((أُقسمُ واللهِ))یان((أُقسمُ تاللهِ)).

هـەروەها حـەرفی جـەڕی تـا تـەنها ووشـەی پـیرۆزی((الله))مجـرور دەکات،دەڵێی:((تاللهِ لأفعلَنَّ))،وە بیستراوە کە ووشەی((رَبّ))کە پاڵدرابێ بۆ لای ووشەی((الکعبە))،ووتویانە:(( تَرَبِّ الکعبةِ))،ئەمە بوو مانای ووتەی ابن

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:نا سوێند بەخوا خەڵکی نابینن گەنج ولاوێك پێداویستیەکانیان جێبەجێ بکات، تەنانەت تۆش ئەی کوڕی ئەبو زیاد. **بەڵگەکەی:** ((حتاك))حەرفی جەڕی((حتی))چۆتە سەر جێناوی((ك))ئەمەش شاذەو پێچەوانەی یاسایە.

[٢] واتا:شاذە.

[٣] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٢٥)ی سورەتی(المؤمنون)،واتاکەی:- بێ باوەڕەکانی گەلی نوح علیە السلام لەوەلآمیدا ووتیان-:باوەڕی پێمەێنن وچاوەڕێ کەن تا ماوەیەك تیادەچێ ودەمرێ. **إعرابەکەی:**فـ/حسب ماقبلها. تربّصوا/فعل أمر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة، والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. به/جارومجرور متعلقان بـ(تربصوا). عتّى/حرف جر وغاية. حينٍ:اسم مجرور. **الشاهد فيها/إبدال حرف حاء حتى (عيناً) على لغة هذيل وقراءة ابن مسعود**ﷺ.

[٤] مەبەست لە فعلی سوێند خواردن فعلی:أُقسمُ یان احلفُ،یان هەر فعلێکی تر کە بۆ سوێندخواردن بەکار بێ،ماضی بێ یان مضارع یان امر بێ.

مالـك:(( وَالتَّــاءُ لِلَّـهِ وَرَبُّ))،هـەروەها بیـستراوە((تالرحمنِ))،هـەروەها پێـشەوا خفـاف[١] لـە شـەرحی((الكتـاب))دا باسـی ئـەوەی كـردووە كـە ووتويانـە: ((تَحَيَاتِكَ))[٢]،ئەمەش نامۆوغريبە.

وە حەرفی((رُبّ))تەنها ناوی نەناسراو((نكره))مجرور دەكات،وەكو:((رُبَّ رجلٍ عالِمٍ لقيتُ))،ئەمە بوو مانای ووتەی ابن مالـك:(( وَبِرُبّ مُنَكـرًا))واتـا:تايبـەت بكـە حـەرفی رُبّ بـە نـاوی نەناسـراو،وە شـاذی هـاتووە كـە جێنـاوی كەسـی سێيەمی((ضمير الغيبة))مجرور كردووە،وەكو ووتەی:

٢٠٢- وَاهٍ رَأَبْتُ وَشِيكاً صَدْعَ أَعْظُمِه وَرُبَّهُ عَطِباً أَنْقَذْتُ مِنْ عَطَبِهْ[٣].

هـەروەكو چـۆن بـە شـاذی هـاتووە حـەرفی جـەڕی(كـاف)جێنـاوی مجـرور كردووە،وەكو ووتەی:

٢٠٣- خَلَّى الذَّنَابَاتِ شِمَالاً كَثَباً وأُمَّ أَوْعَالٍ كَهَا أَوْ أَقْرَبَا[٤]

وە ووتەی:

---

[١] ناوی:يحيى كوڕی عبدالله يە وناسراوە بەخفّاف،ويەكێكە لە زانا شارەزاكانی زانستی ڕێزمانی عەرەبی(النحو)،ويەكێك لە كتێبە كانی شەرحی كتابی پێشەوا سيبويه يە-ڕەحمەتی خوا لە هەموويان بێ-،لێرەدا مەبەست پێی ئەو كتێبەيە، ساڵی(٦٥٧ك)كۆچی دوای كردووە.

[٢] واتا:بە گيانت قەسەم. ئەم جۆرە سوێند خواردنە لای زۆربەی زانايان حەرامە ودروست نيە.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:زۆر جار بووە كەسێكی لاواز كە نزيك بووە تياچێ فريای كەوتووم وڕزگاريم كردووە ونەم هێلاوە يتا چێ. بەڵگەكەی:((وَرُبَّهُ عَطِباً))لێرەدا حەرفی رُبّ جێناوی مجرور كردووە-واتا جێناوەكە لەمحلدا مجرورە- ئەمەش شاذە وپێچەوانەی ياسايە.

[٤] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:چۆليان پێ كردن ناو دۆڵ وشيوەكان وسەر گردۆڵەكان وڕاويان نان.-مەبەستی ئەوەيە كە ڕاوچييەكان لە هەموو لايەكەوە ڕاوی كەرە كێوييەكانيان كرد وتەرايان كردن- بەڵگەكەی:((كَهَا)) حەرفی كاف جێناوی مجرور كردووە،ئەمەش شاذە وپێچەوانەی ياسايە.

٢٠٤- ولا تَرَى بَعْلاً ولا حَلائِلا كَهُ ولا كَهُنَّ إلاَّ حَاظِلا[١].

ئەمە بوو مەبەست لـە ووتـەی ابـن مالـك:(( وَمَـا رَوَوْا-دێڕەكـە[٢]))واتـا:ئـەوەی گێڕدراوەتـەوە لـە مجروركردنـی((رُبَّ))بـۆ جێنـاو،وەكو:(( رُبَّـهُ فَـتَى)) كەمـەو شانە،هەروەها مجروركردنی((كاف))بۆ جێناو وەكو((كها)).

* * *

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش:لەم دێڕەدا شاعر وەصفی نێرەكەر وماكەرەكانی دەكات ودەڵێ:هیچ مێرد وحەلاڵێك نابینی وەكو ئەو نێرە كەرە ڕێگر بێ لە ماكەرەكانی لەگەڵ نێرەكەرەی تر جووت بێ ،واتا:خاوەن غیرەتە. بەڵگەكەی:(( كَهُ ، كَهُنَّ)) حەرفی كاف جێناوی مجرور كردووە، ئەمەش شانە وپێچەوانەی یاسایە.

[٢] مەبەست دێڕی(٣٦٨)ی ئەلفیەیە.

***باسی ماناکانی حەرفی جەڕی((مِنْ)).**

**٣٦٩- بَعِّضْ وَبَيِّنْ وابْتَدِئْ فى الأَمْكِنَهْ بِمِنْ، وَقَدْ تَأْتِي لِبَدْءِ الأَزْمِنَهْ**

**٣٧٠-وَزِيدَ فى نَفْـيٍ وَشِبْهِهِ فَجَـرّْ نَكِرَةً: كَ ((مَا لِبَاغٍ مِنْ مَفَـرّْ))[١].**

**حەرفی((مِن))بەکار دێ بۆ:١-هەندێتی،٢- ڕوونکردنەوەی ڕەگەز،٣-دەست پێکردنی مەبەست لە جگە لە کات بەزۆری،وە لە کات بەکەمی، ٤-زیادکراو.**

**نموونەی هەندێتی:((أخذتُ مِنَ الدراهمِ))،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللهِ..﴾[٢]. وە نموونەی ڕوونکردنەوەی ڕەگەز(بيان الجنس)،فەرموودەی خوای گەورە:﴿..فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ..﴾[٣].**

---

[١] **پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٦٩-حەرفی جەڕی (من) بەکار بێنە بۆ-بەش(بعض)،هەروەها بۆڕوونکردنەوەی ڕەگەزی شتێ(بيان الجنس)،وە بۆ سەرەتاو دەست پێکردنی شوێن یان کاتی مەبەست. ٣٧٠-هەروەها هەندێ جار زیاد دەکرێ بۆ بەهێزکردنی نەفی یان هاوشێوەی نەفی،وەکو نموونەی:(( مَا لِبَاغٍ مِنْ مَفرّ))واتا:نیە بۆ دەست درێژی کار دەربازبوون.**

[٢] **بەشێکە لە ئایەتی(٨)ی سورەتی(البقره)،پوختەی ماناکە:هەندێ لە خەڵکی-بە زاریان-دەڵێن باوەڕمان هەیە بەخوای گەورە -مەبەست دووڕووەکانە-... إعرابەکەی:**و:حرف استئناف. من:حرف جر للتبعيض. الناس:اسم مجرور.والجار والمجرور متعلقان بمحذوف خبر مقدم. مَنْ:اسم موصول مبني على السكون في محل رفع مبتدأ مؤخر. يقولُ:فعل مضارع مرفوع، وفاعله ضمير مستتر تقديره(هو) والجملة الفعلية (صلة الموصول)، آمنّا:فعل وفاعل، وجملة(آمنّا)في محل نصب مقول القول. بالله:جارومجرور وتعلقان بـ(آمنّا).

[٣] **بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٣٠)ی سورەتی(الحج)،کورتەی ماناکەی:دوور کەونەوە لە پیسی لە بتەکان. إعرابەکەی:**فـ:حسب ما قبلها. اجتنبوا:فعل أمر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة، والواو:ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. الرجسَ:مفعول به منصوب. من الأوثان:جار ومجرور،وهما في محل نصب حال. **الشاهد فيها:(من الأوثان)حيث جاءت مِنْ لبيان الجنس.**

وەنموونەی حەرفی(من) بۆ دەست پێکردنی مەبەست لە شوێندا فەرموودەی خوای گەورە﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى...﴾[1]. وەنموونەی(من)بۆ دەست پێکردنی مەبەست لە کاتدا فەرموودەی خوای گەورە﴿..لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ..﴾[2]. وە وەکو ووتەی شاعر:

٢٠٥– تُخُيِّرْنَ مِنْ أَزْمَانِ يَومِ حَلِيمَةٍ    إلى اليَومِ قَدْ جُرِّبْنَ كُلَّ التَّجَارِبِ[3].

---

[1] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٣٠)ی سورەتی(الاسراء)،پوختەی ماناکەی:پاك وبێگەردی بۆ ئەو خوایەی شەوڕەوی کرد بە بەندەی خۆی–کە محمدە ﷺ–لە بەشێکی شەودا سەرەتا لە مزگەوتی حەرام–مەبەست مەککەیە–بۆ مزگەوتی ئەقصا–مەبەست قُدسە–. إعرابەکەی:سُبحانَ: مفعول مطلق لفعل محذوف تقديره(أسبّحُ)،وهو مضاف. الذي:اسم موصول مبني في محل جرّ مضاف إليه. أسرى:فعل ماضي مبني على الفتحة المقدرة على الألف للتعذر، وفاعله:ضمير مستتر تقديره(هو). بعبده:جارومجرور،ومضاف إليه. والجار والمجرور متعلقان بـ(أسرى). ليلاً:ظرف زمان منصوب في محل نصب مفعول فيه. من المسجدِ:جارومجرور متعلقان بمحذوف حال تقديره(مبتدئاً). الحرامِ:نعت المسجد مجرور. إلى المسجد: جارومجرور متعلقان بمحذوف حال تقديره(منتهياً). الأقصى:نعت مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة للتعذر. الشاهدفي الآية:(من المسجد الحرام)حيث جاءت من لابتداء الغاية في المكان.

[2] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١٠٨)ی سورەتی(التوبة)،پوختەی ماناکەی:بێگومان مزگەوتێ–مەبەست مزگەوتی قُبایە–کە لەسەر بناغەی تەقواوپارێزکاری دامەزرابێ لە یەکەم ڕۆژەوە شایستەترە نوێژی تێدا بکەی...إعرابەکەی:لَمسجدٌ:لـَ:لام الابتداء، مسجدٌ:مبتدأ مرفوع. أُسّسَ:فعل ماضي مبني للمجهول،ونائب فاعله:ضمير مستتر تقديره(هو). على التقوى:جارومجرور متعلقان بـ(أُسّس). مِنْ أوّلِ:جارومجرور متعلقان بـ(أسس)أيضا، وأوّل مضاف. يومِ:مضاف إليه مجرور. أحقُّ:خبر المبتدأ مرفوع. أنْ:حرف نصب ومصدرية. تقومَ:فعل مضارع منصوب بـ(أن)وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، وفاعله:ضمير مستتر فيه وجوبا تقديره(أنت). فيه:جارومجرور متعلقان بـ(تقوم). الشاهد فيها:(مِنْ)هنا اتت لابتداء الغاية في الزمان.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:–ئەم شمشێرانە–تاقیکراونەتەوە لە ساتە وەختەکانی ڕۆژی حەلیمە ڕۆژێکی بە ناوبەنگە لەناو عەرەب کە جەنگێکی گەورە تێیدا ڕووی

وەنموونەی حەرف(من)ی زیادکراو:((ما جاءَنِي مِنْ أحدٍ))،زیادناکریّ- لای زۆربەی زانا بەصرییەکان- مەگەر بەدوو مەرج:
یەکەمیان:دەبیّ ناوەکەی-واتا:مجرورکراوەکەی-نەناسراو بیّ.
دووەم:دەبیّ نەفی یان هاوشیّوەی نەفی لە پیّشیّوە بیّ،مەبەست لە هاوشیّوەی نەفی:نەهیە،وەکو:((لا تضرِبْ من أحدٍ))، هەروەها استفهام،وەکو:((هل جاءك مِنْ أحدٍ؟)).
وە زیاد ناکریّ بۆ ڕستەیەك کە جیّگیر((مثبت))بیّ،هەروەها ئەگەر ناوەکەی ناسراو بیّ،کەواتا دروست نیە بلّیی:(( جاءَنِي مِنْ زيدٍ)) بە پیّچەوانەی بۆچوونی پیّشەوا ئەخفەش،کە پیّی وایە دروستە اسمی(من)ی زیادکراو ناسراو بیّ وئەم ئایەتەشی هیّناوەتەوە:﴿ يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ..﴾[1]. هەروەها لای کوفیّکان دروستە حەرفی(من)زیاکریّ بۆ ڕستەی(مثبت) بەمەرجیّ ناوەکەی نەناسراو بیّ، نموونەیان هیّناوتەوە بە ڕستەی((قد كان مِنْ مَطَرٍ)) واتا: قد كانَ مطرٌ[2].
٣٧١- لِلانتِهَا: حَتَّى، وَلاَمٌ ،وَإِلَى وَمِنْ وَبَاءٌ يُفْهِمَانِ بَدَلاً[3]

---

داوە-،تا ئەم ڕۆ،بە هەموو تاقیکردنەوەیەك. بەڵگەکەی:(( مِنْ أزْمَانٍ)) حەرفی من بەکار هاتووە بۆ سەرەتای دەست پیّکردنی مەبەست لە کاتدا.

[1] بەشیّکە لە ئایەتی(٣١)ی سورەتی(الأحقاف)،کورتەی ماناکەی: خوا لە تاوانەکانتان خۆش دەبیّ ودەیسڕیّتەوە. إعرابەکەی: يغفر:فعل مضارع مجزوم لأنه جواب الطلب، وفاعله:ضمير مستتر تقديره(هو). لكم:جارومجرور متعلقان بـ(يغفر). من:حرف جر-زائدة عند الأخفش ومن وافقه-،وللتبعيض-عند غيرهم-. ذنوبكم:مجرور لفظا منصوب محلا وهو مفعول به-إذا كان من زائدة-،واسم مجرور وعلامة جره الكسرة،وهو مضاف،كُم:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. الشاهد فيها: مجيء من زائدة مع انَ اسمها معرفة وذلك جائز عند الأخفش ومن وافقه.

[2] لەم ڕستەیەدا(كان)فعلی تامە و(مطرٌ)دەبیّتە فاعلی.

[3] پوختەی مانای ئەم دیّڕەی ئەلفیە: هەر یەك لە حەرفە جەڕەکانی(حتى ولام وإلى)بۆ کۆتای مەبەستن، وەهەندیّ جار حەرفی(من وبا)بۆ بری-جیاتی-(بدل) بەکار دیّن.

بۆ کۆتای مەبەست حەرفی((إلی،وحتی،ولام))بە کاردێ، حەرفی بنەڕەتیش لەم سیانە بریتیە لە(إلی)،لەبەر ئەوە لە ڕستەدا مجرور دەکات ناوەکەی کۆتای مەبەست وناوی تریش وەکو:((سِرْتُ البارحةَ إلى آخرِ الليلِ، أو إلى نصفهِ))، بەڵام حەرفی(حتی)تەنهاناوەکەی کۆتای یان شتێك نزیك کۆتای[1] مجرور دەکات، وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾[2]،جا حتی جگە لە کۆتای یان نزیکی کۆتای ناوی تر مجرور ناکات،کەوابوو دروست نیە بڵێی:(( سرتُ البارحةَ حتى نصفِ الليلِ)).وە بەکارهێنانی حەرفی لام بۆ کۆتای مەبەست کەمە،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى﴾[3].
وە هەریەك لەحەرفی(من)و(با)بەکاردێن بۆ بری وجیاتی،نموونەی بەکارهێنانی(من)بۆ بری وجیاتی فەرموودەی خوای گەورە:﴿.. أَرَضِيتُمْ بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الْآخِرَةِ..﴾[4]،

---

[1] مەبەست لە ناوی کۆتای قسەومەبەستەکەیە.

[2] ئایەتی ژمارە(٥)ى سورەتی(القدر)،کورتەی ماناکەی:ئەو شەوە(کاتی) هێمنی وئاشتی دەبێ تا هەڵاتنی شەبەق. إعرابەکەی:سلامٌ:خبر مقدم مرفوع. هي:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدأ مؤخر. حتى:حرف جر وغاية. مطلعِ:اسم مجرور،وهو مضاف. الفجر:مضاف إليه مجرور. الشاهد في الآية:(حتى مطْلع) حيث جاءت حتى مفيدة لانتهاء آخر الغاية أو متصل بآخر الغاية.

[3] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٥)ى سورەتی(الزمر)،کورتەی ماناکەی:هەر یەکەیان تا ماوەیەکی دیاریکراو بۆیان دەگەڕێن. إعرابەکەی:كُلٌّ: مبتدأ مرفوع. يجري:فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة منع من ظهورها الثقل،وفاعله ضمير مستتر تقديره(هو)،والجملة الفعلية(يجري)في محل رفع خبر المبتدأ. لأجلٍ:جارومجرور متعلقان بـــ(يجري). مسمًى:نعت لـــ(أجل)مجرور. الشاهد فيها:لأجلٍ:حيث دلّت اللام على انتهاء الغاية،واستعمال اللام للانتهاء قليل.

[4] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٣٨)ى سورەتی(التوبة)،کورتەی ماناکەی: ئایە ئێوە ڕازین بەم ژیانی دنیایە لە باتی-جیاتی-پاشەڕۆژ. إعرابەکەی:أ:حرف استفهام إنكاري الدال على التوبيخ مبني على الفتح لامحل لها من الاعراب. رضيـ:فعل ماضٍ مبني على السكون لاتصاله

واتا:بدل الآخرة، وەفەرموودەی خوای گەورە:﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾[1]،واتا:بدلكم، وە وەكو ووتەی شاعر:

٢٠٦- جَارِيَةٌ لَـمْ تَأْكُلِ الْمُرَقَّقَا ولَم تَذُقْ مِنَ البقُولِ الفُستُقَا[2].واتا:بدل البقول، هەروەها نموونەی بەكارهێنانی حەرفی(با)بۆ بری وجیاتی ئەوەیە كە هاتووە لە فەرموودەدا((مَا يَسُرُّنِي بِهَا حُمْرُ النَّعَمِ))[3]،وە وەكو ووتەی شاعر:

---

بضمير المخاطبين. تُمْ:ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل. بالحياة:جارومجرور متعلقان بـ(رضيتم). من:حرف جرّ بمعنى البدل. الآخرة:اسم مجرور،والجار والمجرور متعلقان بمحذوف حال تقديرها:بدلاً من الآخرة. الشاهد فيها:(من الآخرة)حيث استعملت من بمعنى بدل،والتقدير في رأي ابن عقيل:بدل الآخرة.

[1] ئایەتی ژمارە(٦٠)ی سورەتی(الزخرف)،كورتەی ماناكەی:ئەگەر بمانویستایە لە جیاتی ئێوە ملائكەتمان دادەنا لە زەویدا دەبوونە جێنشینی ئێوە. إعرابەكەی: و:حسب ما قبلها. لو:حرف شرط غير جازم. نشاءُ:فعل مضارع مرفوع،وفاعله:ضمير مستتر تقديره(نحن). لجعلنا:لـ:واقعة في جواب لو،جعلنا:فعل وفاعل. منكم:جارومجرور وتقديرهما(بدلكم)في محل نصب مفعول به أول لـ(جعل)إذا كان بمعنى صيّر، أو هما متعلقان بـ(جعل)إذا كان بمعنى خلق. ملائكةً:مفعول به ثانٍ. في الأرض:جارومجرور متعلقان بـ(يخلفون). يخلفون:فعل وفاعل،وجملة(يخلفون)في محل نصب نعت لملائكة. الشاهد فيها:(منكم)حيث تضمنت(من)معنى بدل،والتقدير:لو نشاء لجعلنا بدلكم ملائكة.

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: ئەو كچە سادە ژیاوەو خواردنی جۆراوجۆرو نەرم وناسكی نەخواردوە،وە لەبری دانەوێڵەش فستقی نەخواردووە. بەڵگەكەی:(( مِنَ البقُولِ..))حەرفی من بە مانای بدل بەكار هێنراوە.

[3] ئەم ڕستەیە قسەی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبی تالبە-ڕەزای خوای لێی بێ- بەشێكە لەو فەرموودەی كە هەریەك لە ئیمامی بیهقی لە كتێبی(السنن الكبرى)دت بە ژمارە(١٥٠٨)،وئیمامی طبراني لە(المعجم الأوسط)دا بە ژمارە(٦٣٢٢) هێناویانە،كورتەی ماناكەی:-كاتێ كە ئەبو طالب باوكی ئیمامی عەلی ومام وپشتیوانی پێغەمبەرﷺكۆچی دوای كرد،ئیمامی عەلی هات بۆ لای

فليتَ لي بِهِم قوماً إذا رَكِبُوا شَنُّوا الإغَارَةَ فُرسَاناً ورُكبَانَا[1]

* * *

٣٧٢–وَاللاَّمُ لِلْمِلْكِ وَشِبْهِهِ وَفي تَعْدِيَـةٍ أَيْضاً وَتَعْلِيلٍ قُفِـي

٣٧٣–وَزِيـدَ وَالظَّرْفِيَّةَ اسْتَبِنْ بِبَـا وَفي وَقَـدْ يُبَيِّنَانِ السَّبَبَـا[2].

**پێشتر باسمان کرد کە حەرفی لام بۆ کۆتای مەبەست بەکار دێ،وە لێرەیدا باسی ئەوە دەکات کە بۆ خاوەندارێتی بەکار دێ،وەکو:﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾[3]،وە وەکو:((المالُ لزيدٍ))،وە نموونەی هاو مانای**

---

**پێغەمبەرﷺوپێی مامت مردووە،پێغەمبەرﷺپێی فەرموو:برۆ دفنی کە وهیچ مەکە تا دێم،پاشان پێغەمبەرﷺهات وکۆمەڵێ دعای تایبەتی بۆ پێشەوا عەلی کرد–وعەلیش دەڵێی:دڵخۆش نابم لەبری ئەو دوعیانەی پێغەمبەرﷺبە مێگەلە ووشتری سور–کە ماڵێکی بە قیمەتی ئەو سەردمە بووە. إعرابی فەرموودەکە:**ما:حرف نفي غير عاملة. يسُرُّ:فعل مضارع مرفوع.ن:للوقاية.ي:في محل نصب مفعول به. بها:بـ:حرف جر بمعنى بدل،وها:في محل جر اسم مجرور.حُمْرُ:فاعل،وهو مضاف،النعم:مضاف إليه. **الشاهد فيه:(بها) حيث تضمنت الباء معنى البدل.**

[1] **پێشتر لە ڕاڤەی شاهدی ژمارە(١٥٤)مانای ئەم دێڕەمان کرد.لێرەدا بەڵگەکەی بریتیە لە(بهم)کە حەرفی(با)بۆ بدل بەکار هاتووە،وتقدیرەکەی دەبێتە: فليتَ لي بدلهم.**

[2] **پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٧٢–حەرفی لام بەکاردێ بۆ مانای خاوەندارێتی،وهاومانای خاوەندارێتی،وە بۆ مانای تێپەڕکردنی فعلی لازم–واتاکردنی فعلی لازم بە متعدی–،وە بۆ هۆبوون.٣٧٣–وە هەندێ جاریش حەرفی جەڕی لام زیادکراودەبێ،وە هەردوو حەرفی جەڕی(بـ)و(في)بۆ مانای لەناوبوون(ظرفية)، وبۆ هۆبوون(سببية)بەکاردێن.**

[3] **بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٢٨٤)ـی سورەتی(البقرة)،کورتەی ماناکەی:هەرموڵکی خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکاندایەو ئەوەی لە زەویدایە. إعرابەکەی:** لِلَّهِ:جارومجرور متعلقان بمحذوف خبر مقدم. ما:اسم موصول مبني في محل رفع مبتدأمؤخر. في

**خاوەنـداریێتی:((الجلُّ للفرسِ،والبابُ للدارِ))[1]،وە نموونـەی حـەرفی لام بـۆ تێپەڕاندن:((وهبتُ لِزيدٍ مالاً))،وە وەکو فەرموودەی خـوای گـەورە:﴿..فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا ، يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ..﴾[2] هەروەها حەرفی لام بەکار دێ بۆ هۆبوون وەکو((جئتُكَ لإكرامِك))،وە وەکو ووتەی:**

**٢٠٧- وإنِّي لَتَعْرُونِي لِذِكْرَاكِ هَزَّةٌ     كَمَا انْتَفَضَ العُصْفُورُ بَلَّلَهُ القَطْرُ[3].**

**وەنموونەی لامی زیادکراو بە قیاسی[4]،وەکو:**

---

السموات:جارومجرور متعلقان بمحذوف تقديره(استقرّ) وهو صلة الموصول. وماڧي الأرض:إعرابه مثل مافي السموات. **الشاهد فيها:اللام في لفظ الجلالة(لله)افادت الملك.**

(1) **مەبەست لە هاومانای خاوەنداریێتی ئەوەیە کە ئەو شتە تایبەت دەکات بە شتێك کە لە توانایدا نیە ببێتە خاوەن،وە پێیشی دەوترێ((الاختصاص))، لە ڕستەی((الجلُّ للفرسِ)) کورتانەکە بۆ ئەسپەکەیە واتا:تایبەتە بەو نەوەك ئەسپەکە بووبێتە خاوەنی.**

(2) **دوو بەشن لە ئایەتەکانی ژمارە(٥و٦)ی سورەتی(مريم)،پوختەی ماناکەیان:- پێغەمبەر زکریا -سەلامی خوای لەسەر- نزای کردوداوای لەخوای گەروە کرد- پەروەردگار لە لایەن خۆتەوە منداڵێکی چاکم پێببەخشە،میرات گیری(پێغەمبەریێتی)من وبنەماڵەی یعقوب بێ.إعرابەکەی:**فـ:حسب ما قبلها. هب:فعل أمر للدعاء،وفاعله:ضمير مستتر تقديره أنت. لي:جارومجرور متعلقان بـ(هبْ). منْ لدُنْ:جارومجرور،ولدُن مضاف،وك:في محل جر مضاف إليه،وشبه الجملة(من لدنك)متعلق بمحذوف حال لـ(ولياً). ولياً:مفعول به.يرثني:فعل وفاعل ومفعول به،وجملة(يرثُني)في محل نصب نعت لـ(وليا). ويرثُ:و:حرف عطف،يرثُ:فعل وفاعل. منْ آلِ:جار ومجرور متعلقان بـ(يرثُ)، وآلِ:مضاف إليه. يعقوبَ:مضاف إليه مجرور وعلامة جره الفتحة بدل الكسرة لأنه ممنوع من الصرف. **الشاهد فيها:(هب لي) حيث جاءت اللام هنا للتعدية.**

(3) **ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:بێگومان من لە کاتی باس کردنی تۆدا لەرزوتەزوویەك دەمگرێ،هەر وەکو چۆن پاساری وچۆلەگە لەرز دەیگرێ لە کاتی تەڕبوونی بە باران. بەڵگەکەی:( لِذِكْرَاكِ) حەرفی لام بەکار هاتووە بۆ هۆی لەرزینەکەی.**

(4) **مەبەست بە قیاسی لێرەدا ئەوەیە بۆ بەهێزکردنی عامله دێ.**

((لِزَيْـدٍ ضَـرَبْتُ))[١]، وەفـــەرموودەی خـــوای گـــەورە﴿إِنْ كُنْـتُمْ لِلــرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ﴾[٢]،هەروەها زیاد دەکرێ بە سماعی[٣] وەکو((ضربتُ لِزيدٍ)).

وە ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی:(( وَالظَّرْفِيَّةَ اسْتَبِنْ –تا کۆتای دێرەکە))بۆ مانای حەرفی ((با)) و((فی))،باسی ئەوەی کردووە کە هەردووکیان هاوبەشن لەوەی بۆ لەناوبوون(ظرفیة)،وهۆبوون(سببیة)دەبن،نموونەی حەرفی با بۆ لـەناوبوون فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿وَإِنَّكُـمْ لَتَمُـرُّونَ عَلَـيْهِمْ مُـصْبِحِينَ، وَبِاللَّيْلِ...﴾[٤]واتـا:وفی اللیل،وەنموونـەی حـەرفی بـا بـۆ هۆبـوون فـەرموودەی

---

[١] لەم ڕستەیەدا عاملەکە(ضَرَبْتُ)دواکەوتووە لە معمولەکەی(لِزَيْدٍ)بۆیە لاواز بووە، واتا:هەر کاتێ عامل دواکەوت لاواز دەبێ.

[٢] ڕستەی کۆتاییە لە ئایەتی ژمارە(٤٣)ـی سورەتی(یوسف)–علیه السلام–،کورتەی ماناکەی:...ئەگەر ئێوە مانای خەو دەکەن ودەزانن خەو پەرژین بکەن. إعرابەکەی:إنْ:حرف شرط.كُنتُم:فعل ماضي ناقص مبني على السكون،وهو في محل جزم فعل شرط، تُمْ:ضمير متصل مبني في محل رفع اسم(كان). للرؤيا:لـ:حرف جر زائدة لتقوية العامل المتأخر(تعبرون) عن معموله(الرؤيا)، الرؤيا:مجرور لفظا منصوب محلا وهو مفعول به. تعبرون:فعل مضارع مرفوع،وواو الجماعة:في محل رفع الفاعل. وجملة(تعبرون)في محل نصب خبر(كان). **الشاهد فيها:(للرؤيا)حيث زيدت اللام قياسا لتقوية العامل،لأنّ العامل إذا تقدم معموله لم يكن في قوته على العمل مثل الذي تأخر عنه عامله.**

[٣] مەبەست لە سماعی لێرەدا ئەوەیە کە حەرفە لامەکە زیاد دەکرێ بۆ بەهێزکردنی مانای ڕستەکە نەوەك بۆ بەهێزکردنی عاملەکە.

[٤] ئایەتی(١٣٧)وبەشێك لە ئایەتی(١٣٨)ـی سورەتی(الحجر)،کورتەی ماناکەی: بەڕاستی ئێوە(قورەیشیەکان)دەڕۆن بەسەر–شوێنەواری گەلی لوطدا علیه السلام–بە بەیانیان،وبەشەودا... إعرابەکەی:و:حسب ما قبلها.إنّ:حرف مشبه بالفعل.كُم:ضمير متصل مبني في محل نصب اسم إنّ.لتمرون:لـ:مزحلقة،تمرون:فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون،والواو في محل رفع فاعل. والجملة الفعلية في محل رفع خبرإنّ. عليهم:جارومجرور متعلقان بـ(تمرون). مصبحين:حال منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه جمع مذكر السالم. وبالليلِ:

خوای گەورە﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا﴾[1]،وە نموونەی حەرفی((فی))بۆ لەناوبوون((زيدٌ في المسجد))ئەمەش زۆرە بـۆ حـەرفی((فی))،وەنموونـەی حـەرفی((فی))بـۆ هۆبـوون فـەرموودەی پێغەمبەرﷺ:((دخلتْ امرأةٌ النَّارَ في هِرَّةٍ حَبَسَتْهَا فلا هي أَطْعَمَتْها ولا هي تَرَكَتْها تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأرضِ[2] )).

---

جارومجرور،وبالليل معطوف على مصبحين فهو حال ثانية. **الشاهد فيها**:(بالليلِ)حيث جاءت الباء للظرفية،والتقدير:وفي الليل.

[1] ئايەتی ژمارە(١٦٠)ی سورەتی(النساء)،كورتەی ماناكەی:بەهۆی ستەم كردنەوە لەلایەن جولەكەكانەوە حەرامەمان كرد لێیان چەند خۆراكێكی پاك وخاوێن كە حەڵاڵ كرا بوون بۆیان،وە بەهۆی بەرهەڵستی كردنیان لەڕێگەی خوا. **إعرابەكەی**:فـ:حسب ما قبلها،بظلمٍ:جارومجرور متعلقان بـ(حرمنا). من الذين: جارومجرور متعلقان بـمحذوف صفة لظلم. هادوا:فعل وفاعل،وجملة هادوا صلة الموصول. حرّمنا:فعل وفاعل.عليهم: جارومجرور متعلقان بـ(حرمنا).طيباتٍ:مفعول به منصوب وعلامة نصبه الكسرة لأنه جمع مؤنث سالم. أُحلّتْ:فعل ماضي مبني للمجهول،والتاء:تاء التأنيث لامحل لها من الاعراب، ونائب فاعله:ضمير مستتر تقديره(هي)،وجملة(أحلتْ)في محل نصب صفة لـ(طيبات).لهم: جارومجرور متعلقان بـ(أحلت). و(بصدهم)،و(عن سبيل الله)إعرابهما واضح. كثيراً:صفة لمصدر محذوف والتقدير:صدّاً كثيراً. **الشاهد فيها**:(بظلمٍ،وبصدّهم)حيث تضمّن حرف الجر (الباء) معنى السببية.

[2] ئەم فەرموودەیە هەریەك لە پێشەوا بخاری ومسلم وغەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان كردووە،كورتەی ماناكەی:ئافرەتێك چۆیە دۆزەخەوە–واتا:دەچێ وئەمەش بۆ بەهێزكردن(توكيد)ە–بە هۆی پشیلەیەك كە بەندی كردبوو،نە خواردنی دەدایە،وە نە بەڕەڵای دەكرد لە ڕووەك وجانەوەری زەوی بخوا. **إعرابەكەی**:دخلتْ امرأةٌ النارَ:فعل وفاعل ومفعول به. في النار:جارومجرور متعلقان بـ(دخلت).حبستْها:فعل وفاعل ومفعول به،والجمَلة الفعلية في محل جر صفة لهرة. فلا:فـ:حرف استئناف،لا:نافية غير عاملة. هي:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدأ. أطعمتها:فعل وفاعل ومفعول،والجملة الفعلية في محل رفع خبر. و(لا هي تركتْها)مثل لاهي أطعمتها،وهي معطوفة عليها. تأكلُ:فعل وفاعل،والجملة في محل نصب حال من الضمير الهاء في(تركتها). **الشاهد فيه**:(في هرّة)حيث تضمنت(في)معنى السببية،والتقدير: دخلت امرأة النار بسبب هرة حبستها.

## * ماناكانى حەرف جەڕى (با)

٣٧٤- بِالْبَا اسْتَعِنْ،وَعَدِّ،عَوِّضْ ،أَلْصِقِ وَمِثْلَ مَعْ،وَمِنْ، وَعَنْ بِهَا انْطِقِ[١]

پێشتر ڕابورد كه حەرفی(با)بۆ لەناوبوون وهۆبوون بەكاردێ،وه لێرەدا باسی ئەوه دەكات كه بۆ يارمەتی وەرگرتن(استعانه)دێ،وەكو((كتبتُ بالقلمِ، وقَطَعْتُ اللحمَ بالسَّكِّينِ))،وه بۆ تێپەڕ پێكردن،وەكو((ذهبتُ بزيدٍ))،وه وەكو فەرموودەی خوای گەوره:﴿ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ﴾[٢]، هەروەها بۆ بری وجياتی،وەكو:((اشتريتُ الفرسَ بألفِ دِرهمٍ))،وه وەكو فەرموودەی خوای گەوره﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ﴾[٣]،وه بۆ پێوه لكان،وەكو((مررتُ بزيدٍ))،وه بەمانای(مع)[٤]،وەكو((بعتك الثوب بِطِرَازِه))[٥]،واتا:لەگەڵ ،هەروەها بەمانای حەرفی(من)یش بەكاردێ،وەكو

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيه:حەرفی(با)بەكار دێ بۆ يارمەتی وەرگرتن(استعانه)،وه بۆ تێپەڕپێكردنی فعلی تێنەپەڕ-واتا:فعلی لازم دەكاته متعدی-،وه بۆبری وجياتی، وه بۆ پێوه لكان.

[٢] بەشێكه له ئايەتی ژماره(١٧)ی سورەتی(البقرة)،كورتەی ماناكەی:خوای گەوره ڕوناكييەكايانی-لەدووڕووەكان-لێ سەندەوه.إعرابەكەی:ذهب الله:فعل وفاعل.بنورهم: اروجرور متعلقان بـ(ذهب) .وهم:في محل جر مضاف إليه. **الشاهد فيها:**(بنورهم)حيث جاء حرف الباء للتعدية.

[٣] بەشێكه له ئايەتی ژماره(٨٦)ی سورەتی(البقرة)،كورتەی ماناكەی:ئەمانه-واتا:جوولەكه-ئەوانەن كه ژيانی دونيايان كڕی به دوا ڕۆژ. إعرابەكەی:أولئك:اسم إشارة مبني في محل رفع مبتدأ. الذين:اسم موصول مبني في محل رفع خبر. اشتروا:فعل وفاعل،وجملة(اشتروا)صلة الموصول. الحياةَ:مفعول به. الدنيا:نعت منصوب وعلامة نصبه الفتحة المقدرة على الألف للتعذر.بالآخرة:جاروجرور متعلقان بـ(اشتروا). **الشاهد فيها:**(بالاخرة)،فالباء هنا تدل على التعويض.

[٤] واتا:لەگەڵدا بوون(المصاحبة).

[٥] واتا:پۆشاكەكەم پێت فرۆشت به شێواز و شیرەكەيەوه.

ووتەی:* شَرِبْنَ بِمَاءِ البَحْرِ[١]*واتا:من ماء البحر،هەروەها حەرفی((با))بەمانای ((عـن))بـەکاردێ،وەکو فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿سَـأَلَ سَـائِلٌ بِعَـذَابٍ وَاقِعٍ﴾[٢]،واتـا:عـن عـذاب، هـەروەها بـە مانـای لەگەڵدابوون دێ،وەکو﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ...﴾[٣]واتا: مصاحباً حمدَ ربِّك.

*　　*　　*

٣٧٥- عَلَى لِلاسْتِعْلاَ وَمَعْنَى(فِى)وَ(عَنْ)　　بِعَنْ تَجَاوُزاً عَنَى مَنْ قَدْ فَطَنْ

٣٧٦-وَقَـدْ تَجِى مَوْضِعَ(بَعْدٍ) وَ(عَلَى )　　كَمَا عَلَى مَوْضِعَ عَنْ قَدْ جُعِلاَ[٤]

بەکاردێ حەرفی(علی)بۆ بەرزی ولەسەربوون،وەکو((زیدٌ علی السطحِ))[٥]،وە بە مانـای(فی)بـەکاردێ،وەکو فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ

---

[١] پێشتر ئەم ڕستەیەمان لە شەرح وڕاڤەی شاهدی ژمارە(١٩٨)دا ڕوون کرایەوە.

[٢] ئایەتی ژمارە(١)ی سورەتی(المعارج)،کورتەی ماناکەی:داواکارێك داوای سزایەکی(خوایی)کرد کە ئەو سزایە هەر ڕوودەدات. **إعرابەکەی**:سألَ:فعل ماضي.سائلٌ: فاعل. بعذابٍ:جارومجرور متعلقان بــ(سأل). واقعٍ:نعت مجرور. **الشاهد فيها**:(بعذابٍ)الباء هنا بمعنى عن لأنّ الفعل سأل تضمَّن معنى دعا.

[٣] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٩٨)ی سورەتی(الحجر)،کورتەی ماناکەی:هەمیشە تەسبیحاتی پەروەردگارت بکە لەگەڵ ستایش کردنی. **إعرابەکەی**:فـ:حسب ما قبلها.سبحْ:فعل أمر مبني على السكون،وفاعله:ضمير مستتر تقديره(أنت). بحمدِ:جارومجرور متعلقان بــ(سبح)،وحمد مضاف.ربِّك:مضاف إليه،وربّ مضاف،وضمير(ك)في محل جر مضاف إليه. **الشاهد فيها**:(بحمد)حيث افادت الباء المصاحبة،والمعنى فسبح مصاحباً حمد ربِّك.

[٤] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٧٥-حەرفی(علی)بۆ بەرزی ولەسەربوون بەکار دێ وە بە مانای(فی)و(عن)یش بەکاردێ،وە حەرفی(عن)بۆ مانای تێپەڕبوون ودوورکەوتنەوە بەکاردێ.٣٧٦-وە هەندێ جار((عن))بە مانای لەپاش وهەندێ جاریش بەمانای(علی)بەکاردێ،هەروەکو چۆن(علی)بە مانای(عن) دانراوە وبەکارهاتووە.

[٥] واتا:زید لەسەر بانەکەیە.

غَفْلَةٍ مِنْ أَهْلِهَا...﴾[١] واتــا: في حــين. وە بــەكاردێ حــەرف(عــن)بــۆ تێپەڕانــدن ودوورکەوتنەوە بەزۆری،وەکو((رميتُ السَّهمَ عن القوس))،وە بە مانای لە پاش بەکاردێ وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَنْ طَبَقٍ﴾[٢] واتا: بَعْدَ طبقٍ، هەروەها عن بە مانای(على)بەکاردێ،وەکو ووتەی:

٢٠٨- لَاهِ ابنُ عَمِّكَ لاَ أَفْضَلْتَ في حَسَبٍ عَنِّي ولا أَنْتَ دَيَّانِي فَتَخْزُونِي[٣]

واتــا: لاَ أَفْضَلْتَ في حَسَبٍ عليَّ. هــەروەکو چــۆن حــەرفی(علــى)بــە مانــای (عن)بەکارهاتووە لە ووتەی:

---

[١] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١٥)ی سورەتی(القصص)،کورتەی ماناکەی:-پێغەمبەر موسى عليه السلام-ڕۆشتە ناوشار لەکاتی بێئاگای خەڵکەکەی. إعرابەکەی: دخل:فعل ماض،وفاعله:ضمير مستتر تقديره(هو).المدينة:مفعول به. على حينِ:جارومجرور،وحينِ مضاف،غفلةٍ:مضاف إليه. وشبه الجملة(على حين)في محل نصب حال من الفاعل المستتر في(دخل)،والتقدير:دخل مختلساً. من أهلها:جارومجرور وهما في محل جر نعت لــ(غفلة). الشاهدفيها:(على حين)حيث جاءت على بمعنى في.

[٢] ئایەتی(١٩)ی سورەتی(الانشقاق)،پوختەی ماناکەی:سوێند بێ ئێوە تێدەپەڕن وڕووبەڕوو دەبنەوە حاڵەت پاش حاڵەت. إعرابەکەی:لتركبُنَّ:لـَ:واقعة في جواب القسم. تركبُنّ:فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه النون المحذوفة لتوالي الأمثال،والواو المحذوفة لالتقاء الساكنين ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل،والأصل(لتركبون+نَّ). طبقاً:مفعول به،وقيل:حال منصوب. عن طبقٍ:جارومجرور متعلقان بمحذوف حال،والتقدير:طبقاً حاصلا بعد طبق. موضع الشاهد:(عن طبقٍ)حيث استعمل (عن) للمجاوزة.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ڕەحمەت لە کوڕی مامت!کە بەڕاستی پیاوەوخاوەن چاکەوپیاوەتیە،بەڵام تۆ ئەوە نیت وەکو ئەو تا خۆت فەرزکەی بەسەرمدا وخۆت لەمن بەچاکتر بزانی،وە تۆ خاوەن کاروباری من نیت تا سەرشۆڕم کەی. بەڵگەکەی:(عَنِّي..)لێرەدا حەرفی(عن)بە مانای(على)بەکارهاتووە.

٢٠٩- إِذَا رَضِيَتْ عَلَيَّ بَنُو قُشَيْرٍ لَعَمْرُ اللهِ أَعْجَبَنِي رِضَاهَا[1]

واتا: رَضِيَتْ عَنِّي.

* * *

***ماناكانی حەرفی(كاف):**

٣٧٧- شَبِّهْ بِكَافٍ وَبِهَا التَّعْلِيلُ قَدْ يُعْنَى، وَزَائِداً لِتَوْكِيدٍ وَرَدْ[2]

**حەرفی(كاف)بەكاردێ بەزۆری بۆ لێكچواندن،وەكو((زيدٌ كالأسدِ))،وە هەندێ جار بۆ مانای هۆ بەكاردێ،وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿..وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ..﴾[3]، وەهەندێ جاریش زیاددەكرێ بۆ بەهێزكردن،ئەم ئایەتەش بۆ ئەم مانایە هێنراوەتەوە﴿..لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ..﴾[4]،واتا: ليس مثلَهُ شيءٌ، هەروەها وەكووتەی رؤبة:**

---

[1] **ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: ئەگەر بنەماڵەی(قُشير)لێم رازی بن ئەوە بێگومان سوێند بەخوا ئەم رازی بوونەم زۆر پێخۆشە.بەڵگەكەی:( عَلَيَّ..)لێرەداحەرفی(على)بە مانای حەرفی(عن)بەكارهاتووە.**

[2] **پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:حەرفی جەڕی (كاف) بەكاردێ بۆ لێكچواندن(تشبيه)، وە بۆ هۆبوون،وە زیادكراو بۆ بەهێزكردن.**

[3] **بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١٩٨)ی سورەتی(البقرة)،كورتەی ماناكەی:هەمیشە یادی خوا بكەن لەبەرئەوەی رێنموییای كردن. إعرابەكەی:**و:حسب ماقبلها. اذكروه:فعل وفاعل ومفعول به. كما:جارومجرور وهما في محل نصب نعت لمصدر محذوف تقديره:(ذكرا حسناً)،أو هما في محل نصب حال من الفاعل في(اذكروه). هداكم: فعل وفاعل ومفعول به. وجملة(هداكم)لامحل لها من الاعراب لوقوعها بعد حرف موصولي. **الشاهدفيها:(كما)الكاف هنا للتعليل،اي:اذكروا اللهَ لهدايتكم.**

[4] **بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١١)ی سورەتی(الشورى)،كورتەی ماناكەی:هیچ شتێك بە وێنەی خوا نیە،وخوای گەورە هاو شێوەی نیە. إعرابەكەی:**ليسَ:فعل ماض ناقص جامد. كمثلِه: كـ:حرف جر زائد،ومثلِ:اسم مجرور لفظا منصوب محلا على أنه خبر ليس مقدم. شيءٌ:اسم ليس مؤخر مرفوع. **الشاهدفيها:(كمثله)حيث جاءت الكاف زائدة للتوكيد، والتقدير:ليس مثلَهُ شيءٌ.**

٢١٠- *لَوَاحِقُ الأَقْرَابِ فيها كَالْمَقَقْ*[١] واتا:فيها المقق. هەروەها پێشەوا فەڕا گێڕاوێتیەوە کە بە هەندێ لەعەرەب وتراوە:چۆن کەشك دروست دەکەن؟ ئەویش لە وەلآمدا وتی:(کهين)واتا:(هيناً) بەسانای.

***ئەو حەرفانەی کە هەندێ جار وەکو ناو بەکاردێن:**

٣٧٨-وَاسْتُعْمِلَ اسْماً وَكَذَا(عَنْ)وَ(عَلَى) مِنْ أَجْلِ ذَا عَلَيْهِمَا مِنْ دَخَلاَ[٢]

کاف بەکاردێ وەکو ناو بەکەمی،وەکو ووتەی:

٢١١-أَتَنْتَهُونَ ولَنْ يَنْهَى ذَوِى شَطَطٍ كالطَّعْنِ يَذْهَبُ فيه الزَّيْتُ والفُتُلُ[٣]

لێرەدا کاف:ناوە ومرفوعە وفاعلە،وعاملەکەی بریتیە لە فعلی(ينهى)، وتقديرەکەی: ولن ينهى ذوى شططٍ مِثْلُ الطّعنِ.

هەروەها((على،وعن))بەکارهاتوون وەکو ناو کاتێك حەرفی((من))بچێتە سەریان،لەم کاتەدا((على))بەمانای لەسەر((فوق))دێ،و((عن))یش بەمانای تەنیشت((جانب))دێ،وەکو ووتەی:

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم نیو دێڕە:-وەصفی ئەسپ دەکات،هەندێکیش دەڵێن وەصفی ماکەر دەکات-ئەم ئەسپانە ورگیان نیە وقەد باریك وبالآ بەرزن وبەهێزن ودرەنگ ماندوو دەبن. **بەڵگەکەی**:(كَالْمَقَقْ) لێرەدا حەرفی کاف زیاکراوە.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەندێ جار کاف وەکو ناو بەکاردێ هەروەها(عن)و(على)یش هەندێ جار وەکو ناو بەکاردێن،لەبەر ئەوە حەرفی(من)دەچێتە سەریان.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئایە ئێوە دەست هەڵدەگرن وواز دێنن لەکاتێکدا ستەمکارەکان دەست هەڵناگرن و وازناهێنن وەکو برین کە سەردەکێشێ بۆ ناخی مرۆڤ ودەرمان وچارەسەرەکەش لەناودەبا. **بەڵگەکەی**:(كالطَّعْنِ)لێرەدا کاف وەکو ناو بەکارهاتووە وبەمانای(مثْلُ)-کە ناوە- هاتووە و بۆتە فاعل بۆ فعلی ينهى.

٢١٢- غَدَتْ مِنْ عليهِ بعَد ما تَمَّ ظِمْؤُها تَصِلُّ وعَنْ قَيْضٍ بِزَيْزَاءَ مَجْهَلِ[(١)]

واتا: غدتْ من فوقه. وە وەکو ووتەی:

٢١٣- ولَقَدْ أَرَانِي لِلرِّمَاحِ دَرِيئَةً مِنْ عَنْ يَمِينِي تَارَةً وأَمَامِي[(٢)]

* * *

---

[(١)] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:ئەو قەتێیە-جۆرە باڵندەیەکە-هەستا لەسەر بێچووەکەی دوای ماوەیەکی زۆر لە خۆڕاگری بۆ ئاو،لەکاتێکدا لەناخەوە سووتابوو بۆئاو،وە بێچووەکانی جێ هێلاً لە شوێنێکی کاکی بەکاکی بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی لێ بێ. بەڵگەکەی:(مِنْ عليهِ..)لێرەدا علی وەکو ناو وبەمانای(فوق)بەکار هاتووە،بەبەڵگەی ئەوەی کە حەرفی جەڕی(من)لەپێشیوە هاتووە.

[(٢)] ماناوبەڵگەی ئەم دێرەش:من دەبینی بۆ هەموو ڕم وتیرێك قەڵغانم لە لای ڕست ولە پێشمەوە.مەبەستی ئەوەیە لە جەنگدا ئازاو دلێرە وناترسێ. بەڵگەکەی:( مِنْ عَنْ..) لێرەدا عن وەکو ناو وبەمانای(جهة وجانب)بەکار هاتووە،بەبەڵگەی ئەوەی کە حەرفی جەڕی(من)لەپێشیوە هاتووە.

***باسی((مُذْ ومنذُ)):**

٣٧٩- وَمُذْ وَمُنْذُ اسْمَانِ حَيْثُ رَفَعَا     أَوْ أُوْلِيَـا الفِعْـلَ كَ(جئتُ مُذْ دَعَا)

٣٨٠-وَإنْ يَجُرَّا فى مُضِيٍّ فَكَمِـنْ     هُمَا وَفى الحُضُورِ مَعْنَى فى اسْتَبِنْ[1]

**هەر یەك لە((مُذ،ومنذُ))وەکو ناو یەکاردێن ئەگەر لەپاشیان ناوێکی مرفوع هات،یان فعل هات،نموونەی یەکەم((ما رأیتُهُ مُذ یومُ الجمعة))یان((مُذْ شهرُنا))لێرەدا((مُذْ)):ناوە ومبتدایە وناوەکەی پاشی دەبێتە خبری،هەروەها((مُنذ))، وەهەندێ لەزانایان بەدروستی دەزانن ببنە خبر وپاشیان مبتدا بێ. وەنموونەی دووەم[2]((جئتُ مُذْ دَعَا))لێرەدا((مُذْ))دەبێتە ناوێکی منصوب علی الظرفیة[3] وعاملەکەی فعلی((جئتُ))ە.**

**وە ئەگەر لەپاشیان ناوی مجرور هات ئەوە دەبنە حرفی جەڕ وبەمانای((مِنْ)) دێ ئەگەر مانای ڕستەکە ڕابردوو بوو،وەکو((ما رأیته مذ یومِ الجمعة))واتا:مِنْ یومِ الجمعة، وە بەمانای((فی))دێن ئەگەر مانای ڕستەکە بۆ ئێستا ((حاضر))بوو،وەکو((ما رأیتهُ مذیومِنا))واتا:فی یومنا.**

*   *   *

---

**[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە: ٣٧٩-هەر یەك لە((مُذ،ومنذُ))دەبنە ناو ئەگەر لە پاشیان ناوێکی مرفوع هات،یان فعل هات وەکو((جئتُ مُذْ دَعَا)).٣٨٠-وە ئەگەر لەپاشیان ناوێکی مجرور هات ئەوە دەبنە حەرفی جەڕ،وئەگەر ڕابردوو بوو ئەوە بەمانای((من))دێن،وە ئەگەر بۆ ئێستا بوو ئەوە بەمانای((فی))دێن.**

**[2] واتا:نموونەی ئەوەی لە پاشیان فعل هاتبێ.**

**[3] واتا:دەبێتە مفعول فیە.**

***زیادکردنی((ما))لە پاش حەرفی((من وعن وبا))؛**

٣٨١–وَبَعْدَ(مِنْ وعَنْ وبَاءٍ) زِيدَ(مَا) فَلَمْ يَعُقْ عَنْ عَمَلٍ قَدْ عُلِمَا[1]

**زیاد دەکرێ((ما))لە پاش((من وعن وبا))بەبێ ئەوەی لە کاریان بخا،وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا..﴾[2]،وە فەرموودەی خوای گەورە﴿..عَمَّا قَلِيلٍ لَيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ﴾[3]،وەفەرموودەی خوای گەورە﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللهِ لِنْتَ لَهُمْ..﴾[4]**

---

(1) **پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:لەپاش هەریەك لە(من وعن وبا)زیاددەكرێ((ما))بەبێ ئەوەی رێگەی عەمەل كردنیان–كە مجرووركردنی ناوەكەی پاشیانە–بگرێ.**

(2) **بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٢٥)ی سورەتی(نوح)،كورتەی ماناكەی:بەهۆی گوناهەكانیانەوە خنكێنران وتیاچوون. إعرابەكەی:**مِمّا:أصلها مِنْ ما،منْ:حرف جر.ما:حرف زائد للتوكيد.خطيئاتِ:اسم مجرور بمنْ،وهو مضاف.هِمْ:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه، والجار والمجرور متعلقان بـ(أُغرقوا). أُغرقوا:فعل ماضي مبني للمجهول،وواوالجماعة:ضمير متصل مبني في محل رفع نائب فاعل. **الشاهد فيها:(ممّا خطيئاتهم)حيث زيدت(ما)على(منْ)الجارة ولم تكفها عن العمل،فبقيت (خطيئاتِ)مجرورة بِمنْ ولوفصلت بينهما(ما)الزائدة.**

(3) **بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٤٠)ی سورەتی(المؤمنون)،كورتەی ماناكەی:خوا فەرمووی لە ماوەیەكی زۆركەمدا بێگومان پەشیمان دەبنەوە. إعرابەكەی:**عمّا:أصلها عنْ ما،عنْ:حرف جر.ما:حرف زائد للتوكيد.قليلٍ:اسم مجروربعنْ،والجاروالمجرور متعلقان بـ(يُصبحنَّ). لَيُصبحُنَّ:لـ:اللام موطئة للقسم، يُصبحُنَّ:فعل مضارع ناقص مرفوع وعلامة رفعه النون المحذوفة لتوالي الأمثال،والأصل(يُصبحونَنَّ)،والواو المحذوفة لالتقاء الساكنين في محل رفع اسم يُصبح. نادمين:خبر يصبح منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه جمع مذكر سالم. **الشاهد فيها:(عمّا قليل)حيث زيدت(ما)بعد(عن)ولم تكفها عن العمل فجرّتْ(قليلٍ).**

(4) **بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١٥٩)ی سورەتی(آل عمران)،كورتەی ماناكەی:بەهۆی بەزەیی خواوەیە تۆ–ئەی ﷺ–بۆ ئەوان نەرم ونیان بووی. إعرابەكەی: فـ:**حسب ماقبلها. بـ:حرف جر.ما:زائدة للتوكيد. رحمةٍ:اسم مجرور بالباء،والجاروالمجرور متعلقان بـ(لِنتَ). من اللهِ:جارومجرور متعلقان بمحذوف صفة لرحمةٍ. لِنتَ:فعل وفاعل. لهمْ: الجاروالمجرور متعلقان بـ(لِنتَ). **موضع الشاهد:زيادة(ما)بعد الباء وعدم كفها عن العمل،وهذا مذهب اكثر النحاة.**

*** زيادكردنی((ما))له پاش حەرفی((رُبَّ،وكاف))؛**

٣٨٢- وَزِيدَ بَعْدَ رُبَّ وَالكَافِ فَكَفّْ وَقَدْ تَلِيهِمَا وَجَرٌّ لَمْ يُكَفّْ[١]

زياد دەكریٚ(ما)لەپاش حەرفی(كاف،و رُبَّ)ولەكاريان دەخات،وەكو ووتەی:

٢١٤- فإنَّ الْحُمْرَ مِنْ شرِّ الْمَطَايَا كَما الْحَبِطَاتُ شَرُّ بَنِي تَمِيمِ[٢]

وە ووتەی:

٢١٥- رُبَّمَا الْجَامِلُ الْمؤَبَّلُ فِيهِمْ وعَنَاجِيجُ بَيْنَهُنَّ الْمِهَارُ[٣]

وە هەندیٚ جاريش زياددەكریٚ ولە كاريان ناخات،وئەمەش كەمە،وەكو ووتەی:

٢١٦- مَاوِيَّ يَارُبَّتَمَا غَـارَةٍ شَعْوَاءَ كَاللَّذْعَةِ بِالْمَيْسَمِ[٤]

---

[١] پوختەی مانای ئەم دیٚرەی ئەلفيە:زياد دەكریٚ(ما)لەپاش حەرفی(رُبَّ،وكاف) ولەكاريان دەخات-واتا:ناوەكەی پاشيان مجرور ناكەن-،وەكەم جاريش دەكریٚ لە كاريان بخات.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرە:بیٚگومان گویٚدریٚژ خراپترينی سوارييە،هەروەكو چۆن حبطات-كە سيفەتە بۆ بنەماڵەيەك لە بنو تميم-خراپترينی نەوەی تميمن. **بەڵگەكەی**:(كَما الْحَبِطَاتُ..)ليٚرەدا(ما)زيادكراوە لەپاش حەرفی جەڕی(كـ)ولەكاری خستووە،وناوەكەی پاشی كە(الْحَبِطَاتُ)ە مرفوعە ومجرور نيە.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرە:زۆرجار دەبينی لە ناو قەومەكەمدا میٚگەلە ووشتری ئامادەكراو بۆ ميوان،وە ئەسپی بەرزی بەقيمەت لە گەڵ جوانووەكانيان.-مەبەستی ئەوەيە سەخیٚن وماڵی چاك و بەنرخ دەخشن. **بەڵگەكەی**:( رُبَّمَا الْجَامِلُ..) ليٚرەدا(ما) زيادكراوە لەپاش حەرفی جەڕی(رُبَّ)ولەكاری خستووە،وناوەكەی پاشی كە(الْجَامِلُ)ە مرفوعە ومجرور نيە.

[٤] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرەش:ئەی ماويە-ناوی ئافرەتیٚكە-هەندیٚ جار هیٚرش وهەڵمەتی دوژمن دیٚ بە پەرت وبڵاوی،وژيان تیٚك دەدات وكاريگەری دروست دەكات وەكو كاريگەری داخ كردن ونيشان كردنی ووشتر بەئاگر. **بەڵگەكەی**:( رُبَّتَمَا غَارَةٍ..) ليٚرەدا(ما)زيادكراوە لەپاش حەرفی جەڕی(رُبَّ)ولەكاری نەخستووە،وناوەكەی پاشی كە(غارةٍ)ە مجرور كردووە.

وه ووتەی:

٢١٧- ونَنْصُرُ مَوْلاَنَا ونَعْلَمُ أنَّهُ كَمَا النَّاسِ مَجْرُومٌ عليهِ وجَارِمُ(١)

* * *

***حذفكردنی حەرفی جەڕی( رُبَّ )ومانەوەی عەمەلەكەی:**

٣٨٣- وَحُذِفَتْ رُبَّ فَجَرَّتْ بَعْدَ بَلْ وَالْفَا وَبَعْدَ الوَاوِ شَاعَ ذَا الْعَمَلْ(٢).

دروست نیە حذف كردنی حەرفی جەڕ وهێشتنەوەی عەمەلەكەی،جگە لە حەرفی((رُبّ))كە بكەوێتە پاش واو،وە جگە لەوەی لەمەو دوا باسی دەكەین،هەروەها هاتووە حذف كردنی دوای حەرفی(فا)و(بل)بە كەمی،جا نموونەی حذفكردنی لە پاش واو ووتەی:* وقَاتِمِ الأَعْمَاقِ خَاوِي المخْتَرَقْن(٣)

وەنموونەی حذف كردنی(رُبّ)لە پاش حەرفی(فا) ووتەی:

٢١٨- فَمِثْلِكِ حُبْلَى قَدْ طَرَقْتُ ومُرْضِعٍ فَأَلْهَيْتُها عنْ ذِی تَمَائِمَ مُحْوِلِ(٤)

---

(١) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:بێگومان ئێمە دۆست وهاوپەیمانی خۆمان سەردەخەین،لەكاتێكدای دەزانین وەكو سەرجەم مرۆڤەكان تاوان دەكات و تاوانیشی بەرامبەر دەكرێ. بەڵگەكەی:( كَمَا النَّاسِ..) لێرەدا(ما)زیادكراوە لەپاش حەرفی جەڕی(ك)ولەكاری نەخستووە،وناوەكەی پاشی كە(النَّاسِ)ـە مجرور كردووە.

(٢) پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:حەرفی(رُبّ)حذف دەكرێ وعەمەلەكەی-كەمجروركردنی ناوەكەی پاشێتی-دەمێنێ لە پاش حەرفی(بل)یان حەرفی(فا)،وە لەپاش حەرفی(واو)ئەمە زۆرە.

(٣) پێشتر لە شەرح وڕاڤەی شاهدی ژمارە(٣)ئەم دێرە شعرەمان مانا كرد،وە بەڵگەكەی بۆ ئێرە:(( وقَاتِمِ..))لێرەدا مجرورە بە حەرفی(رُبّ)كە حذف كراوە لە پاش واو.

(٤) ماناوبەڵگەی ئەم دێرەی امرؤ القيس:چەندجار ئافرەتی وەكو تۆ-ئەی عونیزە كە خۆشەویستەكەیەتی- كە سك پڕبووە یان شیردەر بووەچوومەتە لای بێ ئاگایم كردووە لە كۆرپەكەی كە نووشتەی لەملدا بووە. بەڵگەكەی:( مِثْلِكِ..) مجرورە بە

وەنموونەی حذف کردنی(رُبَّ)لە پاش حەرفی(بل)ووتەی:

٢١٩- بَلْ بَلَدٍ مِلْءُ الفِجَاجِ قَتَمُهْ لا يُشْتَرَى كَتَّانُهُ وجَهْرَمُهْ[١]

جا ئەوەی کە زۆروباوە ئەوەیە کە(رُبَّ)حذف دەکریٚ لە پاش حەرفی واو،وە کەم جاریش هاتووە مجرورکردن بە(رُبَّ)ـی حذف کراو بەبیٚ ئەوەی هیچ کام لەوانەی باسمان کرد[٢] لە پیٚشیٚوە بیٚ،وەکو ووتەی:

٢٢٠- رَسْمِ دارٍ وَقَفْـتُ فى طَلَلِهْ كِدْتُ أَقْضِي الحيَاةَ مِنْ جَلَلِهْ[٣]

* * *

٣٨٤- وَقَدْ يُجَرُّ بِسِوَى رُبَّ لَدَى حَذْفٍ، وَبَعْضُهُ يُرَى مُطَّرِدَا[٤]

مجـرور کردنـی نـاو بەحـەرفی جـەڕی حـذف کـراو جگـە لـە((رُبَّ))دوو جـۆرە: قیاسـی،وسماعی.سمـاعی وەکـو ووتـەی رؤبـة بـەو کەسـەی پیٚـی ووت:((کیف أَصبحتَ؟)):(( خيرٍ والحمدُ للهِ))،تقدیرەکەی:علی خيرٍ، وە وەکو ووتەی شاعر:

٢٢١- إذا قِيلَ أيُّ النَّاسِ شَرُّ قَبِيلةٍ؟ أَشَارَتْ كُلَيْبٍ بالأَكُفِّ الأَصَابِعُ[٥]

---

حەرفی جەڕی(رُبَّ)ـی حذفکراو لە پاش حەرفی(فا).ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرەی امرؤ القيس:چەندجار ئافرەتی وەکو تۆ-ئەی عونیزە کە

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرە:چەند جار تیٚپەڕبووم بەلای شاری(جهرم)و نەچوومەتە ناوی لەبەر ئەوەی تەپ وتۆزی زۆرە بەشیٚوەیەك لەبەر تەپ وتۆز ناتوانریٚ کەتان وفەرشی بکڕدریٚ. بەڵگەکەی:( بَلْ بَلَدٍ)لیٚرەدا بلدٍ مجرورە بە حەرفی جەڕی(رُبَّ)ـی حذفکراو لە پاش حەرفی(بل).

[٢] مەبەست هەرسیٚ حەرفی(واو وفا ورُبَّ).

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚرەش:زۆرجاروەستاوم لەسەر کەلاوەوشویٚنەواری خۆشەویستەکەم ،کە نزیك بووە رۆحم بۆی دەرچیٚ. بەڵگەکەی:(رَسْمِ..)مجرورە بە حەرفی جەڕی(رُبَّ)ـی حذفکراو بیٚ ئەوەی هیچ کام لە حەرفەکانی(واو،فا،رُبَّ)ـی لە پیٚشەوە بیٚ،ئەمەش کەمەوشاذە.

[٤] پوختەی مانای ئەم دیٚرەی ئەلفیە:کەم جار ناویٚك مجرور بیٚ بە حەرفە جەڕیٚکی حذفکراو جگە لە(رُبَّ)،هەندیٚ جاریش ئەمە قیاسییە.

واتا: أشارت إلى كُليبٍ.

وە وەکو ووتەی:

٢٢٢- وكريمةٍ مِنْ آلِ قَيسَ أَلَفْتُهُ      حَتَّى تَبَذَّخَ فَارْتَقَى الأَعْلَامِ[1]

واتا: فارتقى إلى الأعلامِ. وەنموونەی قیاسی وەکو: ((بِكَمْ درهمٍ اشتريتَ هذا؟))لێرەدا درهمٍ: مجرورە بە حەرفی جەڕی(من)ی حذفکراو بە بۆچوونی پێشەوا سیبویە وخلیلی مامۆستای، وە بەبۆچوونی پێشەوا زجاج مجرورە بە هۆی إضافەوە، کەواتا بەپێی بۆچوونی سیبویە وخلیل حەرفە جەڕەکە حذفکراوەو عەمەلەکەی ماوەتەوە، ئەمەش قیاسیە بەبۆچوونی ئەو دوو زانایە لە جیاکراوە((مُمين))ی((کم))ی پرسیارکردن کاتێ حەرفی جەڕ چۆیە سەری.

***لێرەدا بابەتی حەرفە جەڕەکان کۆتای هات.**

---

(٥) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: گەر بوترێ: کام خەڵکی خراپترین هۆزن؟ ئەوە ئاماژە دەکەن خەڵکی بۆ هۆزی کُلیب بە پەنجەکانی دەست. بەڵگەکەی:( أَشَارَتْ كُلَيْبٍ..)ناوی کُلیب مجرورە بە حەرفی جەڕی(من)ی حذفکراو، ئەمەش سماعیە ویاسای نیە وکەمە لە زمانی عەرەبیدا.

(١) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: چەند جار پیاوی زۆر بەرێز لە بنەماڵەی قەیس هەزار دینارم پێداوە لەبەر هەژاری تا گەورە بووە وبووە بە دەسەڵاتدار. بەڵگەکەی:( الأَعْلَامِ)مجرورە بەحەرفی جەڕی(إلى)ی حذفکراو، ئەمەش سماعیە ویاسای نیەوکەمە لە زمانی عەرەبیدا.

## إضافە[1]

٣٨٥-نُـوناً تَلِي الإِعْرَابَ أَوْتَنْوِينَـا ... مِمَّا تُضِيفُ احْذِفْ كَطُورِ سِينَا
٣٨٦-وَالثَّانِي اجْرُرْ وَانْوِ مِنْ أَوْ فى إِذَا ... لَمْ يَصْلُحِ إِلاَّ ذَاكَ وَاللاَّمَ خُـذَا
٣٨٧-لِمَا سِوَى ذَيْنِكَ وَاخْصُـصْ أَوَّلاَ ... أَوْ أَعْطِهِ التَّعْرِيفَ بِالَّذِى تَـلاَ[2]

**ئەگەر ویسترا ناوێك پاڵدرێ بۆ لای ناوێكی تر ئەوە حذف دەكرێ لەناوی یەكەم نونی إعراب-كە بریتیە لە نونی تثنیة ونوني جمعی مذكری سالم،وهەروەها پاشكۆكانیان(ملحقاتهما)-،یان تنوین،وەناوی دووەمیش (مضاف إليە)مجرور دەبێ،كەوابوو دەڵێی:(( هذانِ غلاما زيدٍ، وهؤلاء بنُوهُ، وهذا صاحِبُهُ))[3]**

---

[1] إضافە واتا:پاڵدانی ناوێك بۆ لای ناوێكی تر،بەیەكەمیان دەوترێ(مضاف) وبەدووەمیش(مضاف إليە)،ناوی یەكەم بەپێی شوێنی لە ڕستە (حسب موقعە من الجملة)إعراب دەكرێ،وناوی دووەمیش هەمیشە مجرورە.

[2] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە: ٣٨٥-ئەو ناوەی إضافە دەكرێ ئەگەر كۆتاییەكەی نونی إعراب بوو-مەبەست نونی تثنیة ونوني جمعی مذكری سالمە-،یان تنوین بوو ئەوە لەكاتی إضافە كردندا نونەكەو تنوینەكە حذف بكە،وەكو نموونەی(طُورِسِينَا)كە تنوینی ناوی(طُورِ)حذفكراوە. ٣٨٦-وە ناوی دووەمیش-واتا:مضاف إليە-مجرور بكە وحەرفی جەڕی(من)یان(فی)مقدر بكە ئەگەر نەدەگونجا جگە لەم دوو حەرفە،یان حەرفی جەڕی لام دانە.٣٨٧-ئەگەر حەرفی(من)و(فی)نەدەگونجا،وە ناوی یەكەم تایبەت دەكرێ بەهۆی ناوی دووەم ئەگەر ناوی دووەم نەناسراو بوو، یان دەبێتە ناسراو ئەگەر ناوی دووەم ناسراو بوو.

[3] ئەم سێ ڕستەیە نموونەیە بۆ هەرسێ حاڵەتەكە، لەیەكەمیاندا((هذانِ غلاما زيدٍ))غُلامان مثنایە إضافەكراوە بۆ بۆلای(زيدٍ)بۆیە نونەكەی حذفكراوە،وە لەدووەمدا((وهؤلاء بنُوهُ))ناوی بنون-كە ملحقی جمعی مذكری سالمە- إضافەكراوە بۆ بۆلای جێناوی(هُ) نونەكەی حذفكراوە،وە لەڕستەی سێیەمدا((وهذا صاحِبُهُ))ناوی صاحبٌ إضافەكراوە بۆ بۆلای جێناوی(هُ) تنوینەكەی حذفكراوە.

وە ڕاو بۆچوونی جودا هەیە لە عاملی(مضاف إلیه)،ووتراوە:مجرورە بە حرفێكی مقدر–كە بریتیە لە حەرفی لام،یان(من)،یان(في)،وە ووتراوە:مجرورە بە مضافەكە ئەم بۆچوونەش لەهەموو بۆچوونەكان ڕاسترە.

پاشان پاڵدانەكە بەمانای حەرفی لام دێ لای هەموو زانایانی ڕێزمانی عەرەبی،وەهەندێكیان ووتویانە بەمانای حەرفی(من)یان(في)دێ،ئەمەش بۆچوونی دانەرە،بۆ ئەمەش ئامارژەی كرد بەووتەی:(( وَانْوِ مِنْ أَوْ فِ–تاكۆتای دێڕەكە)).

پێوەر بۆ ئەمەش[1] ئەوەیە كە ئەگەر نەگونجا ماناكە مەگەر بەدانانی حەرفی(من)یان (في)ئەوە إضافەكە بەمانای ئەو دوو حەرفە دێ،ئەگەر نا بەمانای حەرفی(لام)دێ.

كەوابوو دەبێ حەرفی(من)دانرێ وتقدیر بكرێ كاتێ كە مضاف إلیه ڕەگەز بێ بۆ مضافەكە،وەكو:(( هذا ثوبُ خَزٍّ, وخاتمُ حديدٍ))تقدیرەكەی: هذا ثوبٌ مِنْ خَزٍّ, وخاتمٌ مِنْ حديدٍ. وە دەبێ حەرفی(في)دانرێ وتقدیر بكرێ كاتێ كە مضاف إلیه هاوەڵفەرمان(ظرف)ـێك بێ كەمضافەكە لەو دا كرابێ،وەكو:(( أعجبني ضَرْبُ اليومِ زيداً)) واتا: ضربُ زيدٍ في اليوم،وە وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ..﴾[2]،وە فەرموودەی خوای گەورە﴿..بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ...﴾[3]

---

[1] واتا:بۆ دانان وتقدیركردنی حەرف بۆ إضافەكە.

[2] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٢٢٦)ـی سورەتی(البقرة)،كورتەی ماناكەی:هەیە بۆ ئەوانەی سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەكانیان دروست نەبن چاوەڕوانی چوارمانگ بكەن...**إعرابەكەی**: للذين:جارومجرور متعلقان بمحذوف خبرمقدم.يؤلونَ:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها من الإعراب صلة الموصول.من نساءِ:جارومجرور متعلقان بالظرف. هِم:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. تربّصُ:مبتدأ مؤخر مرفوع،وهو مضاف. أربعةِ:مضاف إليه مجرور،وهو مضاف، أشهرٍ:مضاف إليه مجرور. الشاهد فيها:(تربّص اربعة اشهر)والتقدير(في اربعة اشهرٍ) لأنّ المضاف إليه ظرفا واقعا فيه المضاف.

[3] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٣٣)ـی سورەتی(سبأ)،كورتەی ماناكەی:–ژێردەستەو چەوساوەكان ئەوانەی لەدونیادا شوێن زاڵم وستەمكاران كەوتوون–لەو دونیا بە

جا ئەگەر نەدەگونجا دانان وتقدیرکردنی حەرفی((من))یان((في))ئەوە إضافەکردنەکە بەمانای حەرفی لام دەبێ،وەکو:((هذا غلامُ زيدٍ،وهذه يدُ عمروٍ))واتا: غلامٌ لزيدٍ،ويدٌ لعمروٍ.

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:(( وَاخْصُصْ أَوَّلاً —تاکۆتای))بۆ ئەوەی کە إضافە دوو جۆرە:پەتی((مَحْضَة))ونا پەتی((غير مَحْضَة))[1]

إضافەی محض بریتیە لە:إضافەکردنی جگە لە وەصف وناوێکی هاوشێوەی فعلیمضارع[2] بۆ لای معمولەکەی.

وە إضافەی غیر محضە بریتیە لە:إضافەکردنی ناو و وەصفێکی هاوشێوەی فعلی مضارع،وەکو لەمەودوا باسی دەکەین،ئەم جۆرە إضافەیەش ناوی یەکەم تایبەت ناکە ونایکاتە ناسراو،وەکو لەمەودوا باسدەکرێ.

بەڵام إضافەی محض:وا نیە وناوی یەکەم تایبەت دەکا ئەگەرمضاف إليه نەناسراوبێ،وەکو:((هذا غلامُ امرأةٍ))،وەدەیکاتە ناسراو(مُعرّف) ئەگەرمضاف إليەناسراوبێ،وەکو:((هذا غلامُ زيدٍ)).

---

کاربەدەست وگەورەکانیان دەڵێن–نەخێر بەڵکو پیلانی ئێوە بە شەووبەڕۆژ(چەواشەی کردین)... إعرابەکەی:بلْ:حرف إضراب مبني على السكون لامحل لها من الإعراب.مكرُ:خبر لمبتدأ محذوف تقديره:سببُ كفرنا مكرُ الليل والنهار، وهو مضاف. الّليلِ:مضاف إليه مجرور.و:حرف عطف. النهارِ:اسم معطوف مجرور. الشاهد فيها:يتعين تقدير(في) في الليل والنهار،لأنّ المضاف إليه ظرف واقعٌ فيه المضاف،والتقدير:مكرٌ في الليل.

[1]مەبەست لە (محضة)واتا: پەتی وخالی لە هەموو شتێکی تر،وە(غير محضة)واتا:تەواو پەتی ویەکلا نیە بۆ ئەو شتە،ومانای تریش تێکەڵاوی دەبێ،وە لێرەدا مەبەست لە محضە واتا:إضافەی تەواوە وبەهۆیەوە مضافەکە تخصيص يان تعريف پەیدا دەکات.

[2]مەبەست اسمی فاعل واسمی مفعول وصفەی مشبهەیە.

***باسی إضافەی غیر محضه :**

٣٨٨-وَإِنْ يُشَابِهِ الْمُضَافُ يَفْعَلُ وَصْفاً فَعَنْ تَنكِيرِهِ لايُعْـزَلُ

٣٨٩-كَرُبَّ رَاجِينا عَظِيمِ الأَمَـلِ مُرَوَّعِ الْقَلْـبِ قَلِيلِ الْحِيَلِ

٣٩٠-وَذِي الإِضَافَةُ اسْمُهَا لَفْظِيَّهْ وَتِلْكَ مَحْضَـةٌ وَمَعْنَوِيَّـهْ[1]

**ئەمە بریتیە لە جۆری دووەمی إضافە،کە بریتیە لە إضافەی غیر محضه،دانەر پێوەر وپێناسەی کردووە بەوەی کە مضافەکە ناوو وەصفێکە هاوشێوەی((يفعلُ))-واتا:فعلی مضارع-کە ئەویش بریتیە لە:هەموو اسمە فاعل واسمە مفعولێ،کە بەمانای ئێستا وداهاتوو(حال واستقبال)بێ[2]،یان صفەی مشەبەهە کە تەنها بە مانای ئێستا(حال)دێ.**

**جانموونەی اسمی فاعل:((هذا ضاربُ زيدٍ الآن،أوغداً, وهذا رَاجِينَا)).**

**وەنموونـەی اسمـی مفعـول:(( هـذا مـضروبُ الأبِ ,وهـذا مُـرَوَّعُ القَلْبِ)).وەنموونەی صفەی مشەبەهە:(( هذاحَسَنُ الوَجْهِ ,وقليلِ الْحِيَلِ,وعَظِيمُ الأَمَلِ)).**

---

[1] **پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە: ٣٨٨-ئەگەر ناوە مضافەکە هاوشێوەی(يفعلُ)بێ، وەصف بێ،ئەوە لە نەناسراوبوونی ئەو ناوە لانادرێ،واتا:ناوە مضافەکە بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. ٣٨٩-وەکو ئەم چوار نموونەیە:رَاجِينا(اسمی فاعلە وإضافەکراوە بۆ لای جێناوی(نا))، عَظِيمِ الأَمَلِ(عظيم:صفەی مشبەهەیە وإضافەکراوە بۆ لای الأَمَلِ)،مُرَوَّعِ الْقَلْبِ(لەم ڕستەیەشدا مروّع اسمی مفعولە وإضافە کراوە بۆ لای القلب)،قَلِيلِ الْحِيَلِ(ئەم ڕستەیەش وەکو ڕستەی(عَظِيمِ الأَمَلِ)وایە). ٣٩٠-ئەمەش-واتا:- إضافەی غیر محضه -پێی دەوترێ لفظي،وە جۆرەکەی تریش واتا-إضافەی محض -پێی دەوترێ محض ومعنوی،واتا:مانای ناوە مضافەکە دەگۆڕێ.**

[2] **اسمی فاعل دوو حاڵەتی هەیە:١-ئەگەرئەلیف ولامی پێوەبوو،ئەوە بەبێ مەرج نیش دەکات.٢-ئەگەر خالی بوو لەئەلیف ولام،ئەوە بەچەند مەرجێ ئیش دەکات،یەکێکیان ئەوەیە بەمانای ئێستاوداهاتوو بێ،وبەمانای رابردوو(ماضی)نەبێ.**

وه ئەگەرناوەمضافەكە وەصف نەبوو یان وەصفێك بوو عامل نەبوو،ئەوە إضافەكە دەبێتە محض،وەكو مصدر،نموونەی:(( عجبتُ من ضَرْبِ زيدٍ))،وە وەكو اسمی فاعل كە بۆ ڕابردووبێ،نموونەی:((هذا ضاربُ زيدٍ أمسِ)).

هەروەها ئاماژەی كرد دانەر بەووتەی:(( فَعَنْ تَنكيرِهِ لايُعْـزَلُ))بۆ ئەوەی ئەم جۆرە إضافەیە-مەبەستم إضافەی غیر محضە-نە تایبەت كردن وەنە ناساندن ناهێنێ بۆ مضافەكە،بۆیە حەرفی((رُبَّ))دەچێتە سەری[1]، هەرچەندە إضافەش كرێ بۆ لای ناسراو،وەكو:((رُبَّ راجينا))،وە ئەم جۆرە دەبێتە ئاوەڵناو(صفە)بۆ ناوی نەناسراو،وەكو فەرموودەی خوای گەورە:﴿هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ﴾[2]،وە سوود وئامانجی ئەم جۆرە إضافەیە تەنها سووكردنی لفظەكەیە وپەیوەندی بەماناوە نیە،بۆیە پێی دەوترێ إضافەی لفظی.

بەڵام جۆری یەكەم[3] ناوە مضافەكە تایبەت دەكات یان دەیكاتە ناسراو،وەكو ڕابورد،بۆیە پێی دەوترێ إضافەی معنوی،وەهۆی ناونانی بە محض ئەوەیە كە دووروخالیە لە جیاكردنەوەی ناوە مضافەكە لەمضاف إليه،بەپێچەوانەی غیر محض،كە تقدیری جیاكردنەوەی ناوە مضافەكە لەمضاف إليه دەكرێ،دەڵێی:((هذا ضاربُ زيدٍ الآن))دەتوانرێ تقدیر كرێ

---

[1] چونكە حەرفی(رُبّ)تەنها دەچێتە سەر ناوی نەناسراو(نكرە)،جائەگەر ئەم جۆرە إضافەیە معنوی بوایە ئەوە دەبووە ناسراو وحەرفی(رُبّ)نەدەچووە سەری.

[2] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٩٥)ی سورەتی(المائدة)،كورتەی ماناكەی:...بەشێوەی قوربانی بگاتە كەعبە... إعرابەكەی: هدياً:حالٌ من الضمير الهاء في(به)المتقدم ذكره.وقيل:تمييز منصوب.بالغَ:صفة لـ(هدياً)،وهو مضاف. الكعبةِ:مضاف إليه مجرور. الشاهدُ فيه:((بالغَ))حيث جاءت الصفة مضافة والموصوف نكرة،وإنّما جاز ذلك لأنَّ الإضافة غير محضة.

[3] واتا: إضافەی محض كە پێیشی دەوترێ إضافەی معنوی.

به((هذا ضاربٌ زیداً))،هەردوو ڕستەکەش یەك مانایان هەیە،بۆیە إضافەکراوە بۆ سووکردنی ووشەکە[١].

***لکاندی(ئەلیف ولام)بە مضافەوە:**

٣٩١–وَوَصْلُ أَلْ بِذَا الْمُضَافِ مُغْتَفَرْ     إِنْ وُصِلَتْ بِالثَّانِ کَـ الْجَعْدِ الشَّعَرْ
٣٩٢–أَوْ بِالَّـذِی لَهُ أُضِیفَ الثَّانـــی     کَـ ((زَیْـــدٌ الضَّارِبُ رَأْسِ الْجَانِ))[٢]

دروسـت نیـە لکانـدنی ئـەلیف ولام بـەو مـضافـەوەی کـە إضـافەکـەی پەتیە،کەوابوو دروست نیە بڵێی:(( هذا الغلامُ رجلٍ)) لەبەر ئەوەی إضافە پێچەوانەی ئەلیف ولامە،بۆیە ناکرێ کۆبکرێنەوە.
بـەڵام ئەگـەر إضـافەکـە غیر محـض بـوو–کـە ئـەویش مەبەسـتە لەووتـەی دانـەر((بِذَا الْمُضَافِ))–واتـا ئـەم جـۆرە إضـافەیـەی کـە پـێش ئـەم دێـڕە باسکرا،ئەوە بەپێی قیاس ویاسا دەبوا ئەلیف ولام نەچێتە سەری،چونکە وەکـو ووتمـان پێـچەوانەی یەکترن،بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەم جـۆرە إضـافەیـە دروستە جیاکرێنەوە لەیەکتر بۆیە چاوپۆشی تیاکراوە ودروستەئەلیف ولام بچێتەسەری،بەمەرجێ ناوە مضاف إلیە کەش ئەلیف ولامی پێوەبێ،وەکو:

---

[١] واتا:((هذا ضاربُ زیدٍ))سووکترە لەدەربڕیندا لە((هذا ضاربٌ زیداً)).

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٩١–لکاندنی ئەلیف ولام بەم جۆرە مضافەوە–واتا بەإضافەی غیرمحض چاوپۆشی لێکراوەودروستە،بە مەرجێك ناوی دووەمیش–مضاف إلیە–ئەلیف ولامی پێوەبێ.٣٩٢–یان ئەگەر مضاف إلیە دووەم ئەلیف ولامی پێوەبێ،وەکو((زَیْدٌ الضَّارِبُ رَأْسِ الْجَانِ))واتا:زەید کێشای بەسەری تاوانبارەکە.

(( الجَعْدِ الشَّعْرِ[1] ,والضَّارب الرَّجل))،يان مضاف إليه كه إضافەكرابێ بۆلای ناوێكی تر كه ئەليف ولامی پێوەبێ،وەكو:((زيدٌ الضاربُ رأسِ الجَاني)).

جا ئەگەر ئەليف ولام نەلكابوو به مضاف إليه كەوە،يان نەلكابوو بەوناوەی مضاف إليەكەی بۆلا إضافكرابوو،ئەوە دروست نيە ناوە مضافەكە ئەليف ولام وەرگرێ،كەوابوو دروست نيە بڵێی:((هذا الضّاربُ زيدٍ))يان((الضاربُ رأسِ جَانٍ)).

ئەمەی كه ووترا بۆ كاتێكە ناوە مضافەكە مثنی،وجمعی مذكری سالم نەبێ،كەواتا مفرد بێ وەكونموونە هێنرايەوە،يان جمعی تكسيربێ، وەكو:((الضّوَارِبُ–أوالضُّرَّابُ– الرجلِ،أو غلامِ الرجلِ))،يان جمعی مؤنثی سالم بێ،وەكو((الضّارِباتُ الرَّجلِ،أوغلامِ الرجلِ))

جا ئەگەر ناوە مضافەكە مثنی،يان جمعی مذكرِ سالم بوو،ئەوە لكاندنی ئەليف ولام تەنها بە مضافەكە بەسە،ومەرج نيە ئەليف ولام بە مضاف إليەوە لكابێ،ئەمەيە مەبەست لە ووتەی ابن مالك:

٣٩٣– وَكَوْنُهَا فِي الوَصْفِ كَافٍ إِنْ وَقَعْ مُثَنًّى أَوْ جَمْعاً سَبِيلَهُ اتَّبَعْ[2].

واتا:بوونی ئەليف ولام لەو وەصفەی كە إضافەدەكرێ ئەگەر مثنی يان جمعێكی هاوشێوەی مثنی بێ–واتا: جمعی مذكری سالم–،ئەوە لەم كاتەدا پێويست ومەرج نيە مضاف إليە كە ئەليف ولامی پێوەبێ،كەواتا دەڵێی: ((هذانِ الضاربا زيدٍ ، وهؤلاء الضاربو زيدٍ)) نونەكەش[3] حذف دەكرێ لەبەر ئەوەی إضافەكراوە.

* * *

---

[1] واتا:قژلوول وپرچ تێكەڵ.

[2] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:بوونی ئەلفی ولام بە مضافەكەوە بەسەوكافيە لەكاتێكدا مثنی يان جمعێكی هاوشێوەی مثنی بێ–واتا: جمعی مذكری سالم–.

[3] واتا:نونی مثنی وجمعی مذكری سالم.

***باسی إضافەکردنی ناو بۆ لای هاومانا( مرادف )کەی:**

٣٩٤-وَلاَ يُضَافُ اسْمٌ لِمَا بِهِ اتَّحَدْ مَعْنىً وَأوِّلْ مُوهِماً إِذَا وَرَدْ[١].

ناوی مضاف تایبەت دەکرێ بەهۆی مضاف إليە،یان دەبێتە ناسراو بەهۆیەوە،بۆیە پێویستە هەردووکیان یەك شت نەبن،چونکە هیچ شتێك بە هۆی خۆیەوە تایبەت ناکرێ،یان ناسراوێتی وەرناگرێ،بۆیە ناو إضافەناکرێ بۆلای شتێك کەهاومانای خۆی بێ،وەکو دووهاومانا، وصفەووەصفکراو،کەوابوو دروست نیە بڵێی:(( قَمْحُ بُرٍّ))وە((رجلُ قَائمٍ))،وە ئەوەی هاتبێ بەم شێوەیە ئەوە دەبێ تأویل[٢] کرێ،وەکو ووتەی عەرەب:((سعيدُ كُرْزٍ))[٣]،بە پێی دیار وئاشکرای ئەم ڕستەیە ئەمە إضافەی شتێکە بۆخودی خۆی،چونکە مەبەست لەسعید وکرز یەك شتە،کەوابوو دەبێ ناوی یەکەم[٤]تأویل کەین بەناونراو(المسمّى)،وناوی دووەمیش بە ناو(الاسم)،وەکو ئەوەی ووترابێ:((جاءَنِي مُسمَّى كرزٍ))،واتا:ناونراو بەم ناوە،بەم شێوەیە تأویل دەکرێ هاوشێوەی ئەمە لەهەموو هاوماناکان،وەکو((يومُ الخميسِ)).

بەڵام ئەوەی وا دەردەکەوێ لە إضافەکردنی وەصفکراو بۆلای صفەکەی، ئەوە تأویل دەکرێ بەوەی کە ئەومضاف إليەی کە وەصفکراوەکەی بۆلا إضافەکراوە حذفکراوە،وەکو ووتەیان:((حَبَّةُ الحَمْقَاءِ, وَصَلاَةُ الأولى))

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:إضافەناکرێ ناو بۆلای ناوێکی هاومانای خۆی،ئەگەر شتێکی وا هات لەزمانی عەرەبیدا ئەوە تأویلی بکە ولەماناناشکراکەی خۆی لایدە.

[٢] تأویل واتا:لادانی ووشەوڕستەکە لەمانا ئاشکراکەی خۆی،ولێکدانەوەی دوور بۆی،ووازهێنان لە مانا نزیکەکە.

[٣] ووشەی كُرز لەزمانی عەرەبیدا صفەتێکی خراپە وبەمانای بێزراو و خراپ بەکاردێ، لەم ڕستەیەدا سعيد وکرز یەکن.

[٤]واتا:سعيد.

ئەصلەکەی:حَبَّةُ البَقْلَةِ الحمقاءِ , وصَلاةُ السَّاعةِ الأولى،ناوی حمقاء:صفەیە بۆ بقلة،نەوەك بۆ حبە،وە الأولى صفەیە بۆ ساعة نەوەك بۆ صلاة،جا مضاف إليه حذفکراوە-کە بریتیە لە-وصفەکەی جێی گرتووە،بووە بە((حَبَّةُ الحَمْقَاءِ, وَصَلاةُ الأولى))کەوابوو وەصفکراو إضافەنەکراوە بۆ لای صفەتەکەی،بەڵکو بۆلای صفەتی شتێکی تر إضافەکراوە.

*  *  *

٣٩٥- وَرُبَّمَا أَكْسَبَ ثَـانٍ أَوَّلاَ    تَأْنِيثاً إنْ كَانَ لِحَذْفٍ مُوهَلاَ[1]

هەندێ جار مضافی مذکر وەرئەگرێ تأنیث لە(مضاف إليه)یەکی مؤنث،بەمەرجێ بگونجێ مضافەکە حذف کرێ ومضاف إليه جێی بگرێ،وهەمان مانای لێ وەرگیرێ،وەکو((قُطِعَتْ بعضُ أصَابِعِهِ))لێرەدا دروستە ووشەی((بعض))تأنیث وەرگرێ چونکە إضافەکراوە بۆلای(أصابع)کە مؤنثە،ودروستە لەووشەی((بعض))بێنیازبین ووشەی(اصابع)جێی گرێ،ودەڵێی((قُطِعَتْ أصَابِعُهُ))،وە وەکو ووتەی:

٢٢٣- مَشَيْنَ كَمَا اهْتَزَّتْ رِمَاحٌ تَسَفَّهَتْ    أَعَالِيَهَا مَرُّ الرِّيَاحِ النَّوَاسِمِ[2].

لێرەدا ووشەی(مرُّ)ی کردۆتە مؤنث لەبەر ئەوەی إضافەکراوە بۆ لای الرياح،وئەمەش دروستە چونکە ڕاست ودروستە بێنیاز بین لەووشەی(مرُّ)و بەووشەی الرياح،وەکو((تَسَفَّهَتْ الرِّيَاحُ)).

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەندێ جار ناوی دووەم-مضاف إليه-دەدا بەناوی یەکەم-مضاف-صیغەی تأنیث ،بەمەرجێ بگونجێ ناوی یەکەم حذف کرێ وناوی دووەم جێی بگرێ.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەو ئافرەتانە ڕێدەکەن ولەنجەولاردەکەن،وەکو چۆن شنە با لقی دارە ڕمەکان دەلەرێنێتەوە. بەڵگەکەی:(( تَسَفَّهَتْ أَعَالِيَهَا مَرُّ الرِّيَاحِ)) لێرەدا فعلەکە(تسفّهت)تای تانیثی وەرگرتووەوفاعلەکەی(مرُّ)مذکرە،ئەمەش لەبەر ئەوەی مضاف إليه کە الرياح مذکرە.

وەهەندیٚ جاریش ناوە مضافەکە مؤنثة وبەهۆی إضافەکردنی بۆلای مضاف إلیە مذکریٚکەوە دەبیٚتە مذکر،بەومەرجەی باسکرا[1]،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾[2] لیٚرەدا ووشەی(رحمت)مؤنثە وتذکیر بوونی وەرگرتووە بەهۆی إضافەکردنی بۆ لای ووشەی پیرۆزی(الله). جا ئەگەر نەدەگونجا ناوە مضافەکە حذف کەین ومضاف إلیە جیٚی بگریٚ ئەوە دروست نیە مضافەکە بکریٚتە مؤنث،کەوابوو نالیٚی:((خرجتْ غلامُ هندٍ))لەبەر ئەوەی دروست نیە بلیٚین((خرجتْ هندٍ))ومەبەست دەرچوونی منداڵ(غلام)ەکەی بیٚ.

* * *

---

[1] واتا:بەو مەرجەی ماناکە ڕاست ودروست بیٚ وبکریٚ مضاف حذف کریٚ ومضاف إلیە جیٚی بگریٚ.

[2] ڕستەی کۆتاییە لە ئایەتی ژمارە(٥٦)ی سورەتی(الأعراف)،کورتەی ماناکەی:بیٚگومان ڕەحم ومیهرەبانی خوا لە چاکەکارانەوە نزیکە. إعرابەکەی:إنّ/حرف مشبه بالفعل.رحمتَ:اسم إنّ منصوب،وهو مضاف. اللهِ:لفظ الجلالة مضاف إليه. قريبٌ:خبر إنّ. من المحسنين:جارومجرور متعلقان بـ(قريب). الشاهد فيها:(رحمت الله قريبٌ)المضاف (رحمت)اكتسب التذكير من لفظ المذكر المضاف إليه(الله)سبحانه وتعالى،وذلك لأنه يمكن الاستغناء عن المضاف ويصح حذفه والتقدير(إنّ الله قريبٌ من المحسنين).

## *ئەو ناوانەی هەمیشە إضافە دەکرێن:

٣٩٦- وَبَعْضُ الأَسْمَاءِ يُضَافُ أَبَدَا    وَبَعْضُ ذَا قَدْ يَأْتِ لَفْظاً مُفْرَدَا[١].

هەندێ ناو پەیوەستن بە إضافەکردنەوە،ئەمانیش دوو جۆرن:

یەکەمیان:بەلفظ ومانا إضافەدەکرێن،وبە مفردی[٢] بەکار نایەن،ئەمەش مەبەستە لە نیوەی یەکەمی دێڕەکە[٣]،ئەمانیش وەکو: ((عند، ولدی، وسوی، وقُصاری الشيء،وحُماداهُ،بەواتای ئەو پەڕی شت)).

دووەم:ئەو ناوانەن کە پەیوەستی إضافەن لە ڕووی ماناوە بەبێ لفظیان،ئەمانە دروستن بەمفردی-واتا: بەبێ إضافە-بەکاربێن،ئەمەبوو مەبەست لە وتەی((وَبَعْضُ ذَا))واتا:هەندێ لەوناوانەی کە پەیوەستن بە إضافەوە هەندێ جار بە مفردی بەکاردێن،دواتریش باسی هەردوو جۆرەکە دێ.

* * *

٣٩٧- وَبَعْضُ ما يُضَافُ حَتْماً امْتَنَعْ    إِيلاَؤُهُ اسْماً ظَاهِراً حَيْثُ وَقَعْ

٣٩٨-كَوَحْدَ، لَبَّيْ، وَدَوَالَيْ، سَعْدَى    وَشَــذَّ إِيــلاَءُ ((يَدَىْ)) لِلَبَّىْ[٤].

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەندێ ناو لەزمانی عەرەبیدا هەمیشە إضافەدەکرێن ،وە هەندێکیان دروستە بەبێ إضافەکردنیش بەکاربێن.

[٢] ووشەی(مفرد)لە ڕێزمانی عەرەبیدا بۆ سێ مەبەست وبەرامبەر بەکاردێ:١-لەبەرامبەر (جمع ومثنی)،وبەواتای تاك دێ.٢-لەبەرامبەر ڕستە(جملە)دا دێ،وبەمانای سادە دێ.٣-لە بەرامبەر (مضاف)دا بەکاردێ،واتا:تەنها یەك ناو،لێرەدا ئەمەیان مەبەستە،واتا کە دەڵێ مفرد واتا:مضاف نیە وتەنها یەك ناوە.

[٣] واتا:دێڕی(٣٩٦)ی ئەلفیە.

[٤] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٣٩٧-هەندێ لەوناوانەی کە پەیوەست(لازم)ی إضافەن دروست نیە ناو(اسم الظاهر)لەپاشیانەوە بێ،واتا:هەمیشە إضافەدەکرێن بۆ لای

لەوناوانـەی إضـافـەدەكرێن بـە لفـظ هەنـدێكيان تـەنها بـۆ لای جێنـاو إضـافەدەكرێن،ئەمەيـە مەبەسـت لێرەدا،وەكـو نـاوی((وحـدك))واتـا:تـەنها تـۆ،وە((لبّيـك))واتـا:وەڵامـم دايتـەوە جـار لـەدوای جـار ولەخزمەتـدام،وە ((دواليك))واتـا:دەستاودەسـتكردن جارلـەدوای جـار،وە((سـعديك))واتـا: دڵخۆشـكردن وبەختـەوەركردن جارلـەدوای جـار،وە بـەشـاذی هـاتووە إضـافـەكردنی((لبّـی))بـۆلای جێنـاوی كەسـی سـێيەم(ضـمير الغيبـة)،وەكـو ووتەی:

٢٢٤-إنكَ لو دعوتَني ودُوني زوراءُ ذاتُ مُترَعٍ بَيُونِ

لقلتُ لَبّيْه لمنْ يَدْعُوني(١)

هـەروەها بـەشـاذی هـاتووە إضـافـەكردنی نـاوی((لبّـي))بـۆ لای نـاو(الاسـم الظاهر)،پێشەوا سيبويە ئەم دێرەی هۆنيوەتەوە:

٢٢٥- دَعَوْتُ لِمَا نَابَنِي مِسْوَراً فَلَبَّيْ فَلَبَّيْ يَدَىْ مِسْوَرِ(٢).

دانـەر بـەم شـێوەيە باسـی كردووە،بـەلاّم لـە قسـەی پێـشەوا سـيبويە ئـەوە وەردەگيرێ كە ئەمە شاذ نيە لە(لبّی)و(سعدی)(٣)

---

جێناو(الضمير). ٣٩٨-وەكو((وَحْدَ،لبّيْ،دَوالِيْ،سَعْدَيْ))،وە بەشاذی هاتووە إضافەكردنی ناوی(يدي)بۆ لای لبّيْ.

(١)ماناوبەڵگەی ئەم دێرونيوە: بێگومان ئەگەر تۆ بانگم كەی ولەنێوانمان زەوی پان وبەرين وفراوان هەبێ-واتا:زۆريش دووربم-،ئەوە بێگومان وەڵامت دەدەمەوە ودەڵێم بەڵی لەخزمەتدام جار لەدوای جار. بەڵگەكەی:((لَبّيْهِ))ووشەی لبّی إضافەكراوە بۆلای جێناوی كەسی سێيەم(ضمير الغائب)،ئەمەش شاذە.

(٢) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:بانگی مسور-ناوی پياوێكە-م كرد كاتێ تووشی بەڵاوناڕەحەتی هاتم ،ئەويش وەڵامی دامەوە جار لەدوای جار. بەڵگەكەی:(( فَلَبَّيْ يَدَىْ مِسْوَرِ))ناوی(لبّی) إضافەكراوە بۆ لای ناوێكی ئاشكرا كە بريتيەلە(يدی)بەشاذی.

(٣) واتا:إضافەكردنيان بۆ لای اسمی ظاهر.

هەروەها بۆچوونی پێشەوا سیبویە وایە کە((لبّیك))وئەوانەی لە گەڵیدا باسکران مثنان،ومنصوبن بەوەی کە مفعولی مطلقن بۆ فعلێکی حذفکراو،وە مثناکەیان مەبەست پێی زۆرییە،کەوابوو دەبنە پاشکۆ(ملحق)ـی مپنی،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ..﴾واتا:جارلەدوای جار،لێرەدا ووشەی(كَرَّتَيْنِ)مەبەست پێی دووجارنییە،لەبەر فەرموودەی خوای گەورە:﴿.. يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾[1]،واتا:ماندوو بێتاقەت،بێگومان چاو ماندووبێتاقەت نابێ بەتەنها دووجار،کەواتا مەبەست بە(كرّتين)زۆرو جارلەدوای جارە،ومەبەست پێی دووجار نیە،هەروەها((لبّيك))ئامادەبوون جار لەدوای جار وەکو ڕابورد،نەوەك دووجار،هەروەها سەرجەم هاوشێوەکانی،بەوشێوەیە ڕوونکرایەوە.

وە بۆچوونی پێشەوا یونس وایە کە مثنا نیە،وئەصڵەکەی(لبّی)یە، وناوێکی مقصورە[2]،وئەلیفەکەی کراوەتە یا لە گەڵ جێناوەکە،هەروەکو چۆن ئەلیفی((لدى،وعلى))دەکرێتە یا لەگەڵ جێناو،لە((لَدَيْه،وعليْه)).

جا پێشەوا سیبویە وەڵامی پێشەوا یونسی داوەتەوە–ڕەحمەتی خوا یان لێبێ–،بەوەی ئەگەر وابووایە نەدەبوو ئەلیفەکەی لەگەڵ ناوی

---

[1] ئایەتی ژمارە(٤)ـی سورەتی(الملك)،پوختەی ماناکەی:دووبارە چاو بگێڕە یەك لەدوای یەك،چاوت بەڕیسوای ونائومێدی دەگەڕێتەوە بۆلای خۆت لەکاتێکدا چاوت ماندووبێتاقەت دەبێ. إعرابەکەی:ثمّ:حرف عطف. ارجعْ:فعل أمر مبني على السكون،وفاعله ضمير مستتر تقديره(أنت). البصرَ:مفعول به منصوب.كرّتين:مفعول مطلق منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه ملحق بالمثنى. ينقلبْ:فعل مضارع مجزوم لأنه جواب الطلب(ارجعْ). إليكَ:جارومجرور متعلقان بـ(ينقلب). البصرُ:فاعل مرفوع.خاسئاً:حال منصوب. وهو:و:واوالحال،هو:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدأ.حسيرٌ:خبرمرفوع.وجملة(وهوحسير)في محل نصب حال. الشاهد فيها:(كرّتين)حيث نصب على المصدرية(مفعول مطلق)بفعل محذوف،وانّ المراد بالتثنية التكثير فهو على هذا ملحق بالمثنى،اي كرّات وليس المراد به مرّتين فقط.

[2] مقصور:ئەو ناوێکی معربە و کۆتاییەکەی ئەلیفێکی کورتە واتا مدّ(درێژکردنوە)ی نیە.

ئاشکرا(الاسم الظاهر)دا کرابا بە یا،هەروەکو چۆن ئەلیفی((لدی،وعلی)) لەگەڵ ناوی ئاشکرا ناکرێن بە یا،ودەڵێ((علی زیدٍ،ولدی زیدٍ))،دەبوو ووترابا((لبّی زیدٍ))بەلام کاتێ إضافەیان کردووە بۆلای ناوی ئاشکرا ئەلیفەکەیان کردووە بە یا،ووتیان: * فَلَبَّيْ يَدَيْ مِسْوَرِ *

کەوابوو ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ناوە[1] مثنّایە،ومقصور نیە وەکو پێشەوا یونس فەرموویەتی.

*ئەوناوانەی إضافە دەکرێن بۆ لای رستە( جملە ):

٣٩٩- وَأَلْزَمُوا إِضَافَةً إِلَى الْجُمَلْ حَيْثُ وَإِذْ وَإِنْ يُنَوَّنْ يُحْتَمَلْ

٤٠٠-إِفْرَادُ إِذْ وَمَا كَإِذْ مَعْنىً كَإِذْ أَضِفْ جَوَازًا نَحْوُ حِينَ جَا نُبِذْ[2].

لەو ناوانەی پەیوەستی إضافەن:هەندێکیان تەنها بۆ لای رستە إضافەدەکرێن،کە بریتین لە((حیثُ،إذْ، وإذا))،جا ناوی((حیثُ))إضافە دەکرێ بۆ لای جملەی اسمی،وەکو((اجلسْ حیثُ زیدٌ جالسٌ))،وە بۆ لای جملەی فعلی وەکو((اجلسْ حیثُ جلسَ زیدٌ))یان((حیث یجلسُ زیدٌ))، وە کەم جار وبەشاذی هاتووە إضافەکرابێ بۆ لای مفرد،وەکو ووتەی:

٢٢٦- أَمَا تَرَى حَيْثُ سُهَيْلٍ طالعًا نَجْماً يُضِيءُ كالشِّهَابِ لأمِعًا[3].

---

[1] واتا:لبّيْ وهاوشێوەکانی.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە: ٣٩٩-پەیوەستە بەإضافەکردن بۆ لای رستە(جملة)هەریەك لە((حیثُ،إذْ))،وە ئەگەر(إذ)تنوینی وەرگرت ئەوە دەکرێ. ٤٠٠-بە مفردی بەکاربێ -واتا: دروستە إضافەنەکرێ- ، وە هەموو ئەو ناوانەی وەکو(إذ)وان لەرووی ماناوە،دروستە إضافەکرێن بە شێوەی إضافەکردنی(إذ)،وەکو((حینَ جاءَ نُبِذْ)).

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: بڕوانە وببینە کاتێ کە سوهەیل دەردەکەوێ،مەبەستم لە سوهەیل ئەستێرەی پرشنگدارە،وەکو تیشکی ئاگر. بەڵگەکەی:((حَيْثُ سُهَيْلٍ..)) حیثُ إضافەکراوە بۆ لای ناوێکی مفرد،ئەمەش شاذەو پێچەوانەی یاسایە.

هەروەها((إذْ))إضافەدەكرێ بۆ لای جملەی اسمی وەكو:((جئتُك إذْ زيدٌ قائمٌ))،وە بۆلای جملەی فعلی وەكو:(( جئتُك إذْ قامَ زيدٌ))،وە دروستە جملەكەی كە بۆلای إضافەكراوە حذفكرێ،ولەبری تنوينێك بهێنرێ،وەكو فەرموودەی خوای گەورە:﴿وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ﴾[1]،ئەمەيە مانای ووتەی:(( وَإِنْ يُنَوَّنْ يُحْتَمَلْ إِفْرَادُ إِذْ))واتا:ئەگەر(إذ)تنوينی وەرگرت دروستە إضافەنەكرێ،واتا:لە لفظدا إضافەنەكراوە،لەبەر ئەوەی بری بۆ هاتووە كە تنوينە.

هەروەها(إذا)تەنها بۆلای جملەی فعلی إضافەدەكرێ،وەكو((آتِيك إذا قامَ زيدٌ))،وەدروست نيەإضافەكرێ بۆلای جملەی اسمی،كەوابوو نالێی:((آتيك إذا زيدٌ قائمٌ))بە پێچەوانەی كۆمەڵێ،دواتريش دانەر باسی دەكات.

هەروەها ئاماژەی كرد دانەر بەووتەی:(( وَمَا كَإِذْ مَعْنىً كَإِذْ))بۆ ئەو ناوانەی وەكو(إذ)وان-لەو ڕووەوەی كە ظرفن وبۆ ڕابردوون وبێسنور(غيرمحدد)ن- كە دروستن إضافەكرێن بۆ لای ئەوەی(إذ)ی بۆ إضافەدەكرێ كە بريتيە لەجملەی اسمی وجملەی فعلی،ئەوانيش وەكو((حين،و وقت،وزمان،ويوم))، دەڵێی:((جئتُكَ حينَ جاءَ زيدٌ، ووقتَ جاءَ عمرٌو، وزمانَ قَدِمَ بكرٌ، ويومَ خرجَ خالدٌ))،هەروەها دەڵێی:((جئتك حينَ زيدٌ قائمٌ))هەروەها ناوەكانی تريش.

---

[1] ئايەتی ژمارە(٨٤)ی سورەتی(الواقعة)،پوختەی ماناكەی:ئێوە لەو كاتەدا- واتا:كاتێ گيانی نەخۆشی سەرەمەرگ دەگاتە گەرو-تەماشا دەكەن.
إعرابەكەی:و:حسب ماقبلها،وقيل:واو الحالية. أنتم:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدأ.حينَئذٍ:حينَ:ظرف زمان أضيف إلى مثله،منصوب وعلامة نصبه الفتحة،وهو مضاف،ئذٍ:ظرف زمان مبني على السكون المقدر لاشتغال المحل بتنوين العوض في محل جر مضاف إليه. تنظرون:فعل وفاعل،والجملة الفعلية(تنظرون)في محل رفع خبر. وجملة(أنتم حينئذ تنظرون)في محل نصب حال.
الشاهد فيها:(ئذٍ)من حينئذ حيث نونتْ إذْ تعويضا عن الجملة الفعلية المضافة إليها،والتقدير:حين إذْ بلغت الروحُ الحلقومَ،وأُتي بالتنوين عوضا عنها.

جا دانەر بۆیە فەرمووی:((أَضِفْ جَوَازًا))بۆ ئەوەی بزانرێ کە ئەم جۆرە-واتا:ئەوانەی وەکو(إذ)وان لە ڕووی ماناوە- إضافە دەکرێن بۆ لای ئەوەی(إذ)ی بۆ إضافەدەکرێ کە بریتیە لە جملە-بەدروستی،نەوەك بە واجبی.

جا ئەگەر ظرفەکە ڕابردوو(ماضی)نەبوو،یان سنوردار(محدود)بوو،ئەوە وەکو(إذ)مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێ،بەڵکو ئەوەی کە ڕابردوو نیە ئەوە وەکو(إذا)مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ،وتەنها بۆ لای جملەی فعلی إضافەدەکرێ،وبۆ لای جملەی اسمی ناکرێ،کەوابوو دەڵێی:(( أَجِيئُكَ حِينَ يَجِيءُ زيدٌ))، وە ئەوانەی سنوردارن إضافەناکرێن بۆ لای ڕستە،ئەوانیش وەکو((شهر،وحول))بەڵکو تەنها بۆ لای مفرد إضافەدەکرێن،وەکو:(( شهرُ كذا, وحَوْلُ كذا)).

* * *

٤٠١-وَابْنِ أَوَ اعْرِبْ مَا كَإِذْ قَدْ أُجْرِيَا وَاخْتَرْ بِنَا مَتْلُوّ فِعْلٍ بُنِيَا

٤٠٢-وَقَبْلَ فِعْلٍ مُعْرَبٍ أَوْ مُبْتَدَا أَعْرِبْ ،وَمَنْ بَنَى فَلَنْ يُفَنَّدَا[1].

پێشتر ڕابورد کە ئەو ناوانەی إضافەدەکرێن دووجۆرن: یەکێکیان:إضافەدەکرێن بۆ لای جملە بە واجبی.دووەمیان: ئەوانەن إضافەدەکرێن بۆ لای جملە بەدروست(جائز)ی.

وە لەم دوو دێڕەدا ئاماژەی کرد بۆ ئەوانەی کە بە دروستی إضافەدەکرێن بۆ لای جملە کە دروستن معرب بن یان مبنی بن،چوون یەکن إضافەکرابن

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٠١-ئەو ظرفانەی وەکو(إذ)بەکار دێن-دروستە مبنی بن یان معرب بن،ئەگەر لە پاشیانەوە فعلێکی مبنی هات ئەوە ڕای هەڵبژێراو ئەوەیە کە مبنی بن.٤٠٢-وە ئەگەر کەوتنە پێش فعلێکی معرب یان مبتدا ئەوە معربیان بکە،وە ئەو کەسەی مبنی کردووە لەم حاڵەتەدا بەهەڵەی مەزانە.

بۆلای جملەیە سەرەتاکەی فعلی ماضی بێ،یان فعلی مضارع بێ،یان جملەی اسمی بێ،وەکو((هذا یومَ جاءَ زید، ویومَ یَقوم عمروٌ، أو یومَ بکرٌ قائمٌ))،ئەمەش بۆچوونی کوفیێکانە،وهەریەك لە پێشەوا فارسی ودانەریش لەگەڵیدان،بەلاّم بۆچوونی پەسەند ئەوەیە ئەوانەی إضافەکراین بۆ لای جملەی فعلی کە فعلەکەی ماضی بن مبنی بێ،گێڕدراوەتەوە بە معربی وبە مبنیی وتەی:

٢٢٧- *علی حینِ عاتبتُ المشیبَ علی الصِّبَا[١]* بە فتحەی نونی(حین)کە دەبێتە مبنی،وە بەکسرەی کە دەبێتە معرب.

وە ئەوانەی دەکەونە پێش فعلێکی معرەبەوە،یان پێش مبتداوە،ئەوە بۆچوونی پەسەند ئەوەیە معرب بن،خۆ دروستیشە مبنی بن،ئەمەبوو مانای وتەی دانەر((وَمَنْ بَنَیٰ فَلَنْ یُفَنَّدَا))واتا:ئەوەی مبنی دەکات هەڵەی نەکردووە،وە خوێندراوەتەوە لە حەوت خوێندنەوەکەی قورئان﴿..هَذَا یَوْمُ یَنْفَعُ الصَّادِقِینَ صِدْقُهُمْ....﴾[٢]،بەمرفوعی کە دەبێتە معربوە بەفتحە دەبێتە مبنی،ئەمەش بۆچوونی هەڵبژاردەی دانەرە.

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم نیو دێڕە:-وازم لە تاوان هێنا-لە کاتێکدا لۆمەی پیری خۆم دەکرد لەسەر هەواوئارەزوو... بەڵگەکەی:(( علی حینِ ..))ووشەی حین بەدوو شێوە گێڕدراوەتەوەبە مکسوری کە معرب،وبە مفتوحی کە مبنیە،لەبەر ئەوەی لە پاشێوە فعلێکی مبنی هاتووە.

[٢] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١١٩)ی سورەتی(المائدة)،پوختەی ماناکەی:..ئەمە ڕۆژێکە ڕاستبێژان ڕاستیەکەیان کەڵکیان پێدەگەیەنێ. إعرابەکەی:هذا:اسم إشارة مبني في محل رفع مبتدأ.یومُ:خبر مرفوع،وهو مضاف. ینفعُ:فعل مضارع مرفوع. الصادقین:مفعول به مقدم منصوب وعلامة نصبه الیاء لأنه جمع مذکر السالم. صدقُهم:صدقُ:فاعل مرفوع،وهو مضاف،همْ:ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه. وجملة(ینفع الصادقین صدقُهم)في محل جر

بۆچوونی بەصرییەکانیش وایە کە دروست نیە لەوەی إضافەکراوە بۆلای جملە فعلیە کە فعلەکەی مضارع بێ،یان جملەی اسمی جگە لەمعرب بوون،وە دروست نیە مبنی بوون تەنها لەوەی إضافەکراوە بۆ لای جملەفعلیە کە فعلەکەی ماضی بێ.

ئەمە حوکمی ئەوەی إضافەکراوە بۆ لای جملە بەدروست(جوان)ـی،بەلاَم ئەوەی إضافەکراوە بۆلای جملە بە واجبی ئەوە پەیوەستی مبنی بوونە،لەبەر ئەوەی لە حرف دەچێ لە ڕووی پێویست بوونی بەڕستەیە کە ماناکەی تەواو بکات،کە بریتین لە((حیثُ ،وإذْ ،وإذا)).

* * *

***إذا تەنها بۆ لای جملەی فعلی إضافە دەکرێ؛**

٤٠٣–وَأَلْزَمُــوا إِذَا إِضَافَــةً إِلَى جُمَلِ الأَفْعَالِ كَـ(هُنْ إِذَا اعْتَلَى)[١].

ئامـاژەی کـرد لـەم دێـڕە بـەوەی کـە پێـشتر باسـکرا،لەوەی کـە((إذا)) پەیوەست(لازم)ـە بە إضافەکردن بۆ لای جملەی فعلی، وإضافەناکرێ بۆلای جملـە اسمی،پێـچەوانەی بۆچـوونی ئەخفـەش وکوفییـەکان، کـەوابوو نـاڵێی:((أجیئُـك إذا زیـدٌ قـائمٌ))،بـەلاَم ڕسـتەی((أجیئـك إذا زیـدٌ قـامَ))ئـەوە نـاوی((زیـدٌ))تێیـدا مرفوعـە بـە فعلێکـی محـذوف،ومرفـوع نیـە بـە مبتـدا بوون(الابتداء))،ئەمەش بۆچوونی پێشەوا سیبویە یە.

بـەلاَم ئەخفـەش پێـچەوانەی سـیبویەیە،وپێی دروسـتە((زیـدٌ))[١]مبتـدا بـێ وفعلەکەی پاشی خبری بێ.

---

بالإضافة. الشاهد فیها:(یومُ)قرئ بالضم والفتح،بالرفع على الاعراب،وبالفتح على البناء،وإنّما جاز ذلك لأنه اضیف إلى جملة فعلیة صدرها فعل مضارع معرب.

[١]پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:إذا تەنها بۆ لای جملەی فعلی إضافە دەکرێ،وەکو ڕستەی((هُنْ إِذَا اعْتَلَى))واتا:تۆ خاکی(متواضع)بە کاتێ ئەو لوت بەرز(متكبّر)بوو.

[١] واتا: زیدٌ لە ڕستەی((أجیئك إذا زیدٌ قامَ)).

هەروەها پێشەوا سیرافی فەرموویەتی هیچ خیلافێك نیە لەنێوان پێشەوا سیبویە وئەخفەش لە دروستێتی بوونی مبتدا لە پاش( إذا )،بەڵکو خیلافیان هەیە لە خبرەکەی،پێشەوا سیبویە پێی وایە کە پێویستە خبرەکەی فعل بێ،وئەخفەش پێی دروستە خبرەکەی ناو بێ،کەوابوو دروستە لە رستەی((أجيئك إذا زيدٌ قامَ))کە زیدٌ مبتدا بێ لای سیبویە وئەخفەش،بەڵام رستەی((أجيئُك إذا زيدٌ قائمٌ))تەنها لای ئەخفەش دروستە.

* * *

***باسی چۆنێتی إضافەکردنی هەریە لە((کلا وکلتا)):**

٤٠٤- لِمُفْهِمِ اثْنَيْنِ مُعَرَّفٍ بِلاَ تَفَرُّقٍ أُضِيفَ كِلْتَا وَكِلاَ[٢]

لەو ناوانەی پەیوەستی إضافەن بە لفظ ومانا:((کلتا))و((کلا))،تەنها بۆ لای ناوی ناسراو إضافەدەکرێن،ودەبێ ناوەکەش کراوبەدووان(مثنّى)بێ بە لفظ ومانا،وەکو:((جاءني كلا الرَّجلين,وكلتا المرأتين))،یان بە مانا مثنّى بن بەبێ لفظ[٣]،وەکو((جاءني كلاهما،وكلتاهما))،وە وەکو ووتەی:

٢٢٨- إنَّ للخَيْرِ وللشَّرِّ مَدًى وَكِلاَ ذَلِكَ وَجْهٌ وقَبَلْ[٤]

ئەمە بوو مەبەست لەووتەی:(( لِمُفْهِمِ اثْنَيْنِ مُعَرَّفٍ))،وە خۆی پاراست دانەر بەووتەی((بِلاَ تَفَرُّقٍ))لەوناوەی کە ناسراوەو بۆدووانە بە

---

[٢] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:هەریەك لە((کلا وکلتا))إضافە دەکرێ بۆ لای ناوێکی ناسراو کە بۆ دووان بن و دووانەکە جیا نەبن.

[٣] لە شەرح ورافەی دێری(٣٢)ی ئەلفیەدا پێناسەی مثنّامان کرد،جا جێناوی(هما)بەمانا بۆ دووانە بەڵام بە لفظ مثنّى نیە،چونکە پێناسەی مثنى نایگرێتەوە.

[٤] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:بێگومان چاکە وخراپە وخۆشی وناخۆشی کۆتاییان هەیە،واتا هیچیان بەردەوام نین،وە هەریەك لەودووانە جێی وکەسی خۆی هەیە خوای گەورە دەیداتێ.
بەڵگەکەی:(( وَكِلاَ ذَلِكَ..))ناوی(کلا) إضافەکراوە بۆلای (ذلك)کە بە لفظ مفردە،بەڵام لەماناادا مثنّایە لەبەر ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ دووان کە بریتین لە خیر وشرّ.

جیاوازی[1]،ئەوە((کلا،وکلتا))یان بۆلا إضافە ناکریٚ،کەوابوو نالیٚی:((کلا زیدٍ وعمرٍو جاءَ))،بە شاذی هاتووە،وەکو ووتەی:

٢٢٩-كِلا أَخِي وخَلِيلِي وَاجِدِى عَضُداً فى النَّائِبَاتِ وَإِلْمَامِ الْمُلِمَّاتِ[2].

***باسی چۆنیٚتی إضافەکردنی ناوی((أيُّ))و جۆرەکانی:**

٤٠٥-وَلاَ تُضِفْ لِمُفْـرَدٍ مُعَـرَّفِ أَيًّـا وَإِنْ كَرَّرْتَـهَا فَأَضِـفِ

٤٠٦-أَوْ تَنْوِالأَجْزَا وَاخْصُصَنْ بالْمَعْرِفَهْ مَوْصُولَةً أَيًّـا وَبِالْعَكْسِ الصِّفَـهْ

٤٠٧-وَإِنْ تَكُـنْ شَرْطاً أَوِ اسْتِفْهَامَا فَمُطْلَقاً كَمِّـلْ بِهَا الْكَلاَمَـا[3].

لەوناوانەی کە پەیوەستی إضافەکردنن لەڕووی ماناوە((أيُّ))،إضافەناکریٚ بۆلای تاکی ناسراو (مفرد معرفة)،مەگەر دووبارە کریٚتەوە،وەکو ووتەی:

٢٣٠-أَلاَ تَسْأَلونَ النَّاسَ أَيِّي وأَيُّكُم غَدَاةَ التَقَيْنَا كَانَ خَيراً وأَكْرَمَا[1].

---

[1] واتا:دوو ناون بەلاّم مثنا نین

[2] ماناو بەلّگەی ئەم دیٚرە: هەریەك لە براكەم ودۆستەكەم یارمەتی دەرو هاوکارمن لە کاتی هاتنی بەلاّو نارەحەتی. بەلّگەکەی:((كِلا أَخِي وخَلِيلِي..))لیٚرەدا ناوی(کلا) إضافەکراوە بۆلای دووناوی جیاواز کەبریتین لە((أَخِي وخَلِيلِي))ئەمەش شاذە.

[3] کورتەی مانای ئەم سیٚ دیٚرەی ئەلفیە:٤٠٥-ناوی(ایُّ)إضافەناکریٚ بۆلای تاکی ناسراو،مەگەر ناوە ناسراوە تاکەکە دووبارە کەیتەوە لەم کاتەدا إضافەی بکە. ٤٠٦- یان مەگەر مەبەستت بەشیٚکی ناوەکە بیٚ، وە ئەگەر(ایُّ)موصولە بیٚ ئەوە تایبەتە بە إضافەکردن بۆلای ناوی ناسراو،بەلاّم(ایُّ)ئەگەر صفە بیٚ ئەوە بەپیٚچەوانەی موصولەوەیە-واتا:بۆ لای نەناسراو إضافەدەکریٚ-.٤٠٧-و(ایُّ)استفهامی وشرطی بۆلای ناسراو ونەناسراو إضافەدەکریٚ.

[1] ماناو بەلّگەی ئەم دیٚرە: ئایە پرسیار ناکەن لەخەلّکی من یا ئیٚوە،لە بەرەبەیانی بەیەککەشتن-واتا:لەکاتی جەنگدا-چاکتر وبەڕیٚزترین. بەلّگەکەی:((أَيِّي وأَيُّكُم..)) ناوی(ایُّ)إضافەکراوە بۆلای ناویٚکی ناسراو کە جیٚناوی(ی)و(کم)،ئەمەش بۆیە دروستە لەبەر ئەوەی دووبارە بۆتەوە.

یان مەگەر مەبەستت بەشێکی ناوەکە[٢] بێ،وەکو((أيُّ زيدٍ أحسنُ؟))واتا:کام بەشی زید چاکترە،بۆیە وەلأمەکەی بە بەشێك دەدرێتەوە،دەوترێ:عينُهُ،یان أنفُهُ، ئەمەش بۆ کاتێکە مەبەست لە(ایُّ)استفهامی بێ.

ایُّ چوار جۆرە:استفهامی،وشرطی،و صفە،و موصولە.

جا(ایُّ)موصولە ئەوە دانەر باسی ئەوەی کردووە کە تەنها بۆلای ناسراو إضافەدەکرێ،کەوابوودەڵێی:((يُعجبني أيُّهم قائمٌ))،بەلأم جگە لەدانەر باسی ئەوەیان کردووە کە بۆلای نەناسراویش إضافەدەکرێ،بەلأم کەمە، وەکو((يُعجبني أيُّ رجلينِ قاما)).

و(ایُّ)صفە مەبەست پێی ئەوەیە کە صفە بێ بۆ ناوێکی نەناسراو،یان حال بێ بۆ ناوێکی ناسراو،ئەمەیان تەنها بۆلای نەناسراو إضافەدەکرێ، وەکو((مررتُ بِرَجُلٍ أيِّ رُجَلٍ،مررتُ بزيدٍ أيَّ فتًى))،وە وەکو:

٢٣١-فَأَوْمَأْتُ إِيْمَاءً خَفِيّاً لِحَبْتَرٍ فَلِلَّهِ عَيْنَا حَبْتَرٍ أَيَّمَا فَتًى[٣].

وە(ایُّ)شرطی واستفهامی إضافەدەکرێن بۆلای ناسراو ونەناسراو بەڕەهایی،واتا:ئەو ناوە مثنا بێ،یان جمع بێ،یان مفرد-جگە لەمفردی ناسراو-کە تەنها(ایُّ)استفهامی بۆلا إضافەدەکرێ،وەکو پێشتر باسکرا.

جا بزانە(ایُّ)ئەگەر صفە یان حال بێ،ئەوە پەیوەست(لازم)ـی إضافەکردنە بە لفظ ومانا،وەکو((مررتُ بِرَجُلٍ أيِّ رُجَلٍ،و بزيدٍ أيَّ فتًى))،بەلأم ئەگەر استفهامی،یان شرطی،یان موصولە بو،ئەوە پەیوەستی إضافەن بە مانا نەوەك بە لفظ،وەکو((أيُّ رجلٍ عندك، وأيٌّ عندك؟ وأيَّ رجلٍ تضربْ أضربْ،وأياً

---

[٢] واتا:ناوە مضاف إليه کە.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئاماژەم کرد بە ئاماژەیەکی پەنهان بۆ کاك حبتر،کەس بە ئاماژەکەی نەزانی جگە لە حبتر.ماشاءالله لەو گەنجە. بەڵگەکەی:(( أيَّمَا فَتًى))ناوی (ایُّ) صفە إضافەکراوە بۆلای ناوێکی نەناسراو.

تضربْ أضرب، ويعجبني أيُّهم عندك، وأيٌّ عندك))وه وەكو((أيَّ الرجلينِ تضربْ اضربْ، وأيَّ رجلينِ تضربْ أضربْ، وأيَّ الرجالِ تضربْ أضربْ، وأيَّ رجالٍ تضربْ اضربْ، وأيُّ الرجلينِ عندكَ؟وأيُّ الرجالِ عندك؟ وأيُّ رجلٍ، وأيُّ رجلينِ وأيُّ رجال؟)).

* * *

***باسی چۆنێتی إضافەکردنی (لدُن)و(مع):**

٤٠٨-وَأَلْزَمُوا إِضَافَةً لَدُنْ فَجَرّْ وَنَصْبُ غُدْوَةٍ بِهَا عَنْهُمْ نَدَرْ

٤٠٩-وَمَعَ مَعْ فِيهَا قَلِيلٌ وَنُقِلْ فَتْحٌ وَكَسْرٌ لِسُكُونٍ يَتَّصِلْ[١].

**لەو ناوانەی کە پەیوەستی إضافەن ((لدُن،ومع)).**

**جاووشەی((لدُن))بۆ سەرەتای مەبەست شوێن یان کات بەکاردێ،وە مبنیە لای زۆرینەی عەرەب[٢]،لەبەر ئەوەی لە حرف دەچێ لەڕووی بەکارهێنانی بەیەك شێوە-کە بریتیە لە ظرفیەت،وسەرەتای مەبەست-،وە نەکردنی بە خبر،وە دەرناچێ(لدُن)لە ظرفیەت مەگەر مجرور بێ بە حرفی(مِنْ)،ئەمەش زۆرە بۆی،بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا تەنها بەمجروری بە(مِنْ)،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿..وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا﴾[١]،وە فەرموودەی خوای**

---

[١] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٠٨-عەرەب ناوی(لدُن)یان بە مضافی بەکار هێناوەو ناوەکەی پاشیان پێ مجرور کردووە،وە بەکەمی هاتووە منصوب بوونی ووشەی(غُدوە)لەپاش لدُن.٤٠٩-ووشەی(مع)بەزۆری بەفتحەی عینەکەی خوێندراوەتەوە وبەکەمیش هاتووە بە زەنەدار(سکون)ی عەینەکەی،وە ئەگەر لە پاش(مع)ووشەیەکی ساکن هات ئەوە دروستە عینەکەی فتحە یان کسرە وەرگرێ.

[٢] هەموو ووشەیەك لەزمانی عەرەبیدا مانایەکی هەیە،لە گەڵ حوکمی ڕێزمانی،کە معرب یان مبنی بوونە،جا ووشەی(لدُن)ماناکەی سەرەتای مەبەستە،وحوکمەکەی مبنی بوونە.

[١] ڕستەی کۆتاییە لە ئایەتی(٦٥)ی سورەتی(الکهف)،کورتەی ماناکەی:شارەزامان کردبوو لە زانیاری تایبەتی خۆمان-مەبەست خدری زنەیە واللهُ اعلم-. إعرابەکەی:و:حسب ما قبلها

گــــەروە:﴿..لِيُنْـذِرَ بَأْسًـا شَـدِيدًا مِـنْ لَدُنْـهُ...﴾[٢]،وە بـــەلای (قـــيس)[٣]وە ناوی(لدن)معربه،و ابی بكر له عاصمەوە[٤] خوێندوویانەتـەوە : ﴿ لِيُنْذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِنْ لَدْنِهِ..﴾،وەحـەرفی دالەكـەی سـاكن كردووە،وإشمـامی كـردووە بـە ضمه[٥].

دانەر فەرموويەتی بۆی هەيە ئەم دێرە شعره لەوەبێ:

٢٣٢-تَنْتَهِضُ الرِّعْدَةُ فِي ظُهَيْرِي مِنْ لَدُنِ الظُّهْرِ إلى العُصَيْرِ[١].

---

.علّمناهُ:فعل وفاعل ومفعول به أول .مِنْ:حرف جر.لدُنْ:اسم مبني على السكون في محل جراسم مجرور،وهو مضاف.نا:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. علماً:مفعول به ثانٍ. الشاهد فيها:(من لدُنّا)حيث جرّ لدن بمن وهذا كثير د،ولم ترد في القرآن إلاّ مجرورة بمن.

[٢] بەشێكه له ئايەتی(٢)ی سورەتی(الكهف)،كورتەی ماناكەی: بۆ ئەوەی بەسزايەكی زۆر بەتين بترسێنێ -ئەوانەی باوەڕی پێ ناهێنن-. إعرابەكەی:لِيُنذرَ:لـ:لام التعليل،ينذرَ:فعل مضارع منصوب بـ(أن)مضمرة بعد لام التعليل،وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره(هو). بأساً:مفعول به ثانٍ (لينذر)منصوب،والمفعول الأول محذوف تقديره(لينذركم). شديداً:نعت منصوب. من:حرف جر. لدُنْ:اسم مبني على الضم في محل جر اسم مجرور،وهو مضاف،والهاء:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. الشاهد فيها:(مِن لدنه)حيث خرجت لدُن عن الظرفية لجرها بمنْ.

[٣] قيس يەكێكن له بنەماڵە كانی عەرەب وخاوەن لهجه ودەربڕينی تايبەت به خۆيانن.

[٤] عاصم يەكێكه له دە قورئان خوێنه بەناوبانگەكان،وچەند قوتابييەكی خوێندنەوەكەيان گێڕاوەتەوە،يەكێك له قەتابيەكانی(ابو بكربن عياش)ـە كه ساڵی(١٩٣)ك كۆچی دوای كردووە.

[٥] إشمام ئەوەيه لێوەكان كۆدەكەيتەوە بەبێ دەرخستنی دەنگی ضمه،بەشێوەيەكه بينەر ببينێ ونابينا نەيبيستێ(يراها البصير ولايسمعها الأعمى).

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: لەرزوتا پشتم دادەگرێ له كاتی نيوەڕۆ تا عەسر. **بەڵگەكەی**:( مِنْ لَدُنِ..)ناوی لدُن معربه لەسەر لغه وبۆچوونی قيس.

وه ئـهو نـاوهی لـهپاش(لـدُن)دێ مجـرور دهبـێ بـه هـۆی إضـافهوه،جگـه لهناوی(غُدوهً)که منصوبیان کردووه،وهکو ووهتی:

٢٣٣– ومَا زَال مُهْرِي مَزْجَرَ الكَلْبِ مِنْهُمُ      لَدُنْ غُدْوَةً حتَّى دَنَتْ لِغُرُوبِ[٢].

جا ناوی(غُدوه)منصوبه بهوهی که تمییزه،ئهمهش بۆچوونی ههڵبژێراوی دانهره،بۆیـه فـهرمووی:((وَنَـصْبُ غُـدْوَةٍ بِهَا عَنْهُمْ نَدَرْ))،وه ووتـراوه:کـه (غُدوهً)خبره بۆ(کان)ـهیهکی حذفکراو،وتقدیرهکهی:لدُن کانت الساعةُ غُدوةً.

وه دروسـته نـاوی(غـدوهً)مجروربێ،ئهمـهش یاساوقیاسه،ومنـصوب بـونی کهمـهونادره،جا ئهگـهر ناوێـك عطـف کهیتـهوه بۆسـهر(غُـدوهً)ئـهوه دروسـته منـصوبی کـهی بهپێی لفظـهکه،وه مجروری کـهی بـهپێی بناغهوئهصل[٣]، کـهوابوو دهڵێـی:((لـدُنْ غُـدْوةً وعَـشِيَّةً ،وعَـشِيَّةٍ))پێـشهوا ئهخفـهش ئهمـهی باسکردووه.

هـهروهها کوفییـهکان گێڕاویانهتـهوه مرفـوع کردنـی نـاوی(غُـدوهً)لـه پـاش (لدُن)ولهم کاتهدا مرفوعه به (کان)ـهیهکی حذفکراو،وتقدیرهکهی:لـدُن کانـت غُـدوةٌ،ولێـرهدا کـان دهبێتـه تـام[٤].هـهروهها(مع)نـاوه بـۆ شـوێن یـان کـاتی لهگهڵدابوون،وهکو:((جلس زيدٌ مَعَ عَمرٍو , وجاء زيدٌ مَعَ بَكرٍ))وه ئـهوهی بـاووه ئهوهیـه کـه حـهرفی عینهکـهی مفتوحـه،وه نـاوێکی معربه،وفتحهکـهی فتحـهی معرب بوونه،وه ههندێ لهعهرهب حهرفی عینهکی ساکن دهکهن،وهکو ووتهی:

---

[٢] ماناو بهڵگهی ئهم دێرهش:بهردهوام جوانووهکهم دووربوو لێیان لهسهرهتای ڕۆژ تا خۆرئاوابوون. . **بهڵگهکهی**:(لدُن غُدوةً) ناوی غدوة منصوبه له پاش لدُن.

[٣] ئهصل وایه ناوی پاش لدُن مجرور بێ.

[٤] له شهرح وڕاڤهی دێری(١٥٠)ـی ئهلفیه باسی(کان)ـهی تامهمان کرد.

٢٣٤-فَرِيشِي مِنْكُمُ وهَوَايَ مَعْكُمْ   وإنْ كَانَتْ زِيارَتُكُمْ لِمَامَا[1].

پێشەوا سیبویه پێی وایه ساکن کردنی حەرفی عینەکەی ناچاری (ضرورة)، بەلاّم وا نیه،بەڵکو لغەوخوێندنەوەی ربیعەیە[2]،بەلایانەوە مبنیە لەسەر سکون، هەندێکیان ووتوویانە ئەگەر عینەکەی ساکن بێ ئەوە حەرفە، وپێشەوا نەحّاس پێی وایە یەکدەنگ (إجماع)ـی لەسەرە،ئەمەش ڕاست نیە،چونکە پێشەوا سیبویە فەرموویەتی ئەوەی عینەکەی ساکنە اسمە.

ئەمە حوکمی عینی(مع)بوو-مەبەستم ئەوەیە مفتوح دەبێ،کە ئەمەش بۆچوونی باوە،وە ساکن دەبێ لەسەر لغەوبۆچوونی ربیعە- ئەگەر بەدوایدا حەرفی بزواو(متحرك)هات،جا ئەگەر بەدوایدا حەرفی ساکن هات،ئەوە ئەوانەی منصوبی دەکەن لەسەر ظرفیەت بوون فتحەکەی دەهێڵنەوە، کەوابوو دەڵێ:((مَعَ ابْنِكَ))،وە ئەوانەی مبنی دەکەن لەسەر سکون دەیکەنە کسرە لەبەر گەشتنی دووساکن بەیەك،ودەڵێ:(( مَعِ ابْنِكَ)).

* * *

***باسی حوکمی هەریەك لە( غیر،وقبل،وبعد )وچەند ناوێکی تر:**

٤١٠-وَاضْمُمْ بِنَاءً غَيْراً إنْ عَدِمْتَ مَا   لَهُ أُضِيفَ نَاوِيـاً مَا عُدِمَــا

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: هەرچی پۆشاکی چاك ومالّم هەیە لە ئێوەوەیە،هەرچەندە سەردانیتان بۆم کەمە. بەڵگەکەی:( مَعْكُمْ..)حەرفی عینەکەی ساکنە.

[2] ربیعە:یەکێکن لە هۆزەکانی عەرەب،وخاوەن لغەولهجەی خۆیانن.

٤١١-قَبْـــلُ كَغَيْرُ وبَعْدُ حَسْبُ أَوَّلُ ودُونُ وَالجِهَـــاتُ أَيْضاً وَعَلُ
٤١٢-وَأعْرَبُـــوا نَصْباً إِذَا مَا نُكِّرَا قَبْلاً وَمَا مِنْ بَعْدِهِ قَـــدْ ذُكِرَا[1].

ئەم ناوانەی باسکراون-کە بریتین لە:غیرُ،وقبلُ، وبعد،وحسب، وأوّل،ودونُ، وشەش ڕووەکە_کە بریتین لە: أمامُ،وخلفُ،فوق،تحت، یمین،شمال_وعلُ-، چوار حاڵتیان هەیە:لەیەك حاڵتیان مبنی دەبن،ولەوانی تریان معربن.

معرب دەبن کاتێ کە إضافەبکرێن بە لفظ[2]،وەکو((أصَبْتُ درهماً لا غیرَه،وجئتُ من قبلِ زیدٍ))،یان إضافەبکرێن ومضاف إلیەکە حذف بکرێ ونیەتی حذفکراوەکە هەبێ[3]،وەکو ووتەی:

٢٣٥- ومِنْ قَبْلِ نَادَى كلُّ مَوْلًى قَرَابَةً فَمَا عَطَفَتْ مَوْلًى عليه العَوَاطِفُ[4].

لەم حاڵەتەدا وەکو ئەوە وایە کە مضاف إلیە لفظەکەی مابێ،وە تنوین وەرناگرن مەگەر لە کاتێکدا مضاف إلیە حذف کرێ ونیەتی لفظ وماناکەی نەبێ،لەم کاتەدا دەبێتە نەناسراو[5]،وەکو خوێندنەوە ئەوانەی ئەم

---

[1] کورتەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە: ٤١٠-مبنی بکە لەسەر ضمة ناوی(غیرُ)ئەگەر ناوە مضاف إلیە کەی حذفکرابوو،ووە نیەتی ماناکەی هەبوو. ٤١١-ناوی قبلُ وەکو غیرُ وایە،هەروەها هەریەك لە{بعدُ،حسبُ،اوّلُ، دونُ، شەش ڕووەکە-کە بریتین لە امامُ،وخلفُ،فوق،تحت، یمین،شمال-،و علُ. ٤١٢-وە بە معربیان داناوە ناوی(قبلُ)و ئەوانەی پاشی کاتێ کە مضاف إلیەکەیان حذف کرێ وماناکەی مەبەست نەبێ.

[2] ئەمە حاڵەتی یەکەمە لە سێ حاڵتەکە.

[3] ئەمەش حاڵەتی دووەمە.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:پێشتر بانگی کردو داوای یارمەتی کرد هەموو خزمێك لە خزمەکەی،بەلاّم هیچیان وەلاّمی نەدانەوە. بەڵگەکەی:( ومِنْ قَبْلِ..)لێرەدا ناوی قبل معربە،لەبەر ئەوەی مضاف إلیە حذفکراوە ونیەتی لفظەکەی هەیە،وتقدیرەکە:ومِن قبلِ ذلك.

[5] ئەمەش دەبێتە حاڵەتی سێیەم.

ئایەتـەیان بم شـێوەیە خوێندۆتـەوە﴿...لِلَّهِ الأَمْرُ مِـنْ قَبْلٍ وَمِـنْ بَعْدٍ..﴾[١]،بـە مجرورکردنی(قبل وبعد)وتنوین پێدانیان، وە وەکو ووتەی:

٢٣٦- فَسَاغَ لِيَ الشَّرَابُ وَكنتُ قَبْلاً أَكَادُ أَغَصُّ بالمَـاءِ الحَمِيمِ[٢].

ئەمە ئەو سێ حاڵەتە بوون کە تێیدا معرب دەبن.

وە حاڵەتی چوارەم کە تێیدا مبنی دەبن ئەوەیە کە مضاف إلیه حذفکرێ ماناکـەی مەبەسـت بـێ بـەبێ لفظـەکەی،لـەم کاتـەدا مـبنی دەبـن لەسـەر ضمة،وەکو﴿..لِلَّهِ الأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ..﴾[٣]،وە وەکو ووتەی:

٢٣٧-* أَقُبُّ مِنْ تَحتُ عَرِيضٌ ومِنْ عَلُ [٤]*.

هەروەها پێشەوا ابو علی فارسی گێڕاویێتیەوە((ابدأ بذا مِنْ أوّلُ))بـە ضمەی لامەکەی وفتحە وکسرە خوێندنەوەی-جا ئەگەر ضمەی هـەبێ ئـەوە مبنیە لەبەرئـەوەی مـضاف إلیـە هەیـە بەمانا،وەئەگـەر فتحـەی هـەبێ ئـەوە معربـە

---

[١] بەشێکە لەئایەتی(٤)ی سورەتی(الروم)،پوختەی ماناکەی:هەموو کاروبار تەنها بەدەست خوایە لەپێش(سەرکەوتن)ولە پاش(سەرکەوتن). إعرابەکەی:لله:جارومجرور في محل رفع خبر مقدم. الأمر:مبتدأ مؤخر.من قبلٍ:جارومجرور متعلقان بمحذوف حال. ومن بعدٍ:مثله. الشاهد فيه((من قبلٍ ومن ومن بعدٍ)الظرفان(قبل وبعد)في هذه القراءة اسمان تامان ينوّنان تنوين تمكين،كما تنون النكرات،وذلك لأنهما انقطعا عن الإضافة لفظا ومعنىً،فصارا نكرتين.

[٢]ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:وای لێ هات تام وچێژم وەرگرت لە خواردنەوە ،کە پێشتر خۆشیم لا نەمابوو وهەراسان ببووم وتەنانەت ئاوی ساردوسازگاریشم بە ناڕەحەت دەنۆشی. بەڵگەکەی:(( وکنتُ قَبْلاً))ناوی قبلا معربە ومنوّنە،لەبەر ئەوەی دابڕاوە لە إضافە بە لفظ ومانا.

[٣] ئەم ئایەتە لای زۆربەی قورئان خوێنان بەم شێوەیە خوێنراوەتەوە،وپێشتر ماناو إعرابمان کرد.

[٤]ماناوبەڵگەی ئەم نیو دێڕە:ئەو ئەسپە لاوازە لە ژێرەوە ولە سەرەوە پانە. بەڵگەکەی:((مِنْ تحتُ ..ومِنْ عَلُ))ئەم دوو ناوە مبنێن لەسەر ضمة،لەبەر ئەوەی مضاف إلیه کەیان بەلفظ حذف کراوە وبەمانا ماوە.

لەبەر ئەوەی مضاف إليه نيە بە لفظ ومانا،وإعرابيش دەكریٚ بە ناویٚكی غير منصرف[1] لەبەر ئەوەی صفەيە ولەسەر وزنی فعلە[2]، وە ئەگەر كسرەی هەبیٚ ئەوە لەبەر ئەوەيە كە نيەتی مضاف إليه هەيە بە لفظ.

جا ووتەی دانەر((وَاضْمُمْ بِنَاءً–دیٚرەكە[3]))ئاماژەيە بۆ حاڵەتی چوارەم.

وە ووتەی((نَاوِياً مَا عُدِمَا))مەبەستی ئەوەيە كە مبنی دەكەی لەسەر ضمە ئەگەر مضاف إليه حذف كەی ونيەتی ماناكەيت هەبیٚ بەبیٚ لفظە كەی.

هەروەها ئاماژەی كرد بەووتەی((وَأَعْرَبُوا نَصْباً)) بۆ حاڵەتی سیٚيەم،كە بريتيە لەوەی كە مضاف إليه حذفكەی ونيەتی لفظ وماناكەيت نەبیٚ،لەم حاڵەتەدا معربە ونەناسراوە. وە ووتەی((نَصْباً))مانای ئەوەيە منصوبی دەكەی ئەگەر حەرفە جەڕی نەچیٚتە سەر،خۆ ئەگەر چۆيە سەری ئەوە مجروری دەكات، وەكو((مِنْ قبلٍ ومِنْ بَعدٍ)).

وە دانەر باسی دوو حاڵەتەكەی تری نەكرد–مەبەستم يەكەم ودووەمە– چونكە حوكمەكەيان ئاشكراو زانراوە لەسەرەتای بابەتەكەوە–كە بريتيە لە معرب بوون ونەمانی تنوين–هەروەكو پیٚشتر باسكرا لەوەی كە هەموو ناویٚ إضافە بكریٚ وای لیٚ دەكریٚ.

*    *    *

### *حذف كردنی مضاف ودانيشتنی مضاف إليه لەجیٚی:

---

[1] پیٚشتر لەدیٚڕی(٤٣)ی ئەلفيە باسی ناوی(غير منصرف)مان كرد.

[2] لە زمانی عەرەبيدا هەر ناویٚ ممنوع من الصرف–يان غير منصرف–بیٚ دەبیٚتە دوو هۆی تیٚدا بیٚ لەو هۆكارانەی ناو دەكەنە ممنوع من الصرف،كە لەبابەتەكانی دواتر بە تفصيل باسی دەكەين إنشاء الله.

[3] واتا:دیٚڕی ژمارە ٤١٠ی ئەلفيە.

٤١٣-وَمَا يَلِي الْمُضَافَ يَأْتِي خَلَفَا عَنْهُ فِي الإِعْرَابِ إِذَا مَا حُذِفَا[١]

مضاف حذف دەکریٚ ئەگەر بەڵگە هەبیٚ لەسەری،ومضاف إليه جێی دەگریٚ،وإعرابی ئەو وەردەگریٚ،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿...وَأُشْرِبُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ...﴾[٢]،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَجَاءَ رَبُّكَ..﴾[٣]واتا:أمر ربّك[٤]، مضافەکە حذف کراوە-کە بریتیە لە((حُبّ،وأمر))-وە مضاف إليه کە إعرابی ئەوی وەرگرتووە-کە بریتیە لە((العجل،وربّك)).

* * *

٤١٤- وَرُبَّمَا جَرُّوا الَّذِي أَبْقَوْا كَمَا قَدْ كَانَ قَبْلَ حَذْفِ مَا تَقَدَّمَا

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەوەی لە پاش مضافەوە دیٚ-واتا:مضاف إليه-جێی دەگریٚ لە إعراب دا کاتیٚ مضاف حذف کریٚ.

[٢] بەشێکە لەئایەتی(٩٣)ی سورەتی(البقرة)،پوختەی ماناکەی:دڵیان ئاو درابوو بە خۆشەویستی گوێرەکە بەهۆی بیٚ باوەڕیانەوە. إعرابەکەی: و:حسب ماقبله .أشربوا:فعل ماضٍ مبني للمجهول،و واوالجماعة:في محل رفع نائب فاعل. في قلوب:جارومجرور،وقلوب مضاف،هم:في محل جر مضاف إليه. والجاروالمجرور متعلقان بـ(أشربوا). العجلَ:مفعول به ثان منصوب. بكفرهم: مثل(في قلوبهم). الشاهد فيها:حذف المضاف لوجود قرينة دالة عليه،وقيام المضاف إليه مقامه،والتقدير:واشربوا في قلوبهم حبّ العجل.

[٣] بەشێکە لەئایەتی(٢٢)ی سورەتی(الفجر)،پوختەی ماناکەی:پەروەردگارت دیٚ... إعرابەکەی: فعل وفاعل،ومضاف إليه. الشاهد فيها: حذف المضاف(أمر) لوجود قرينة دالة عليه،وقيام المضاف إليه(ربّك) مقامه،والتقدير:وجاء أمر ربّك.

[٤] هەندیٚ لەزانایان بەم جۆرە تەفسیریان کردووە،ئەمەش جۆرێکە لەتأویل کردنی ئەو ئایەتانەی کە باسی ناو وسیفەتەکانی خوای گەورە دەکەن،بەڵام بۆچوونی ڕاست ودروست ئەوەیە کە بەم شێوەیە تەفسیر نەکریٚ،وبە مانای ئاشکرا(ظاهر)ی لێکدرێتەوە وتەفسیر بکریٚ.

٤١٥–لَكِنْ بِشَرْطِ أَنْ يَكُونَ مَاحُذِفْ       مُمَاثِلاً لِمَا عَلَيْهِ قَـــدْ عُطِفْ[١].

هەندێ جار مضاف حذف دەکرێ ومضاف إليه بە مجروری دەمێنێتەوە، هەر وەکو ئەوەی مضافەکە هەبێ، بەمەرجێ ناوە حذفکراوەکە هاوشێوەی ئەو ناوە بێ کە بۆلای عطف کراوەتەوە،وەکو ووتەی شاعر:

٢٣٨– أَكُلَّ امْرِىءٍ تَحْسَبِينَ امْرَأً      ونَارٍ تَوَقَّدُ باللَّيلِ نَارَا[٢].

تقدیرەکەی بریتیە لە((كُلّ نارٍ))جا ووشەی((كُلّ))حذف کراوە ومضاف إليەکە بەمجروری ماوەتەوە هەروەکو ئەوەی مضافەکە مابێ وحذف نەکرابێ،مەرجەکەش هەیە کە بریتیە لە:عطف کردنەوەی مضافەکە بۆ سەر ناوێکی هاوشێوەی خۆی کە بریتیە لە((كُلّ))لە ووتەی((أَكُلَّ امْرِىءٍ)).

وە هەندێ جار مضافەکە حذف دەکرێ،ومضاف إليەکە بەمجروری دەمێنێتەوە،وناوە حذفکراوەکەش هاوشێوەی ناوە باسکراوەکە نیە،بەڵکو بەرامبەرێتی،وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿...تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ...﴾[٣]، لەخوێندنەوەی ئەوانەی ووشەی((الآخِرَةِ))بە مجروری

---

[١] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤١٤–وە هەندێ جار مضاف حذف دەکرێ ومضاف إليه بەمجروری دەمێنێتەوە. ٤١٥–بەمەرجێ ناوە حذفکراوەکە عطف کرابێتەوە بۆسەر ناوێکی هاو شێوەی خۆی.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئایە وا دەزانی هەموو مرۆڤێك مرۆڤە، وە هەموو نارێك کە بەشەو گری هەبێ وبسوتێ ئاگرە. بەڵگەکەی:( ونَارٍ..)لێرەدا مضافەکە حذف کراوە–کە بریتیە لە ووشەی كُلّ–ومضاف إليه کە–کە ووشەی نارٍ بە مجروری ماوەتەوە،لەبەر ئەوەی مضافەکە عطف کراوەتەوە بۆسەر ناوێکی هاوشێوەی خۆی کە(كُلَّ امْرِىءٍ)ـە.

[٣] بەشێکە لە ئایەتی(٨٧)ی سورەتی(الأنفال)،پوختەی ماناکەی:ئێوەی ماڵی دونیاتان دەوێ،وە خواش پاداشتی ڕۆژی دوای دەوێ بۆ ئێوە. إعرابەکەی: تُرِيدونَ:فعل وفاعل. عرضَ:مفعول به،وهو مضاف. الدنيا:مضاف إليه مجرور وعلامة جره الكسرة المقدرة على الألف للتعذر. واللهُ:و:حرف استئناف، اللهُ:مبتدأ مرفوع. يريدُ:فعل وفاعل. الآخرةَ:مفعول به. وجاء في قراءة شاذة

خوێندۆتەوە وتقديرەکەی((وَاللَّهُ يُرِيدُ باقيَ الْآخِرَةِ))،وە هەندێ تقديرەکەيان بە((وَاللَّهُ يُرِيدُ عرضَ الْآخِرَةِ))کردووە،وبەم تقديرەيان حذف کراو هاوشێوەی باسکراوەکەیە،وە تقديری يەکەم لە پێشترە،وبەو شێوەيەش ابن أبی الربيع تقديری کردووە لە شەرحکردنی بۆ کتێبی الايضاح.

* * *

٤١٦- وَيُحْذَفُ الثَّانِ فَيَبْقَى الأَوَّلُ كَحَالِهِ إِذَا بِهِ يَتَّصِلُ

٤١٧-بَشَرْطِ عَطْفٍ وَإِضَافَةٍ إِلَى مِثْلِ الَّذِى لَهُ أَضَفْتَ الأَوَّلا[(١)]

هەندێ جار مضاف إليه حذف دەکرێ ومضافەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، وتنوينەکەی حذف دەکرێ،زۆرتريش وايە ئەمە کاتێ دەبێ کە عطف کرابێتە سەر مضافەکە ناوێکی مضافی تر بۆ لای هاوشێوەی ناوە حذفکراوەکەی يەکەم،وەکو ووتەيان:((قَطَعَ اللهُ يَدَ وَرِجْلَ مَنْ قالها))تقديرەکەی: (( قَطَعَ اللهُ يَدَ مَنْ قالها، وَرِجْلَ مَنْ قالها))حذف کراوە ئەوەی کە ووشەی((يد))ـی بۆلا إضافە کراوە کە بريتيە لە((مَنْ قالها))لەبەر ئەوەی ووشەی((رِجْلَ)) إضافەکراوە بۆلای هەمان شت کە مانای ئەو دەگەيێنێ،وە وەکو ووتەی:

٢٣٩-*سَقَى الأَرَضِينَ الغَيْثُ سَهْلَ وحَزْنَهَا*[(٢)]. تقديرەکەی((سَهْلَها وحَزْنَهَا))لەبەر ئەوەی ووشەی((حزن))إضافەکراوەو ماناکەی ديارەو بەڵگەيە بۆ ئەويش.

---

جرّ(الآخرةِ)فحذف المضاف وهو(عرضَ)وبقي عمله.وجملة(يريدُ الآخرة)في محل رفع خبر المبتدأ(اللهُ). الشاهد فيها:( يُرِيدُ الْآخِرَةَ..)حيث قرئ بجرّ الآخرة على قراءة شاذة.

(١) پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفيە:٤١٦-هەندێ جار مضاف إليه حذف دەکرێ ونامێنێ،ومضافەکەش وەکو خۆی دەمێنێتەوە-واتا:وەکو ئەوەی مضاف إليه حذف نەکرابێ-. ٤١٧-بەمەرجێ عطف کرابێتەوە بۆ سەر مضافەکە ناوێکی مضافی تر بۆلای ناوێکی هاو شێوەی ئەو ناوەی کە مضافەکەی يەکەمی بۆلا إضافەکراوە.

(٢) ماناو بەڵگەی ئەم نيو دێڕە: بارانەکە گرتێوە زەوی بە نەرم ورەقی. بەڵگەکەی:((سَهْلَ وحَزْنَهَا))ووشەی سهل إضافەکراوە و مضاف إليەکە حذفکراوە.

ئەمە روونكردنەوەی بۆچوونی دانەر بوو،وە هەندێ جار ئەمە ڕوو دەدات هەرچەندە عطفیش نەكرێتەوە ناوێكی مضاف تر بۆ لای هاوشێوەی ناوەكەی یەكەم،وەكو ووتەی:

وَمِنْ قَبْلِ نَادَى كلُّ مَوْلًى قَرَابَةً فَمَا عَطَفَتْ مَوْلًى عليه العَوَاطِفُ[1].

لێرەدا حذفكراوە ئەوەی كە ناوی((قبل))بۆلا إضافەكراوە ومضافەكەش وەكو خۆی ماوەتەوە وەكو ئەوەی كە مضاف إلیەكەی حذف نەكرابێ، وناوێكی مضافیش عطف نەكراوەتەوە بۆ هاوشێوەی مضافەكە، وتقدیرەكەی ((ومن قبلِ ذلك))،وە وەكو خوێندنەوەی ئەوەی كە خوێندوویەتێوە بە شاذی ئەم ئایەتە﴿فَلَا خَوْفُ عَلَيْهِمْ﴾واتا: فَلَا خَوْفُ شيءٍ عَلَيْهِمْ.

وە ئەمەی كە دانەر باسی كرد-لەوەی كەحذفكراوِ لەیەكەم دەبێ، ودووەمیش إضافەكراوە بۆلای باسكراو-بۆچوونی پێشەوا مُبرّدە.

وە بۆچوونی پێشەوا سیبویە وایە كە ئەصڵەكەی((قَطَعَ اللهُ يَدَ مَنْ قالها وَرِجْلَ مَنْ قالها))جا حذفكراوە ئەوەی كە ناوی((رِجل))ی بۆلاإضافەكراوە ورستەكە بۆتە((قَطَعَ اللهُ يَدَ مَنْ قالها وَرِجْلَ))پاشان ووشەی((رِجل))هاتۆتە نێوان مضافەكە-كە بریتیەلە((يدَ))-ومضاف إلیەكە كەبریتیە لە((مَنْ قالها))-وبۆتە((قَطَعَ اللهُ يَدَ وَرِجْلَ مَنْ قالها)).بەم پێیە حذفكراو لە دووەمە،نەوەك لەیەكەم،وە بۆچوونی مُبرد پێچەوانەیە.

هەندێ لە ڕاڤەكارانی كتابی سیبویە فەرموویانە:لای پێشەوا فەڕا هەردوو ناوەكە[2]إضافەكراون بۆلای((مَنْ قالها))وهیچ لە ڕستەكە حذف نەكراوە:نە لەیەكەم،ونە لە دووەم.

---

[1] پێشتر لە شاهدی ژمارە(٢٣٥)مانای ئەم دێڕەمان كرد،لێرەشدا بۆ ئەوە هاتووە كە(قبل))إضافەكراوە ومضاف إلیە كەی حذفكراوە،وتنوینەكەی لێكراوەتەوە.

[2] واتا:هەردوو ناوەكەی ڕستەی((قَطَعَ اللهُ يَدَ وَرِجْلَ مَنْ قالها)).

***باسى بەين كردنى مضاف ومضاف إليه :**

٤١٨- فَصْلَ مُضَافٍ شِبْهِ فِعْلٍ مَا نَصَبْ ‌‌‌‌‌‌‌‌ مَفْعُولاً أَوْ ظَرْفاً أَجِزْ وَلَمْ يُعَبْ

٤١٩-فَصْلُ يَمِينٍ وَاضْطِرَاراً وُجِـــدَا ‌‌‌‌‌‌‌‌ بِأَجْنَبِيّ، أَوْ بِنَعْتٍ ،أَوْ نِـــدَا[١].

**بەدروستى دەزانىٚ دانەر-بە بۆچوونى هەڵبژێراو-بەين كردنى مضافێك كە هاوشێوەى فعلە-مەبەست پێى مصدر،واسمى فاعلە-ومضاف إليەكەى،كە منصوب بووە بە مضافەكە،مفعول بە بىٚ،يان ظرف بىٚ،يان هاوشێوەى[٢].**

**جا نموونەى ئەوەى بەينيان كرابىٚ بە مفعولى مضافەكە فەرموودەى خواى گـــەورە﴿وَكَــذَلِكَ زُيِّـنَ لِكَثِـيرٍ مِـنَ الْمُــشْرِكِينَ قَتْـلُ أَوْلَادَهُـمْ شُـرَكَائِهِمْ..﴾[٣]لـــە خوێندنەوەى ابن عامر[٤]،بە منصوب كردنى(أولاد)ومجروركردنى(شركاءِ).**

---

[١] **كورتەى ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفيە:٤١٨-دروستە بەين كردنى مضافێك كە هاوشێوەى فعلە-واتا:مصدر ،يان اسمى فاعل -ومضاف إليەكەى كە مفعولە يان ظرفە،وە ناشيرين نيە.٤١٩-بەين كردنيان بە سوێند(قسم)،وە بە ناچاريش هاتووە بەين كردنيان بە ووشەيەكى بێگانە-واتا:ناوىٚ كە پەيوەندى بە مضاف ومضاف إليەوە نيە-،يان بە صفە،يان بە بانگكردن(النداء).**

[٢] **مەبەست لە هاوشێوەى ظرف جارومجرورە.**

[٣] **بەشێكە لە ئايەتى(١٣٧)ى سورەتى(الأنعام)،پوختەى ماناكەى:ئا بەو شێوەيە شەيتانەكان كوشتنى ڕۆڵەكانيان بۆ زۆر لە هاوەڵگرەكان ڕازاندۆتەوە. إعرابەكەى:** و:حسب ما قبلها.كذلك:كـ:حرف جر.ذلك:اسم إشارة مبني في محل جر اسم مجرور،والجاروالمجرور في محل نصب نعت لمصدر محذوف. زُيِّنَ:فعل ماضي مبني للمجهول-وهذا في قراءة ابن عامر-.لكثيرٍ:جارومجرور متعلقان بـ(زُيِّن). من المشركينَ:جارومجرور متعلقان بمحذوف نعت لكثير. قتلُ:نائب فاعل(زُيِّن). أولادَ:مفعول به للمصدر(قتلُ)،وهو مضاف،همْ:ضمير متصل في محل جر مضاف إليه.شركائِهم:مضاف إليه مجرور،وهو مضاف،وهم:في محل جر مضاف إليه. **الشاهد فيها:إضافة قتل إلى الشركاء،وقد فصل بين المضاف(قتلُ)والمضاف إليه(شركائهم)بغير الظرف(أولادَ). وهذا الإعراب بعيدٌ،ومخالف للقراءة المشهورة.**

[٤] **يەكێكە لە دە قورئان خوێنەكە(القراء العشر).**

وە نموونەی بەین کردنی مضاف ومضاف إلیه بە ظرفێ کە مضافەکە منصوبی کردووەو مصدرە،ئەوەیە کە گێڕدراوەتەوە لە هەندێ لەوانەی کە متمانە بە عەرەبییەکەیان هەیە:((تَرْكُ یوماً نَفْسِك وهَوَاها سَعْيٌ لها في رَدَاها))[١].

وەنموونەی بەین کردنی مضاف ومضاف إلیه بە مفعولی مضافەکە کە اسمی فاعل بێ خوێندنەوەی هەندێ لە پێشینانە بۆ ئایەتی﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدَهُ رُسُلِهِ..[٢]﴾بە منصوب کردنی((وعد))ومجرورکردنی((رُسُل)).

وە نموونەی بەین کردنیان بە هاو شێوەی ظرف فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ لە فەرموودەکەی ئەبو دەرداﷺ:((..هَلْ أَنْتُمْ تَارِكُو لِي صَاحِبِي))[٣]،ئەمە بوو مانای ووتەی دانەر((فَصْلَ مُضَافِ-تا کۆتای)).

---

[١] واتا:وازهێنانی یەك ڕۆژ لەهەواو ئارەزووەکانت،هەوڵدانە بۆگێڕانەوەی لە تیاچوون.

[٢] بەشێکە لە ئایەتی(٤٧)ی سورەتی(إبراهیم)،پوختەی ماناکەی:جا وا گومان مەبە خوا بەدی ناهێنێ ئەو بەڵێنەی داوێتی بە پێغەمبەرانی-سەلامی خوایان لێ بێ-. إعرابەکەی:فـــ:حسب ما قبلها. لا:ناهیة جازمة. تحسبَنّ:فعل مضارع مبني على الفتح لاتصاله بنون التوکید الثقیلة،في محل جزم بــ(لا)، وفاعله:ضمیر مستتر فیه وجوبا تقدیره(أنت). اللهَ:مفعول به أول. مخلفَ:مفعول به ثان،وهو مضاف. وعدَهُ: مفعول به لاسم الفاعل(مُخلِف)وهو مضاف،والهاء:ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه.رسُلِهِ:مضاف إلیه مجرور،وهو مضاف، والهاء:ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه. **الشاهد فیها:الفصل بین المضاف(مُخلف)والمضاف إلیه(رسله)بمفعول المضاف الذي هو اسم الفاعل(وعدَه)،وهذا على قراءة بعض السلف،والقراءة المشهورة للآیة هي﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ﴾**

[٣] بەشێکە لە فەرموودەی ژمارە(٣٤٦١)صحیحی بوخاری،پوختەی ماناکەی:ئایە ئێوە واز لە هاوەڵ وخۆشەویستەکەم-کە ئیمامی ئەبوبکرەﷺ ناهێنن-کاتێك فەرمووی کە یەکێ لە هاوەڵان ئەبوبەکری تورە کرد،وپێغەمبەریش ﷺتوڕە بوو و وای فەرموو. إعرابەکەی: هلْ:حرف استفهام. أنتم:ضمیر منفصل مبني على السکون في محل رفع مبتدأ. تارکو:خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو لأنه جمع مذکر وحذفت النون لأنه مضاف. لي:جارومجرورمتعلقان بــ(تارکو). صاحب:مضاف إلیه مجرور،وهو مضاف،ي:ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه. **الشاهد فیها:الفصل بین المضاف(تارکو) والمضاف إلیه (صاحبي)بحرف جر.**

هەروەها هاتووە بەین کردن لە بۆچوونی پەسەند بە سوێند،پێشەوا کسائی گێڕاوێتیەوە:(( هذا غلامُ واللهِ زیدٍ))بۆیە دانەر فەرمووی((وَلَمْ يُعَبْ فَصْلُ يَمِينٍ)).
هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:(( وَاضْطِرَاراً وُجِدَا)) بۆ ئەوەی کە هاتووە بەین کردنی مضاف ومضاف إلیە لە ناچاری(ضرورة)شعری:بە ووشەیەکی بێگانەی مضافەکە،یان بە نعتی مضافەکە،یان بە نداء.
جا نموونەی بەین کردن بە ووشەی بێگانە ووتەی:
٢٤٠-كَمَا خُطَّ الكتابُ بِكَفِّ يَوماً يَهُودِيٍّ يُقَارِبُ أو يُزِيـــلُ[١].
لێرەدا بەین کراوە بەووشەی((یوماً))لە نێوان((کفّ))و((یهودی))، و(یوما)بێگانەیە بۆ ووشە(کف)وهیچ پەیوەندییەکی پێوە نیە،ومعمولی فعلی(خُطَّ)ـەیە. وە نموونەی بەین کردنیان بە نعت ووتەی:
٢٤١- نَجَوْتُ وقَدْ بَلَّ الْمُرَادِيُّ سَيْفَهُ مِنَ ابْنِ أَبِي شَيْخِ الأَبَاطِحِ طَالِبِ[٢].
ئەصڵەکەی((مِنَ ابْنِ أَبِي طَالِبِ شَيْخِ الأَبَاطِحِ)).
هەروەها وەکو ووتەی:

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:شوێنەواری ئەوکەلاوەیە لە نوسینی جولەگە دەچێ کە هەندێ لە نووسینیەکەی لێك نزیکن وهەندێکی دوورن. بەڵگەکەی:(بِكَفِّ يَوماً يَهُودِيٍّ)بەین کراوە لە نێوان مضاف-کە(کفّ)-ومضاف إلیەکەی-کە(یهودیّ)ـە- بە ووشەیەکی بێگانەی مضافەکە-کە(یوماً).
[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:من دەربازبووم ورزگارم بوو-واتا:معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕەزای خوایان لێ بێ-لە کاتێکدا کابرای مرادی-مەبەست عبدالرحمنی کوڕی مُلجمە کە یەکێك بوو لە خوارجەکان وخەڵکی یەمەن بوو-مراد یەکێکە لەهۆزەکانی یەمەن-،وئیمامی عەلی ﷺ شەهید کرد-شمشێرەکەی تەڕ کرد بە خوێنی کوڕی ئەبی طالب کە پیاوماقوڵی شاری مەککە بوو. بەڵگەکەی:( أَبِي شَيْخِ الأَبَاطِحِ طَالِبِ) بەین کراوە لە نێوان مضاف-کە(ابی)-ومضاف إلیەکەی-کە(طالب)ـە- بە نعت وصیفەتی مضافەکە-کە(شَيْخِ الأَبَاطِحِ)ـە.

٢٤٢- وَلَئِنْ حَلَفْتُ على يَدَيْكَ لأَحْلِفَنْ    بِيَمِينِ أَصْدَقَ مِنْ يَمِينِكَ مُقْسِمِ[1].

ئەصلّەکەی((بِيَمِينِ مُقْسِمٍ أَصْدَقَ مِنْ يَمِينِكَ مُقْسِمٍ)).

**وە نموونەی بەین کردنیان بە نداء ووتەی:**

٢٤٣- وِفاقُ كَعْبُ بُجَيْرٍ مُنْقِذٌ لكَ مِنْ    تَعْجِيلِ تَهْلُكَةٍ والخُلْدِ في سَقَرِ[2].

**وە وەکو ووتەی:**

٢٤٤- كأنَّ بِرْذَوْنَ أَبا عِصَامِ    زَيْدٍ حِمَارٌ دُقَّ باللِّجَامِ[3].

* * *

---

(١) ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش:بێگومان ئەگەر سوێند بخۆم لەسەر سەخاوەت وبەخشندەی تۆ ئەوە ئەوەندە بێگومانم سوێندی من ڕاستر دەبێ لە سوێندی خۆت. **بەڵگەکەی**:( بِيَمِينِ أَصْدَقَ مِنْ يَمِينِكَ مُقْسِمِ) بەینی کردووە لە نێوان مضاف-کە(يمين)- ومضاف إليەکەی-کە(مُقسم)ـە- بە نعت وصیفەتی مضافەکە-کە أَصْدَقَ مِنْ يَمِينِكَ-یە.

(٢) ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەم کردارەی تۆ ئەی کعب وەکو کرداری بوجەیری براتە- واتا:مسوڵمان بوونت-کە ڕزگارت دەکا لە بەدبەختی وتیاچوونت ومانەوەت لە سزای هەمیشەی سقر-کە یەکێکە لە ناخۆشترین وسەختترین جێگاکانی دۆزەخ-. **بەڵگەکەی**:( وِفاقُ كَعْبُ بُجَيْرٍ) بەینی کردووە لە نێوان مضاف-کە(وفاق)-ومضاف إلیەکەی-کە(بُجیر)ـە- بە نداء کە(کعب)وە وحەرفی نداکەی حذفکراوە- و ئەصلّەکەی((وِفاقُ بُجَيْرٍ ياكَعْبُ مُنْقِذٌ لكَ)).

(٣) ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: ئەسپەکەی زەید-ئەی ئەبا عصام-وەکو گوێدرێژ وایە ئەگەر لغاوەکەی نەبێ-واتا:بچووکە ولە ئەسپ ناچێ-. **بەڵگەکەی**:( كأنَّ بِرْذَوْنَ أَبا عِصَامِ زَيْدٍ) بەینی کردووە لە نێوان مضاف-کە(بِرْذَوْنَ)-ومضاف إلیەکەی- کە(زَيْدٍ)ـە- بە نداء کە(أَبا عِصَامِ)وە وحەرفی نداکەی حذفکراوە- و ئەصلّەکەی((كأنَّ بِرْذَوْنَ زَيْدٍ يا أَبا عِصَامِ)).

## إضافەکردن بۆ لای یای مُتكلم[1]

٤٢٠–آخِرَ مَا أُضِيفَ لِلْيَا اكْسِرْ إِذَا ـــ لَـمْ يَكُ مُعْتَلاًّ كَـرَامٍ وَقَذَى

٤٢١–أَوْ يَكُ كَابْنَيْنِ وَزَيْدِينَ فَذِي ـــ جَمِيعُهَا اليَا بَعْدُ فَتْحُهَا احْتُذِي

٤٢٢–وَتُدْغَمُ اليَـا فِيهِ وَالوَاوُ وإِنْ ـــ مَا قَبْـلَ وَاوٍ ضُمَّ فَاكْسِرْهُ يَهُنْ

٤٢٣–وَأَلِفاً سَلِّمْ وَفِي الْمَقْصُورِ عَنْ ـــ هُذَيْلٍ انْقِلاَبُهَا يَـــاءً حَسَنْ[2].

**کۆتایی ناوی مضاف بۆلای یای متکلم مکسور دەبێ،ئەگەر ناوەکە مقصور نەبێ،وە منقوصیش[3] نەبێ،وە مثنّی نەبێ،و جمعی مذکری سالمیش نەبێ، وەکو ناوی مفرد وجمعی تکسیر کە کۆتاییەکەی حەرفی صحیح بێ،وە جمعی مؤنثی سالم بێ،وە ئەو ناوە معتلەی وەکو صحیح وایە[4]،وەکو((غُلامِي،غِلمانِي،وفتياتِي،و دلْوِي،ظَبْيِي)).**

---

[1] مەبەست لە یای متکلم جێناوی کەسی یەکەمی تاکە،لە بەرامبەر جێناوی(م)ی ڕێزمانی کوردییە،جا ئەم جۆرە إضافەکردنە لەزمانی عەرەبیدا زۆرە،وحوکمی تایبەتی خۆی هەیە،وابن عقیل لە شەرحەکەیدا باسی دەکات، وەئێمەش لە کاتی شەرحەکەدا دەڵێین یای مُتکلم.

[2] پوختەی مانای ئەم چوار دێڕەی ئەلفیە:٤٢٠–کۆتای ئەو ناوەی إضافە دەکرێ بۆلای یای مُتلَّکم مکسور بکە،ئەگەر کۆتاییەکەی حرفی علّە نەبوو وەکو(رامِ وقذی). ٤٢١–هەروەها ئەگەر مثنّا نەبوو وەکو(ابنَینِ)،وە جمعی مذکری سالم نەبوو وەکو(زیدینَ)،لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا–واتا:ئەگەر ناوەکە کۆتاییەکەی حەرفی علە بوو،یان مثنا بوو،یان جمعی مذکری سالم–یایەکە مفتوح دەبێ ومکسور نابێ. ٤٢٢–وە ئەگەر کۆتایی ناوەکە حەرفی واو بوو ئەوە لەگەڵ یایەکە تێهەڵکێش(إدغام)دەکرێ،وە لەم کاتەدا ضمەی پێش واوەکە دەکرێتە کسرە ساناتر وسووکترە–لەبەر ئەوەی ضمە لەگەڵ یای متکلم ناگونجێ–.٤٢٣–ئەگەر ناوەکە مثنا بوو لە حاڵەتی رفعدا–واتا:کۆتاییەکەی ئەلیف بوو–،یان مقصور بوو ئەوە ئەلیفەکەی دەمێنێتەوە،بەڵام لای هُذیل ئەلیفەکە دەکرێتە یا.

[3] پێشتر لە شەرحی دێڕی(٤٦)ی ئەلفیە باسی ناوی مقصور ومنقوص مان کرد.

[4] مەبەست لەو ناوە معتلەی وەکو صحیح وایە ئەوانەن:کە پێش واو ضمە نەبێ،وپێش یا کسرە نەبێ، دیارە ئەم جۆرە ناوانە لە زمانی عەرەبیدا زۆر کەمن.

جا ئەگەر ناوەکە معتل بوو،ئەوە یان مقصورە یان منقوصە،ئەگەر منقوص بوو ئەوە حەرفی کۆتاییەکەی-کە یایە- لە گەڵ یای مُتکلم تێهەڵکێش دەکرێ ویایە متکلمەکەش مفتوح دەکرێ، دەڵێی:((قَاضِيَّ))،هەرواش دەکرێ لە گەڵ مثنّی وجمعی مذکری سالم لە حاڵەتی نصب وجەڕدا[1]،کەواتا دەڵێی:(( رأيتُ غُلاَمَيَّ وزَيْدَيَّ))وە: ((ومررت بِغُلاَمَيَّ وزَيْدَيَّ))،ئەصڵەکەی:((بغُلاَمَيْنِ لِي، وزَيْدَيْنِ لِي))نونەکە ولامە[2] حذف کراون لەبەر إضافە،پاشان هەردوو یایەکە تێهەڵکێش کراون،ویایە مُتکلّمەکەش مفتوح کراوە.

وە بۆ جمعی مذکری سالم-لە حاڵەتی رفعدا- دەڵێی:((جاء زَيْدِيَّ))هەروەکو حاڵەتی نصب وجەڕ،وەئەصڵەکەی: زَيْدُويَ،حەرفی واو ویا کۆبوونەتەوە لەیەك ووشەدا ،ویەکەمیان ساکنە،بۆیە واوەکە کراواە بە یا،وپاشان ضمەکەی پێش واوەکە کراوەتە کسرە بۆ گونجانی لەگەڵ یایەکە،ودواتر بووە بە: زَيْدِيَّ. وە بۆ مثنّی-لە حاڵەتی رفعدا-ئەلیفەکەی دەمێنێتەوە ویایەکەش مفتوح دەکرێ،دەڵێی:((زَيْدَايَ ،وغُلاَمَايَ))لای هەموو عەرەب.

وە بۆ ناوی مقصور ئەوەی بۆچوونی باو و زانراوە لای عەرەب ئەوەیە وەکو مثنّای مرفوع دەبێ[3]،دەڵێی:((عَصَايَ،وفتايَ)). بەڵام هُذيل ئەلیفەکەی دەکەنە یا،ولەگەڵ یای متکلم تێهەڵکێشی دەکەن ویایە متکلمەکەش مفتوح دەکەن،کەوابوو دەڵێی:((عَصَيَّ))، وە ئەم ووتەیەش لەمەیە:

---

[1] چونکە مثنّی وجمعی مذکری سالم لە حاڵەتی نصب وجەڕدا کۆتاییەکەیان یایە.

[2] واتا:نونی(غلامین)و لامی(لی).

[3] واتا:ئەلیفەکەی دەمێنێتەوە،ویایەکەی مفتوح دەبێ.

٢٤٥- سَبَقُوا هَوَيَّ وأَعْنَقُوا لِهَوَاهُمُ فَتُخُرِّمُوا ولِكُلِّ جَنْبٍ مَصْرَعُ[(١)].

کەواتا: پوختەکەی ئەوەیە کە یای متکلم مفتوح دەبێ لەگەڵ ناوی منقوصدا، وەکو((رامِيَّ))، وە لەگەڵ ناوی مقصوردا وەکو((عَصَايَ))، وە لەگەڵ مثنی وەکو((غُلامَايَ)) لە حاڵەتی رفعدا، و((غُلامَيَّ)) لە حاڵەتی نصب وجەڕدا، وەلەگەڵ جمعی مذکری سالم وەکو((زَيْدِيَّ)). ئەمە بوو مانای ووتەی دانەر:((فَذِي جَمِيعُهَا اليَا بَعْدُ فَتْحُهَا احْتُذِي)).

هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی:(( وَتُدْغَمُ)) بۆ ئەوەی کە واوی جمعی مذکری سالم، ویای اسمی منقوص وجمعی مذکری سالم ومثنی، تێهەڵکێش دەکرێ لە گەڵ یای متکلم.

هەروەها ئاماژەی کرد بەووتەی:((وإنْ مَا قَبْلَ وَاوٍ ضُمَّ)) بۆ ئەوەی کە ئەگەر پێش واوی جمعی مذکر ضمە بوو ئەوە پێویستە بکرێتە کسرە کاتێ کە واوەکە دەکرێتە یا، بۆئەوەی یایەکە بە دروستی وتەواوی بمێنێتەوە، وە ئەگەر ضمة نەبوو-بەڵکو فتحە بوو-ئەوە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، وەکو((مُصْطَفَوْن)) دەڵێی:((مُصْطَفَيَّ)).

وە ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:(( وَألِفاً سَلِّمْ)) بۆ ئەو ناوانەی کە کۆتاییەکەیان ئەلیفە وەکو مثنی ومقصور، کە ئەلیفەکەیان ناگۆڕێ بۆ یا، بەڵکو دەمێنێتەوە وەکو خۆی، وەکو:(( غُلامَايَ)) و((عَصَايَ)).

---

(١) ماناوبەڵکەی ئەم دێرە: ئەو کوڕانەم پێش هیواو ئاواتەکانم کەوتن-کە دەمویست زیاتر بژین ودرەنگ تیاچن- ودوای هیواو ئاواتی خۆیان کەوتن-کە خۆیان لە مردن وترسناکییەکانی دەدا-، وتیاچوون، بێگومان هەموو مرۆڤێکیش دەمرێ. بەڵگەکەی: ((هَوَيَّ)) ئەصڵەکەی((هوايَ)) بووە وئەلیفەکەی کردووە بە یا ولەگەڵ یای متکلم تێهەڵکێشی کردووە، ئەمەش بۆچوونی هُذیلە.

هەروەها ئاماژەی کرد بەووتەی:(( وَفی الْمَقْصُورِ))بۆ ئەوەی کە هُذیل ئەلیفی مقصور دەگۆڕیٚ بۆ یا،دەڵیٚ((عَصَيَّ)).

وە جگە لەم چوارە[1] دروستە یایەکەی:مفتوح بکەی،وە دروستە ساکنی بکەی،دەڵێی:(( غُلامِيَ، وغُلامِي)).

## *لێرەدا بابەتی إضافە کۆتایی هات.

[1] واتا:جگە لە جمعی مذکری سالم ومثنی واسمی منقوص واسمی مقصور.

## عەمەل کردنی مصدر(1)

٤٢٤-بِفِعْلِهِ الْمَصْدَرَ أَلْحِقْ فِى الْعَمَلْ مُضَافاً أَوْ مُجَرَّداً أَوْ مَعَ أَلْ

٤٢٥-إِنْ كَانَ فِعْلٌ مَعَ أَنْ أَوْ مَا يَحُلّ مَحَلَّهُ وَلاسْمِ مَصْدَرٍ عَمَـلْ(2).

**مصدر عەمەلی فعل دەکات لەدوو جێگە:**

**یەکەمیان:ئەگەر لە جێی فعل بێ،وەکو:((ضَرْباً زيداً))لێرەدا((زيداً))منصوبە بە((ضَرْباً))لەبەر ئەوەی لەجێی((اضْرِبْ))ـە،وجێناوێکی نادیاری مرفوعی تێدایە هەروەکو لە((اضْرِبْ))دا جێناو هەیە،پێشتر ئەمە باسکرا لە بابەتی مصدر(3).**

**جێی دووەم:ئەوەیە ئەو مصدرە مقدر کرێ بە((أن))وفعل،یان بە((ما))وفعل،ئەمەش مەبەستە لەم بەشە،تقدیر دەکرێ بە((أن))ئەگەر مەبەست ڕابردوو یان داهاتوو بێ،وەکو:(( عجبتُ مِنْ ضربِك زيداً أمسِ،أو غداً))تقدیرەکەی:(أنْ ضَرَبْتَ زيداً أمسِ، أو مِنْ أنْ تَضْرِبَ زيداً غداً). وە تقدیر دەکرێ بە(ما)ئەگەر بۆ ئێستا(الحال)بوو،وەکو:(( عجبتُ منْ ضربِكَ زيداً الآنَ)) تقدیرەکەی:(مِمَّا تضربُ زيداً الآن).**

---

(1) مەبەست لە مصدر ئەو ناوەیە کە دەلالەت لەسەر ماناو ڕووداوێك دەکات و خالیە لە کات، وحەرفەکانی فعلەکەی لەخۆ دەگرێ.{هو اللفظ الدال على حدثٍ مجرداً عن الزمان،متضمنا احرف فعله}.لە ڕێزمانی کوردیدا پێی دەوترێ((چاوگ)). جا ئێمە لە شەرح کردندا ووشەی مصدر بەکار دێنین. وە مەبەست لە عەمەل کردنی کاریگەری دروست کردنە لە ووشەکەی پاش خۆی بەوەی حاڵەتی إعرابی دەگۆڕێ.

(2) پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٢٤-مصدر عەمەلی فعلەکەی دەکات لە سێ حاڵەتدا:ئەگەر مضاف بێ،یان خالی بێ لە إضافە وئەلیف ولام،یان ئەلیف ولامی پێوە بێ. ٤٢٥-بە مەرجێ ئەو مصدرە تقدیر بکرێ ودانرێ لە جێی فعل و(ان)،یان لەجێی فعل و(ما)، وە هەندێ جار اسمی مصدریش عەمەل دەکات.

(3) واتا:لە باسی مفعولی مطلقدا.

جا ئەم مصدره مقدّره لە سێ حاڵەتدا عەمەل دەكات:كاتێ مضاف بێ،وەكو((عجبتُ منْ ضربِك زيداً))،وە كاتێ خالی بێ لە إضافە وئەليف ولام-لەم كاتەدا تنوينيني هەيە-وەكو((عجبت من ضَرْبٍ زيداً))، وەكاتێ كە ئەليف ولامی پێوە بێ وەكو((عجبت من الضرْبِ زيداً)).

وە عەمەل كردنی مضاف زياترە لە عەمەل كردنی ئەوەی تنوينی هەيە،وە عەمەل كردنی تنوين دار زياترە لەوە كە ئەليف ولامی هەيە،بۆيە دانەر بە مضاف دەستی پێكرد،پاشان بەوەی كە خاليە لە إضافە وئەليف ولام،و پاشان بەوەی ئەليف ولامی هەيە.

لە نموونەی عەمەل كردنی مصدری تنويندار فەرموودەی خوای گەورە﴿أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ، يَتِيمًا...﴾[1]، وە وەكو ووتەی شاعر:

٢٤٦- بِضَرْبٍ بِالسُّيُوفِ رُؤُوسَ قَومٍ أَزَلْنَا هَامَهُنَّ عَنِ الْمَقِيلِ[2].

لێرەدا((رُؤُوسَ))منصوبە بە((ضَرْبٍ)).

وە نموونەی عەمەل كردنی مصدر كە ئەليف ولامی پێوە بێ ووتەی:

٢٤٧-ضَعِيفُ النِّكَايَةِ أعداءَهُ يَخَالُ الفِرَارَ يُرَاخِي الأَجَلْ[3].

---

[1] ئايەتی (١٤)وبەشێك لە ئايەتی(١٥)ی سورەتی(البلد). كورتەی ماناكەی:يان ناندانە لە ڕۆژی گرانی وبرسێتی،بە هەتيو. إعرابەكەی:أو:حرف عطف. إطعامٌ:خبر لمبتدأ محذوف. في يوم:جارومجرور متعلقان بالمصدر(إطعام). ذي:صفة ليوم مجرور وعلامة جره الياء لأنه من الأسماء الخمسة،وهي مضاف. مسغبةٍ:مضاف إليه.يتيماً:مفعول به للمصدر(إطعام). الشاهد فيها:( إِطْعَامٌ ... يَتِيمًا)حيث اعمل المصدر المنون(إطعامٌ) عمل فعله فنصب مفعولا به(يتيماً).

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:وەصفی قەومەكەی دەكات ودەڵێ زۆر دلێر وئازان وبە شمشێرەكانيان سەری دوژمنەكانيان پەڕان لە كاتی خەو وپشوويياندا. بەڵگەكەی: (( بِضَرْبٍ.. رُؤُوسَ))لێرەدا (ضربٍ)كە مصدرە عەمەلی فعلەكەی كردووە مفعولی منصوب كردووە كە بريتيە لە(رُؤُوسَ).

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:لاوازە لە تۆڵەو شەڕكردنی لە گەڵ دوژمنەكەی، وخۆ نەگرە لە كاتی جەنگدا و خەياڵی لای ڕاكردنە،و واگومان دەبات كە تەمەنی دوا دەكەوێ.

وە ووتەی:

٢٤٨- فَإِنَّكَ والتَّأْبِينَ عُرْوَةَ بَعْدَ ما دَعَاكَ وأَيْدِينَا إِلَيْهِ شَوَارِعُ[١].

وە ووتەی:

٢٤٩-لقد عَلِمَتْ أُوْلَى الْمُغِيرَةِ أَنَّنِي كَرَرْتُ فَلَمْ أَنْكُلْ عن الضَّرْبِ مِسْمَعَا[٢].

جا((أعداءَهُ)منصوبە بە(النكاية)،و(عروةَ)منصوبە بە(التأبين)،و(مسمعاً) منصوبە بە(الضربْ).

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:((وَلاسْمِ مَصْدَرٍ عَمَلْ))بۆ ئەوەی کە اسمی مصدر هەندێ جار عەمەلی فعلەکەی دەکات،وە مەبەست لە اسمی مصدر:ئەوەیە کە هاوتای مصدرە لە مانادا وپێچەوانەیەتی بە خالی بوونی-بە لفظ و تقدیر-لە هەندێ لەوەی لە فعلەکەیدایە بەبێ بری(تعویض)بۆ هێنانی،وەکو عطاءً کە هاومانای إعطاءً،وپێچەوانەیەتی بەوەی حەرفی همزەکەی تێدا نیە کە لەفعلەکەیدایە[٣] بەلفظ وتقدیر،وهیچ بریشی بۆ نەهاتووە.

جا خۆپارێزا بەمە لەوەی کە خالیە لەحەرفی فعلەکەی بە لفظ،بەڵام لێی خالی نیە بە تقدیر،ئەوە نابێتە اسمی مصدر،بەڵکو دەبێتە

---

بەڵگەکەی:((النَّكَايَةِ أعداءَهُ)) لێرەدا (النكاية) مصدرە وعەمەلی فعلەکەی کردووە و(أعداءَهُ)ی منصوب کردووە.

[١]ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش:بێگومان ئەم گریان وشیوەنەی تۆ بۆ عُروة-ناوی پیاوێکە-دوای ئەوەی کە داوای فریاکەوتنی لێکردی ونەچووی بەدەمیەوە، وەکو ئەو شوانە وایە گۆرانی بۆ حوشترەکانی بڵێ لە کاتێکدا وا دەمرن. بەڵگەکەی:((والتَّأْبِينَ عُرْوَةَ))(التأبين)مصدرە وعەمەلی فعلەکەی کردووە و(عروةَ)ی منصوب کردووە.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:بێگومان هێرش بەرانی پێشەوە دەزانن کە من چەندجار هێرشم بردووە لە جەنگدا ونەگەڕاومەتەوە وگوێم نەداوە بە دەنگی گەورەکانیان. بەڵگەکەی:(الضَّرْبِ مِسْمَعَا) (الضَّرْبِ) مصدرە وعەمەلی فعلەکەی کردووە و(مِسْمَعَا)ی منصوب کردووە.

[٣] إعطاءً مصدری فعلی(أعطي يُعطِي)ە.

مصدر،وەکو((قِتال))کە مصدری فعلی((قاتَلَ))یە،وخالیە لە حەرفی ئەلیفی پێش تای فعلەکە،بەلأم بە لفظ لێی خالیە،و بەتقدیر لێی خالی نیە،بۆیە لە هەندێ شوێندا دەخوێنرێتەوە،وەکو:((قاتَلَ قیتالاً،وضارَبَ ضیراباً))بەلأم ئەلیفەکە بووە بە یا لەبەر ئەوەی پێشی کسرەیە.

هەروەها خۆپارێزار بە ووتەی((دون تعویض))واتا:بەبێ بری،لەوەی کە خالیە لە حەرفی فعلەکەی بە لفظ وتقدیر،بەلأم بری بۆ هێنراوە،ئەمەش نابێتە اسمی مصدر،بەڵکو دەبێتە مصدر،وەکو((عدةٌ))کە مصدری ((وَعَدَ))یە وخالیە لە حەرفی واوەکەی لە فعلەکەدایە بەلأم بری بۆ هاتووە بە حەرفی تا.

وە کوڕی دانەر ووتوویەتی((عطاءً))مصدرە،وهمزەکەی لەبەر سووککردن ((التخفیف))حذفکراوە،ئەم بۆچوونەش پێچەوانەی بۆچوونی زانایانە.

وە لە نموونەی عەمەل کردنی اسمی مصدر ووتەی:

٢٥٠-أَكُفراً بَعْدَ رَدِّ الْمَوتِ عَنِّي وبعدَ عَطَائِكَ الْمِائَةَ الرِّتَاعَا[١].

لێرەدا(الْمِائَةَ)منصوبە بە(عَطَائِكَ)،هەروەها وەکو فەرموودەی الموطّأ:(( مِنْ قُبْلَةِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ الْوُضُوءُ))[٢].هەروەها ووتەی:

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئایە نکوڵی چاکە وپیاوەتی تۆ بکەم لە کاتێکدا مردنت لێ لادام وسەد ووشتری چاکت پێدام. بەڵگەکەی:(( عَطَائِكَ الْمِائَةَ)) عَطَائِكَ اسمی مصدرە وعەمەلی کردووە و(الْمِائَةَ) منصوب کردووە.

[٢] ئەم فەرموودەیە موقوفە وفەرمایشتی ابن مسعودە ﷺ ئیمامی مالك لێی گێڕاوەتەوە بە ژمارە(١٠٩).وە شیخ ئەلبانی لە تحقیقی کتێبی(مشكاة المصابيح)دا بە صەحیحی داناوە. کورتەی ماناکەی: لە ماچ کردنی پیاو بۆ هاوسەری دەست نوێژ پێویستە. إعرابەکەی:مِنْ قُبلة:جار ومجرور متعلقان بمحذوف خبر مقدم، وقبلةِ مضاف. الرجُلِ:مضاف إليه، وهذا من إضافة اسم المصدر إلى فاعله. أمرأتَهُ:مفعول به لــ(قُبلة)منصوب،وهو مضاف،والهاء:ضمير متصل مبني في

٢٥١- إذا صَحَّ عَوْنُ الْخَالِقِ الْمَرْءَ لَمْ يَجِدْ عَسِيراً مِـنَ الآمَـالِ إلاَّ مُيَسَّرَا[1].

وە ووتەی:

٢٥٢-بِعِشْرَتِكَ الكِرَامَ تُعَدُّ مِنْهُمْ فَلاَ تُرَيَـنْ لِغَـيْرِهِمُ أَلُـوفَا[2].

جا عەمەل كردنی اسمی مصدر كەمە،وە ئەوانەی بانگەشەی يەكدەنگيان كردووە لەسەر عەمەل كردنی ئەوە بە هەڵەدا چوون،بێگومان ڕاجيای لەم بابەتەدا[3] باووزانراوە،پێشەوا صەيمەری ووتوويەتی:عەمەل كردنی اسمی مصدر پێچەوانەی ياسايە(شاذە)،و ئەم دێڕەی هێناوەتەوە:* أَكُفْراً-تا كۆتای دێڕەكە[4]،وە پێشەوا ضياء الدينی كوڕی علج لە كتێبی البسيط دا ووتوويەتی:دوور نيە ئەوەی كە لەجێی مصدرە عەمەلەكەی بكات، وە گێڕدراوەتەوە لە هەندێكيان كە عەمەل كردنی اسمی مصدر دروستە بە ياسا(قياساً).

* * *

---

محل جر مضاف إليه. الوضوءُ:مبتدأ مؤخر. الشاهد فيه: ((قُبْلَةِ ...امْرَأَتَهُ))حيث نصب قُبلة-وهو اسم المصدر-امرأته.

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەگەر هاوكاری ويارمەتی خوای گەورە هەبێ بۆ مرۆڤ ئەوە هيچ كات مرۆڤ نابينێ هيواوئاواتەكانی قورس وگران بێ. بەڵگەكەی:(( عَوْنُ الْخَالِقِ الْمَرْءَ))(عونُ)اسمی مصدرە وعەمەلی كردووە ومفعول بە منصوب كردووە كە(الْمَرْءَ).

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:بە هۆی مامەڵە جوانەكانتەوە لەوان دەژمێرێی،كەوابوو بۆ جگە لەوان خۆشەويستی مەنوێنە. بەڵگەكەی:(( بِعِشْرَتِكَ الكِرَامَ))اسمی مصدر كە((عِشْرَة))عەمەلی فعلەكەی كردووە،ومفعول بە منصوب كردووە كە((الكرامَ))يە.

[3] واتا:لەوەی كە اسمی مصدر عەمەل دەكات،يان نا.

[4] مەبەست دێڕی ژمارە(٢٥٠)ـی شاهدەكانە،كە باسمان كرد.

***باسی مصدری مضاف وحاڵەتەکانی:**

٤٢٦-وَبَعْدَ جَرِّهِ الَّذِى أُضِيفَ لَهْ كَمِّـلْ بِنَصْبٍ أَوْ بِرَفْعٍ عَمَلَهْ[١]

**إضـافـە دەکـریٚ مـصـدر بـۆلای فاعلەکـەی ومجـروری دەکات،وپاشـان مفعـول منـصـوب دەکـات،وەکو:((عجبتُ مِن شُرْبِ زيدٍ العَسَلَ))، وە إضـافـە دەکـریٚ بـۆلای مفعولەکەی،وپاشـان فاعـل مرفـوع دەکـات،وەکو:((عجبت من شربِ العسلِ زيدٌ))،وە وەکو ووتەی:**

٢٥٣-تَنْفِي يَدَاهَا الْحَصَى كُلِّ هَاجِرَةٍ نَفْيَ الدَّرَاهِيمِ تَنْقَادُ الصَّيَارِيفِ[٢].

**وە ئەم جۆری دووەمە[٣]تایبەت نیە بۆ ناچاری شعری،پێچەوانەی بۆچوونی هەندیٚ،وە ئـەم فەرموودەیـەی خـوای گـەروە لەمـە دانـراوە﴿...وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا...﴾[٤]،ولێرەدا((مَنْ))کراوەتە فاعلی((حِجّ))،جا**

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دوای ئەوەی مصدری مضاف مجرور دەکات مضاف إليه ،ئەوە عەمەلەکەی تەواو بکە لە منصوب کردنی مفعول-کاتیٚ إضافەکرابیٚ بۆ لای فاعل-،یان مرفوع کردنی فاعل-کاتیٚ إضافەکرابیٚ بۆلای مفعول بە-.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئەو ووشترە لادەدا بەدەستەکانی ووردەبەرد لەکاتی گەرمای نیوەڕۆ،هەروەکو چۆن کەسی پارەگۆڕ(صیرفە)درهەمەکان دەگۆڕیٚ.واتا:ووشترەکە خێراو بەتوانایە. **بەڵگەکەی**:(( نَفْيَ الدَّرَاهِيمِ تَنْقَادُ))مصدر-کە نَفْيَ -إضافەکراوە بۆلای مفعولەکەی-کە الدَّرَاهِيمِ -وفاعلەکەی مرفوعە-کە تَنْقَادُ -.

[٣] واتا:إضافەکردنی مصدر بۆلای مفعول ومرفوع کردنی فاعل.

[٤] بەشێکە لەئایەتی(٩٧)ی سورەتی(آل عمران)،پوختەی ماناکەی:بۆ خودا هەیە بەسەر ئادەمیەوە حەجکردنی ئەو ماڵە،هەرکەسێك توانای گەیشتنی(ڕۆشتنی) هەبیٚ بۆی. **إعرابەکەی**:للهِ -وعلى الناس-:جارومجرور متعلقان بخبر مقدم محذوف. حجُّ:مبتدأ مؤخر،وهو مضاف. البيتِ:مضاف إليه. مَنْ:اسم موصول مبني على السكون في محل جر بدل(بعض من كل)من الناس-أو في محل رفع فاعل للمصدر(حج). استطاعَ:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها من الإعراب صلة الموصول. إليه:جارومجرور في محل نصب حال. سبيلاً:مفعول به. **الشاهد فيها**:((.. حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ..)) اضاف المصدر(حِجّ) إلى مفعوله(البيت)،

ئەم بۆچوونە وەلاّم دراوەتەوە بەوەی کە مانای ئایەتەکە دەبێتە:بۆ خودا هەیە لەسەر هەموو ئادەمیەوە حەجکردنی ئەو ماڵە ئەوەی بتوانێ،بەلاّم وانیە،بەڵکو((مَنْ))دەبێتە بدل بۆ((الناس))وتقدیرەکەی:بۆ خودا هەیە لەسەر خەڵکی ئەوانەیان ئەتوانن حەجکردنی ئەو ماڵە،وە ووتراوە:کە((مَنْ))مبتدایە،وخبرەکەی محذوفە،وتقدیرەکەی:مَن استطاع منهم فَعَلَیْه ذلك.

هەروەها إضافة دەکرێ مصدر بۆلای ظرف وپاشان فاعلەکەی مرفوع دەبێ،ومفعولەکەی منصوب دەبێ،وەکو:((عجبتُ مِنْ ضَرْبِ الیومِ زیدٌ عمراً)).

* * *

٤٢٦-وَجُرَّ مَا یَتْبَعُ مَا جُرَّ وَمَنْ رَاعَی ف الاتْبَاعِ الْمَحَلَّ فَحَسَنْ[١].

کاتێ کە مصدر إضافە دەکرێ بۆلای فاعل ئەوە فاعلەکەی بە لفظ مجرور دەبێ،و لەمحلیشدا مرفوع دەبێ،کەوابوو دروستە لە تابعەکەی-لە نعت،وعطف،وجگە لەم دووانەش[٢]- ڕەچاوکردنی لفظەکەی ئەوکات مجرور دەبن،وە ڕەچاوکردنی محلەکەی ئەو کات مرفوع دەبێ،دەڵێی:(( عجبتُ مِنْ شُربِ زیدٍ الظریفِ،والظریفُ)). وە لە نموونەی دواکەوتن (إتباع)ی محل ووتەی:

وفاعله(من)في محل الرفع،وهذا رأي بعض العلماء،وردّه الآخرون كما ذكره ابن عقيل-رحمهم الله-.

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دروستە مجرورکردنی تابعی ئەوەی مجرورە بە إضافەکردنی مصدر بۆلای بەپێی لفظەکەی،وە ئەوانەی ڕەچاوی محلەکەی دەکەن - واتا:تابعەکە مجرور ناکەن بەڵکو مرفوعی دەکەن ئەگەر تابعی فاعل بێ وە منصوبی دەکەن ئەگەر تابعی مفعول بە بێ-ئەوە باشیان کردووە.

[٢] لە زمانی عەرەبیدا تابع-واتا:ئەو ناوانەی دوای ناوەکەی پێش خۆیان دەکەون لە إعرابدا-چوارن:١-النعت(الصفە).٢-البدل.٣-التوکید. ٤-العطف.

٢٥٤-حَتَّى تَهَجَّرَ فِى الرَّوَاحِ وَهَاجَهَا طَلَبَ الْمُعَقِّبِ حَقَّهُ الْمَظْلُومُ[1].

لێرەدا((الْمَظْلُومُ))مرفوعە لەبەر ئەوەی صفەیە بۆ((الْمُعَقِّبِ)) بەپێی محلەکەی.

وە کاتێ مصدر إضافە دەکرێ بۆلای مفعول بە،ئەوە مفعولەکە مجرور دەبێ بە لفظ،وە منصوب دەبێ بە محلّ،کەوابوو دروستە لە تابعەکەی ڕەچاوکردنی لفظەکەی،ومحلەکەی،وە لە نموونەی ڕەچاوکردنی محلەکەی ووتەی:

٢٥٥-قَدْ كُنْتُ دَايَنْتُ بِهَا حَسَّانَا مَخَافَةَ الإِفْلاَسِ واللَّيَّانَا[2].

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:هەتا ئەو کەرە کێویە چوو بۆ سەر ئاوەکەی لە کاتی گەرمای نیوەڕۆ وماکەرەکەی بێزارکرد لە هاتنی بۆ سەر نۆرە ئاوەکەی وجار لەدوای جار داوای لێدەکرد،وەکو داواکردنی خاوەن قەرز لە قەرزار. بەڵگەکەی:(( طَلَبَ الْمُعَقِّبِ....الْمَظْلُومُ)) الْمَظْلُومُ صفەیە بۆ الْمُعَقِّبِ کە فاعلی (طَلَبَ) ،ومرفوعی کردووە بە ڕەچاوکردنی محلەکەی کە رفعە.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:لەبەری قەرزەکەم ئەو کەنیزەکە-جاریە-م لە حسّان وەرگرت، لەترسی مایەپووچی،و درێژخایەنی دانەوەی. بەڵگەکەی: ((واللَّيَانَا)) عطفکراوەتەوە بەمنصوبی بۆسەر((الإِفْلاَسِ))کە مصدرەکەی بۆلا إضافەکراوە وبەلفظ مجرورە،ولە محلدا منصوبە ومفعول بە یە.

## عەمەل کردنی اسمی فاعل[١]

٤٢٨-كَفِعْلِهِ اسْمُ فَاعِلٍ فِي الْعَمَلِ إِنْ كَانَ عَـنْ مُضِيِّهِ بِمَعْزِلِ[٢]

بەدەر نیە اسمی فاعل لەوەی کە ناسراوبێ بە ئەلیف ولام،یان خالی لێی.

جا ئەگەر خالی بێ لە ئەلیف ولام ئەوە عەمەلی فعلەکەی دەکات،لە مرفوع کردن ومنصوب کردن[٣]،ئەگەر بۆ داهاتوو یان ئێستا بێ،وەکو((هذا ضاربٌ زيداً الآن ، أو غداً))وە بۆیە عەمەل دەکات چونکە وەکو ئەو فعلە وایە کە ماناکەی لەخۆگرتووە،کە بریتیە لە فعلی مضارع ،وە مانای ئەوەی کە وەکو فعلی مضارع وایە:وەکو ئەو وایە لە حەرەکە وسکون،((ضارِب)) وەکو((يضْرِبُ))وایە[٤] لە ڕووی لفظ وماناوە.

وە ئەگەر اسمی فاعل بە مانای ڕابردوو(ماضي) بێ ئەوە عەمەل ناکات،لەبەر ئەوەی وەکو ئەو فعلە نیە کە ماناکەی لەخۆگرتووە،لەڕووی ماناوە لەو دەچێ بەڵام لەڕووی لفظەوە لەو ناچێ،کەوابوو ناڵێی:((هذا ضاربٌ زيداً أمسِ))بەڵکو پێویستە إضافەکرێ بۆلای ناوەکەی پاشی،دەڵێی: (( هذا ضاربُ زيدٍ أمسِ))،وە پێشەوا کسائی بەدروستی دەزانێ عەمەل کردنی اسمی فاعلی ڕابردوو،وە ئەم ئایەتەی بەبەڵگە هێناوەتەوە﴿...وَكَلْبُهُمْ

---

[١] اسمی فاعل بریتیە لەو ناوەی کە وەرگیراو(مشتق)ە لە فعلی مضارعی بکەر دیار،بۆ دەلالەت کردن لەسەر فاعلی ڕووداوئیشەکە.وە مەبەست لە عەمەلکردنی ئەوەیە پێویستی بە فاعل ومفعول بە هەیە.

[٢] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:اسمی فاعل عەمەلی فعلەکەی دەکات،بەمەرجێ دوور بێ لە مانای ڕابردوو(ماضي)،واتا:بۆ ئێستا(الحال)وداهاتوو(الاستقبال)بێ.

[٣] واتا:مرفوع کردنی فاعل ومنصوب کردنی مفعول بە.

[٤]واتا: ((ضارِب))وەکو((يضْرِبُ))وایە لەو ڕووەوەی کە هەردووکیان چوار حەرفن ،سێ حەرەکە ویەك سکونیان هەیە.

بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ...﴾[1]لێرەدا((ذِرَاعَيْهِ))منصوبە بە((بَاسِطٌ))ورابردووە،بەڵام زانایانی تر فەرموویانە ئەمە گێڕانەوەی ڕابردووە.

* * *

٤٢٩- وَوَلِيَ اسْتِفْهَاماً أَوْحَرْفَ نِدَا أَوْ نَفْياً أَوْجَا صِفَةً أَوْ مُسْنَدَا[2].

ئاماژەی كرد بەم دێڕە بۆ ئەوەی كە اسمی فاعل عەمەل ناكات مەگەر پشت ببەستێ بەشتێكی پێش خۆی،وەكو ئەوەی لە پاش استفهامەوە بێ،نموونەی((أضاربٌ زيدٌ عمراً))،یان لە پاش حەرفی نداوە بێ،وەكو((يا طالعاً جبلاً))یان لەپاش نەفیەوە بێ،وەكو((ما ضاربٌ زيدٌ عمراً))،یان ببێتە صفە بۆ پێش خۆی وەكو((مررت برجلٍ ضاربٍ زيداً[3]))،یان ببێتە حال،وەكو((جاء زيدٌ راكباً فرساً[4]))جا ئەم دوو جۆرە[5]،وە ووتەی((أَوْ مُسْنَدَا))مانای ئەوەی كە

---

[1] بەشێكە لە ئایەتی(١٨)ی سورەتی(الكهف)،پوختەی ماناكەی:سەگەكیان هەردوو دەستی درێژ كردبوو لەبەر دەرگای ئەشكەوتەكە. إعرابەكەی: و:واو الحال. كلبُ:مبتدأ،وهو مضاف،همْ:في محل جر مضاف إليه. باسطٌ:خبر مرفوع.ذراعيْه:مفعول به لاسم الفاعل(باسطٌ)،وهو مضاف،والهاء:في محل جر مضاف إليه. بالوصيدِ:جاروجرور. وجملة(كلبهم باسطٌ ذراعيه)في محل نصب حال. **الشاهد فيها:(باسطٌ)اسم فاعل منون،واشترط النحاة لعمل اسم الفاعل أن يكون بمعنى المضارع،فإن كان بمعنى الماضي لم يعمل،وأجاز الكسائي إعماله وجعل منه هذه الآية،وخرّجه غيره على أنه حكاية حال ماضية.**

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەروەها مەرجە بۆ عەمەل كردنی اسمی فاعل كە لە پاش استفهام،یان نداء،یان نفیەوە بێ،یان ببێتە نعت ،یان ببێتە خبر.

[3] لە ڕستەیەدا((برجلٍ ضاربٍ))اسمی فاعلە وصفەیە بۆ((برجلٍ))،وفاعلەكەی جێناوێكی نادیارە-تقديره هو-و((زيداً))مفعول بە یەتی.

[4] لەم ڕستەیەشدا((راكباً))اسمی فاعلە وحالە بۆ((زيدٌ))،فاعلەكەی جێناوێكی نادیارە-تقديره هو-،و((فرساً))مفعول بە یەتی.

[5] واتا:ئەوەی دەبێتە صفە،وئەوەی دەبێتە حال.

اسمی فاعل عەمەل دەكات ئەگەر خبر بێ،ئەمەش خبری مبتدا دەگرێتەوە وەكو((زيدٌ ضاربٌ عمراً))،وە خبری ناسخی[1] مبتداش دەگرێتەوە،وەكو((كان زيدٌ ضارباً عمراً ، وإنّ زيداً ضاربٌ عمراً،وظننت زيداً ضارباً عمراً ، وأعلمت زيداً عمراً ضارباً)).

* * *

٤٣٠- وَقَدْ يَكُونُ نَعْتَ مَحْذُوفٍ عُرِفْ فَيَسْتَحِقُّ الْعَمَلَ الَّذِى وُصِفْ[2]

هەندێ جار اسمی فاعل پشت دەبەستێ بە ناوێكی وەصفكراوی باس نەكراو( مقدر) لەم كاتەدا عەمەلی فعلەكەی دەكات،هەروەكو ئەوەی صفە بێ بۆ ناوێكی وەصفكراوی باسكراو،وەكو ووتەی:

٢٥٦- وكم مَالِىءٍ عَيْنَيْهِ مِنْ شَيءٍ غَيْرِهِ إذا رَاحَ نَحْوَ الجُمْرَةِ البِيضُ كالدُّمَى[3].

لێرەدا((عَيْنَيْهِ))منصوبە بە((مَالِىءٍ))و((مَالِىءٍ))صفەیە بۆ وەصفكراوێكی باسنەكراو،وتقديرەكە: وكم شخصٍ مَالِىءٍ، وە وەكو ووتەی:

٢٥٧- كَنَاطِحٍ صَخْرَةً يوماً لِيُوهِنَهَا فَلَمْ يَضِرْهَا وأَوْهَى قَرْنَهُ الوَعِلُ[4].

تقديرەكەی: كوعلٍ ناطحٍ صخرةً.

---

[1] لە شەرحی دێڕی(١٤٣)ی ئەلفیە پێناسەی ناسخی مبتدا مان كرد.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: هەندێ جار اسمی فاعل دەبێتە صفە بۆ ناوێكی وەصفكراو(موصف)ی مقدری زانراو،لەم كاتەدا هەمان عەمەلی خۆی دەكات.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:زۆر جار كەسانێ پڕ بە چاویان سەیری ئافرەتانی شۆخ وشەنگ دەكەن لە كاتی شەیتان ڕەجم كردندا،بەبێ هیچ سوودێك.-بەڵام كەمتر وایە مسوڵمان لە كاتی بەجێهێنانی دروشمەكانی حەج سەیری ئافرەتان بكات!!بەڵام دیارە ئەم شاعرە لە خۆیەوە قیاسی كردووە،یان دەكرێ مەبەستی تری هەبێ لەم قسەیەی- بەڵگەكەی:((مَالِىءٍ عَيْنَيْهِ..))مالئٍ اسمی فاعلە وعەمەلی كردووەو ناوەكەی پاش خۆی منصوب كردووە،لەبەر ئەوەی صفەیە بۆ وەصفكراوێكی مقدر،وتقديرەكەی:وكم شخصٍ مالئٍ...

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:-ئەو كەسەی خۆی لە ئیش وكارێ دەدا لە توانایدا نیە- وەكو ئەو بزنە كێوییە وایە كە بە شاخەكان(قۆچەكان)ـ لەبەرد دەدا بۆ ئەوەی بەردەكە

٤٣١-وَإِنْ يَكُنْ صِلَةَ أَلْ فَفِي الْمُضِي وَغَيْـرِهِ إِعْمَالُهُ قَـدِ ارْتُضِي[١].

کاتیٚ اسمی فاعل دەبێتە صلەی ئەلیف ولام[٢] ئەوە عەمەل دەکات:ماضی بیٚ،یان مستقبل بیٚ،یان حال بیٚ،لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا لە جێی فعلە،چونکە صلە دەبیٚ ڕستە(جملە)بیٚ،دەڵێی:((هذا الضاربُ[٣] زيداً الآن ،أو غداً ،أو أمسِ)).

ئەمە بۆچوونی باووزانراوی زانایانە،وە کۆمەڵیٚ لە زانایانی تر ووتوویانە-لەوانە پێشەوا ڕومانی-ئەگەر اسمی فاعل ببێتە صلەی ئەلیف ولام ئەوە تەنها ماضی بیٚ عەمەل دەکات،وئەگەر حال واستقبال بیٚ عەمەل ناکات،وە هەندێکی تر ووتوویانە بەهیچ شێوەیەك عەمەل ناکات،وە ئەو ناوە منصوبەی پاشی منصوبە بە فعلێکی نادیار،جا سەیر لەوەدایە ئەم دوو بۆچوونە[٤] دانەر لە کتێبی(التسهيل)دا باسی کردوون،کەچی کوڕەکەی دانەر(بدرالدين) لە شەرحەکەیدا[٥]ووتوویەتی اسمی فاعل کاتیٚ دەبێتە

---

لاواز بکا وبشکێنیٚ،بەڵام زیان بە بەردەکە ناگەیەنیٚ بەڵکو زیان بە شاخەکانی خۆی دەگەیەنیٚ. بەڵگەکەی:(( كَنَاطِحٍ صَخْرَةً..))ناطحٍ اسمی فاعلە وعەملی کردووە وناوەکەی پاش خۆی_صخرةً_منصوب کردووە،لەبەر ئەوەی صفەیە بۆ وەصفکراوێکی باسنەکراو،وتقديرەکەی:كوعلٍ ناطحٍ صخرةً.

کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر اسمی فاعل ببێتە صلەی ئەلیف ولامی(موصول)،ئەوە عەمەل دەکات ئەگەر بۆ ماضی وغەیری ماضی-واتا:حال واستقبال-بیٚ،لای هەموو زانایان.

[٢] پێشتر لە شەرحی دێڕی(٩٨)ی ئەلفیە باسی صلەی ئەلیف ولامان کرد.

[٣] لێرەدا((الضاربُ))بە مانای:((الذي ضَرَبَ))دیٚ.

[٤] واتا:بۆچوونی ئەوانەی دەڵێن: کە اسمی فاعل ئەگەر صلەی ئەلیف ولام بیٚ تەنها ئەگەر ماضی بیٚ عەمەل دەکات، وە بۆچوونی ئەوانەی کە دەڵێن:بەهیچ شێوەیەك عەمەل ناکات.

[٥] واتا:لەشەرحی التسهيل دا.

صـــلەی ئــەلیف ولام عەمـــەل دەکـــات ماضـــی بێ،یـــان حـــال بێ،یـــان داهاتوو(مستقبل)بێ،بە یەکدەنگی زانایان،وە پاشان ووتوویەتی:هەموو زانایانی نحو ڕازین بەم عەمەل کردنەکەی اسمی فاعل کاتێ کە صلەی ئەلیف ولام بێ.

* * *

***باسی عەمەل کردنی صیغەی مُبالغە[1]:**

٤٣٢-فَعَّالٌ أَوْ مِفْعَالٌ أَوْ فَعُولُ فی کَثْرَةٍ عَنْ فَاعِلٍ بَدِیلُ

٤٣٣-فَیَسْتَحِقُّ مَا لَهُ مِنْ عَمَلِ وَفی فَعِیلٍ قَلَّ ذَا وَفَعِلِ[2].

دائەڕێـژرێ ودروسـت دەکـرێ بـۆ زۆری[3]:فعّالٌ،ومِفْعـالٌ،وفَعُولٌ، وفعیـلٌ، وفَعِلٌ،وعەمەلی فعلەکەیان دەکەن وەکو اسمی فاعل،دیارە عەمەل کردنی سێیەکەی یەکەم زۆرترە لە عەمەل کردنی فعیلٌ وفَعِلٌ،وە عەمل کردنی فعیلٌ زیاترە لە عەمل کردنی فَعِلٌ.

---

(1) صیغەی مبالغە:بریتیە لە چەند ووشەیەکی دیاریکراو کە دانراون بۆ اسمە فاعلێك کە زۆر ئەو ئیشەی کردبێ،واتا:صیغەی مبالغە لە بنەڕەتدا اسمی فاعلە،ولەبری ئەوەی بڵێین ئەو ئیشە زۆر کراوە ئەم صیغانە بەکار دێنین کە باس دەکرێن.

(2) پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٣٢-هەریەك لە(فَعَّالٌ،و مِفْعَالٌ،وفَعُولُ) دادەنرێن لە بری اسمی فاعل بۆ کاتێ ئەو ئیشە زۆر کرابێ. ٤٣٣-وە ئەو عەمەل کردنەی هەبوو بۆ اسمی فاعل بۆ ئەمانیش هەیە،وەهەریەك لە(فعیلٌ،وفَعِلٌ)یش بەکاردێن بۆ صیغەی مبالغە بەڵام کەمتر.واتا:صیغەی مبالغە پێنج وەزنی هەیە.دیارە ئەم پێنج وەزنە زۆر باون ئەگەر نا وەزنی تریشی هەن.

(3) واتا:زۆرکردنی ئەو کارە لەلایەن کەسێکەوە.

لەنموونەی عەمەل كردنی فعّالٌ ئەوەیە كە پێشەوا سیبویە بیستوویەتی لە قسەی هەندێكیان:((أمَّا العَسَلَ فأنا شرّابٌ))[٤]،وە وەكو ووتەی شاعر:

٢٥٨-أَخَا الحْرْبِ لَبَّاساً إليها جِلاَلَهَا وليسَ بِوَلاَّجِ الخَوَالِفِ أَعْقَلاَ[١].

جا ناوی(العسل)[٢]منصوبە بە((شرّابٌ))،وە ناوی((جِلاَلَهَا))منصوبە بە((لَبَّاساً)).وە لەنموونەی عەمەل كردنی مِفْعالٌ قسەی هەندێ لەعەرەبە:((إنَّه لَمِنْحَارٌ بَوَائِكَها))[٣]،لێرەدا((بَوَائِكَها))منصوبە بە((مِنْحَارٌ)).

وە لەنموونەی عەمەل كردنی فَعُولٌ ووتەی شاعر:

٢٥٩- عشية سُعْدى لو تراءتْ لراهبٍ بدومة تجرٌ دونه وحجيجُ
قَلَى دِينَهُ واهْتَاجَ لِلشَّوقِ إنَّهَا على الشَّوقِ إِخْوَانَ العَزَاءِ هَيُوجُ[٤].

لێرەدا((إِخْوَانَ))منصوبە بە((هَيُوجُ)). وە لەنموونەی عەمەل كردنی فعیلٌ قسەی هەندێ عەرەب:((إنَّ اللهَ سميعٌ دُعاءَ مَنْ دَعَاهُ)) لێرەدا((دُعاءَ))منصوبە بە((سميعٌ)).

---

[٤] ماناكەی:بێگومان من زۆر هەنگوین خۆرم.

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:-هەمیشە من دەبینی-براوهاوڕێی جەنگم وزۆر زرێ وپۆشاكی جەنگ دەپۆشم،وە لەو كەسانە نیم زۆر خۆیان دەكەن بەناو خێوەتگەدا-واتا:ئەو شوێنەی دانراوە بۆ حەوانەوەی جەنگەوەران-و بترسم. بەڵگەكەی:(( لَبَّاساً ...جِلاَلَهَا)) لێرەدا لبّاساً صیغەی مبالغەیە وعەمەلی فعلەكەی كردووە،وفاعلێكی نادیار(مستتر)ی هەیە،و(جلالها)مفعول بە یەتی.

[٢] لە ڕستەی:(( أمَّا العَسَلَ فأنا شرّابٌ))

[٣] واتا:بێگومان ئەو زۆر سەربڕی ووشترە قەڵەوەكانێتی. واتا:سەخی ونان بدەیە.

[٤] گەر سەر لەئێوارە سُعدی خان دەركەوێ بۆ خواپەرستێكی گاور كە لە یەكێك لە گوندەكان بەناوی دومە خواپەرستی دەكات،ولەو كاتەدا كۆمەڵێ بازرگان وحاجی لەودەوری بن وقسەیان بۆ بكات-واتا:سەرقاڵی بانگەواز بێ-،ئەوە بەدەركەوتنی سُعدی خان دەست بەرداری دینەكەی دەبێ وڕوو دەكاتە سُعدی،لەبەر ئەوەی زۆر سەرنج ڕاكێشە.-أعاذنا الله من فتنة النساء-. بەڵگەكەی:(( إِخْوَانَ العَزَاءِ هَيُوجُ)) هَيُوجُ صیغەی مبالغەیە وعەمەلی فعلەكەی كردووە،وفاعلێكی نادیار(مستتر)ی هەیە،و(إخْوَانَ)مفعول بە یەتی.

وه له نموونەی عەمەل كردنی فَعِلٌ،ئەوەیە كە سیبویە هۆنیویێتیەوە:

٢٦٠- حَذِرٌ أُموراً لا تَضِيرُ وآمِنٌ     مَا ليسَ مُنْجِيَهُ مِنَ الأَقْدَارِ[٥].

وه ووتەی:

٢٦١- أَتَانِي أَنَّهم مَزِقُونَ عِرْضى     جِحَاشُ الكِرْمِلَيْنِ لهَا فَدِيدُ[١].

جا((أُموراً))منصوبه به((حَذِرٌ))،و((عِرْضى))منصوبه به((مَزِقُونَ)).

* * *

***عەمەل كردنی اسمی فاعل كاتێ مثنّى یان جمع بێ:**

٤٣٤- وَمَا سِوَى الْمُفْرَدِ مِثْلَهُ جُعِلْ     فى الْحُكْمِ وَالشُّرُوطِ حَيْثُمَا عَمِلْ[٢].

جگە لە مفردكە بریتیە لە مثنّى وجمع-وەكو:الضاربَيْنِ، والضاربتَيْنِ،والضارِبِيْنَ، والضُّرّاب، والضّوارب، والضاربات-حوكمی وەكو مفرد لە عەمەل كردن وسەرجەم ئەو مەرجانەی كە باسكرا،كەوابوو دەڵێی:((هذان الضّاربان زيداً،هؤلاء القاتلون بكراً))،هەروەها ئەوانی تریش،وەنموونەی ووتەی:

٢٦٢-* أَوَالِفاً مَكَّةَ مِنْ وُرْقِ الحَمِى*[٣]     وه ووتەی:

---

[٥] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئەو دەترسێ لە شتانێ كە زیانی نیە،وە دڵنیایە وناترسێ لەوەی نایپارێزێ ورزگاری ناكا لە پێشهاتەكان. **بەڵگەكەی**:((حَذِرٌ أُموراً)) حَذِرٌ صیغەی مبالغەیە وعەمەلی فعلەكەی كردووە،وفاعلێكی نادیار(مستتر)ی هەیە، و(أُموراً) مفعول بە یەتی.

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:پێم گەشتووە كە ئەوان كەسایەتی من ناشیرین ولەكەدار دەكەن،بەلاّم كوێم لێ نیە چونكە ئەوان لای من وەكو جاشك وماكەرن كە دەچێ بۆ ئاو خواردن دەنگی دێ وئەزەرێنێ. **بەڵگەكەی**:(( مَزِقُونَ عِرْضي)) مَزِقُونَ صیغەی مبالغەیە وعەمەلی فعلەكەی كردووە،وفاعلێكی نادیار(مستتر)ی هەیە،و(عِرْضي)مفعول بە یەتی.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:جگە لە مفرد-واتا:مثنّى وجمع-وەكو مفرد وایە لەحوكم ومەرجەكان وهەمان عەمەل كردن.

٢٦٣- ثُمَّ زَادُوا أَنَّهُمْ فى قَوْمِهِمْ    غُفُرٌ ذَنْبَهُمْ غَيْرُ فُخُرْ[٤].

***باسى إضافەكردنى اسمى فاعل بۆلاى مفعول بە كەى:**

٤٣٥- وَانْصِبْ بِذِى الإِعْمَالِ تِلْواً وَاخْفِضِ    وَهْوَ لِنَصْبِ مَـا سِوَاهُ مُقْتَضِى[١].

**دروستە اسمى فاعل إضافەكرىٚ بۆلاى ناوەكەى پاش خۆى كە مفعول بە يە،وەدروستە منصوبى بكات،كەوابوو دەلێى:((هذا ضاربُ زيدٍ، وضاربٌ زيداً))،جا ئەگەر دوو مفعولى هەبوو وە إضافەكرا بۆلاى يەكێكيان ئەوە پێويستە ئەوى تريان منصوب بىٚ،دەلێى:((هذا مُعْطِى زيدٍ درهماً ,وهذا مُعْطِى[٢] درهمٍ زيداً)).**

*    *    *

٤٣٦- وَاجْرُرْ أَوِ انْصِبْ تَابِعَ الَّذِى انْخَفَضْ  كَـ(مُبْتَغِى جَاهٍ وَمَالاً مَنْ نَهَضْ)[٣].

---

[٣] ماناو بەلگەى ئەم نيو ديٚرە:ئەو كۆترە سپى مەيلە ورەشانە خووگرى شارى مەككەن. بەلگەكەى:(( أَوَالِفاً مَكَّةَ))لێرەدا(أَوَالِفاً)جمعى جمعى تكسيرى اسمى فاعلى(آلِفٌ)ە عەمەلى كردووە وناوەكەى پاش خۆى-كە مَكَّةَ-منصوب كردووە.

[٤] ماناوبەلگەى ئەم ديٚرەش:پاشان ئەوان چاكەى زياتريان ئەوەيە كە لە هەلەى بەرامبەريان چاوپۆشى دەكەن،وخاكين وفەخروشانازى بەسەر خەلكيدا ناكەن. بەلگەكەى:(( غُفُرٌ ذَنْبَهُمْ)) غُفُرٌ جمعە تكسيرى غفورٌ كە صيغەى مبالغەيە وعەمەلى فعلەكەى كردووە وناوەكەى پاش خۆى-كە ذَنْبَهُمْ -منصوب كردووە.

[١] پوختەى ماناى ئەم ديٚرەى ئەلفيە: دروستە بۆ اسمە فاعلى عامل منصوب كردنى ناوەكەى پاشى-واتا:مفعول بە-وەدروستە إضافكردنى بۆلاى مفعولەكەى ومجروركردنى،وە لەكاتێكدا دوو مفعولى هەبوو ئەوە يەكێكيان مجرور دەكات وئەوى تر منصوب دەكات،واتا:دروست نيە هەردوو مفعولەكەى مجرور كات.

[٢] مُعْطِى اسمە فاعلى فعلى(أُعْطَى)كە متعديە بۆ دوو مفعول،پێشتر باسكرا.

[٣] پوختەى ماناى ئەم ديٚرەى ئەلفيە:دروستە مجرور يان منصوب بكەى ئەو ناوەى دەبێتە تابعى مفعولى مجرورى اسمە فاعل،وەكو نموونەى((مُبْتَغِى جَاهٍ وَمَالاً مَنْ نَهَضْ))واتا:ئەو كەسە شوێن پلەوپايەومالٚ كەوتووە ئەوەى ڕاپەڕيوە،لەم نموونەيەدا مالاً تابعى جاهٍ ومنصوبە،ودروستە مجروريش بىٚ.

دروستە تابعی معمولی اسمە فاعلێکی مجرور[٤] بەهۆی إضافەوە:مجرور بێ،وە دروستە منصوبیش بێ،وەکو((هذا ضاربُ زيدٍ وعَمْرٍو،وعمْراً))جا کە مجرور بێ ئەوە ڕەچاوی لفظەکەی[٥] کراوە،وە کە منصوب بێ ئەوە فعلێك نادیارە-ئەمەش بۆچوونی ڕاستە-وتقدیرەکەی((ویضْربُ عمْراً))،یان ڕەچاوی شوێن(محلّ)ـی ناوە مجرورەکە کراوە،ئەمەش بۆچوونی باووزانراوە،ئەم دێڕە شعرە بە هەردوو ڕووەکە[١]گێڕدراوەتەوە:

٢٦٤- الوَاهِبُ الْمِائَةِ الْهِجَانِ وعَبْدِهَا    عُوذاً تُزَجِّي بَيْنَها أطْفَالَهَا[٢].

بە منصوب کردنی((عَبْدَ))وبە مجرورکردنی.

هەروەها وەکو:

٢٦٥-هَلْ أَنْتَ بَاعِثُ دِينَارٍ لِحَاجَتِنَا    أَوْ عَبْدَ رَبٍّ أَخَا عَوْنِ بْنِ مِخْرَاقِ[٣].

بە منصوب کردنی((عَبْدَ))بەوەی کە عطفکراوەتەوە بۆ جێ(محلّ)ـی دینارٍ[٤]،یان منصوبە بە فعلێکی نادیار وتقدیرەکەی:((أو تبعَث عبدَ ربّ)).

* * *

---

[٤] واتا:مفعول بە یەکەی کە اسمە فاعلەکەی بۆلا إضافە کراوە.

[٥] واتا:لفظی((زيدٍ))کە متبوعی ((عمرو))ـە.

[١] واتا:بە مجروری وبە منصوبی تابعی مفعولە مجرورەکە.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئەو کەسە دەبەخشێ سەد ووشتری سپی چاکی ناوازە بە بێچووەکانیەوە،واتا:زۆر سەخی وبەخشندەیە. **بەڵگەکەی**:(( وعَبْدِها))بە مجروری وبە منصوبی ڕیوایەت کراوە.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:ئایە تۆ دەنێری بۆمان پیاوێ کە ناوی دینارە ،یان پیاوێ کە ناوی عبدربّ یە وبرای عونی کوڕی مخراقە. **بەڵگەکەی**:(( وعَبْدَ ربّ))بە مجروری وبە منصوبی ڕیوایەت کراوە.

[٤] دینارٍ مفعولی (بَاعِثُ)ـە.

***باسى عەمەلى اسمى مفعول[١]:**

٤٣٧-وَكُلُّ مَـــا قُرِّرَ لِاسْمِ فَاعِلِ يُعْطَى اسْمَ مَفْعُولٍ بِلاَ تَفَاضُلِ

٤٣٨-فَهْوَ كَفِعْلٍ صِيغَ لِلْمَفْعُولِ فِى مَعْنَاهُ كَ(الْمُعْطَى كَفَافاً يَكْتَفِى)[٢].

هەموو ئەوەی ڕابورد دەربارەی اسمی فاعل-لەوەی ئەگەر خالی بێ لە ئەلیف ولام عەمەل دەکات ئەگەر بەمانای ئێستاوداهاتوو بێ،بەمەرجێ پشتی بەستبێ[٣]،وە ئەگەر ئەلیف ولامی پێوە بێ بەڕەهایی عەمەل دەکات-جێگیر دەبێ بۆ اسمی مفعول،دەڵێی:((أمضروبٌ الزَّيدانِ الآنَ، أو غداً))یان((جاء المضروبُ أبوهما الآن, أو غداً،أو أمسِ)).

وە حوکمی اسمی مفعول لە عەمەل کردن ومانادا وەکو حوکمی فعلی بکەر نادیارە،(مفعول بە) مرفوع دەکات[٤] وەکو چۆن فعلەکەی مرفوعی دەکات، چۆن دەڵێی:((ضُرِبَ الزيدانِ)) دەڵێی:((أمضروبٌ الزيدانِ؟)). وە ئەگەر دوو مفعولی هەبوو ئەوە یەکێکیان مرفوع دەکات وئەوی تریان منصوب دەکات،وەکو((الْمُعْطَى كَفَافاً يكتفي))لێرەدا مفعولی یەکەم جێناوی نادیارە

---

[١] اسمی مفعول بریتیە لەو ناوەی کە وەرگیراوە لە فعلی بکەر نادیار بۆ دەلالەت کردن لەسەر ئەوەی کردارەکەی بەسەردا کەوتووە.{ما اشْتُقَّ من الفعلِ المبني للمجهول للدلالة على ما وقع عليه الفعل}.

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٣٧-هەموو ئەو حوکم وحاڵەت ومەرجانەی بڕیاردرا بۆ اسمی فاعل دەدرێ بە اسمی مفعول بەبێ زیادوکەم.٤٣٨-وە ماناوعەمەلی اسمی مفعول وەکو فعلی بکەرنادیار(مبنى المجهول)وایە،وەکو نموونەی((الْمُعْطَى كَفَافاً يَكْتَفِى))واتا:ئەوکەسەی بێ زیادوکەم پێی دەدرێ بەسێتی.لێرەدا الْمُعْطَى اسمی مفعولە ونائب فاعلەکەی(هو) کە دەبێتە مفعولی یەکەمیش بۆ(الْمُعْطَى)،و دەبێتە مفعول بە دووەم،لەبەر ئەوەی فعلی اعطى دوو مفعولی پێویستە.

[٣] مەبەست لە پشت بەستن ئەوەیە اسمە فاعلەکە بکەوێتە پاش استفهام یان نفى یان نداء.

[٤] واتا:نائب فاعل،کە لە بنەڕەتدا (مفعول بە)یە.

ودەگەڕێتەوە بۆ ئەلیف ولامەکە[١]،بۆیە مرفوعە لەبەر ئەوەی لەجێی فاعل(نائب فاعل)ـە،وە((كَفافاً))مفعول بە دووەمە.

* * *

٤٣٩- وَقَدْ يُضَافُ ذَا إِلَى اسْمٍ مُرْتَفِعْ مَعْنىً كَـ مَحْمُودُ الْمَقَاصِدِ الْوَرِعْ[٢].

دروستە اسمی مفعول إضافە کرێ بۆلای مرفوعەکەی،دەڵێی لە ووتەی:(( زيدٌ مضروبٌ عبدُه)):((زيدٌ مضروبُ العبدِ))إضافە دەکەی اسمە مفعولەکە بۆلای ئەو ناوەی کە مرفوعێتی،هەروەها وەکو نموونەی((الورعُ محمودُ المقاصدِ)) ئەصڵەکەی((الورعُ محمودٌ مقاصدُهُ))،وە ئەمەش بۆ اسمی فاعل دروست نیە،ناڵێی:((مررتُ برجلٍ ضاربِ الأبِ زيداً))مەبەستت((ضاربٍ أبوه زيداً))بێ.

---

[١] مەبەست ئەلیف ولامی(الْمُعْطَى)کە (الـ)ـی موصولەیە وبەمانای(الذي)دێ.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەندێ جار ئەم ناوە-واتا:اسمی مفعول-إضافە دەکرێ بۆلای مرفوعەکەی-واتا:بۆلای نائب فاعلەکەی-وەکو ڕستەی((مَحْمُودُ الْمَقَاصِدِ الْوَرِعْ))واتا:کەسی دینداروخواناس مەبەستی چاك وپاکە،ئەصلی ئەم ڕستەیە((الورعُ محمودُ المقاصدِ)).

## بینای مصدر(١)

٤٤٠- فَعْلٌ قِيَاسُ مَصْدَرِ الْمُعَدَّى مِنْ ذِی ثَلاَثَةٍ كَ(رَدَّ رَدَّا)(٢).

فعلی سێ پیتی(ثلاثی)تێپەڕ(متعدی)مصدرەكەی لەسەر وزنی(فَعْلٌ)دەبێ بە یاسایەكی جێگیر،پێشەوا سیبویە دەقی ئەمەی فەرموە،دەڵێ:((رَدَّ ردّاً،وضرَبَ ضَرْباً، وفَهِمَ فَهْماً))،هەندێ ووتوویانە ئەمە یاسا(قیاس)ی نیە،بەلاّم ئەم بۆچوونە بەهێز نیە.

* * *

٤٤١- وَفَعِلَ اللاَّزِمُ بَابُهُ فَعَلْ كَفَرَحٍ، وَكَجَوًى،وَكَشَلَلْ(٣).

واتا:مصدری فعلی لازم كە لەسەر وزنی(فَعِلَ)بێ (فَعَلٌ)ـە بە قیاس،وەكو فرِحَ فَرَحاً،وجوِيَ جَوىً(٤)،وشَلّتْ يداهُ شَلَلاً.

* * *

٤٤٢-وَفَعَلَ اللاَّزِمُ مِثْلَ قَعَدَا لَهُ فُعُولٌ بِاطِّرَادٍ كَ(غَدَا)

٤٤٣-مَا لَمْ يَكُنْ مُسْتَوجِباً فِعَالاَ أَوْ فَعَلاَنَاً فَادْرِ، أَوْ فُعَالاَ

٤٤٤-فَأَوَّلٌ لِذِی امْتِنَاعٍ كَأَبَى وَالثَّانِ لِلَّذِی اقْتَضَى تَقَلُّبَا

٤٤٥-لِلدَّا فُعَالٌ أَوْ لِصَوتٍ وَشَمَلْ سَيْراً ،وَصَوْتاً الْفَعِيلُ كَصَهَلْ(٥).

---

(١) مەبەست لە بینای مصدر شیواز و وەزنی مصدری هەر فعلێكە،ثلاثی بێ یان زیاتر لە ثلاثی بەهەموو جۆرەكانیەوە،وەكو باسی دەكەین. جا پێشتر باسی مصدر مان كرد،ولێرەدا باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە چۆن مصدری هەر فعلێك بزانین.

(٢) پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:مصدری فعلی ثلاثی متعدی لەسەر وزنی(فَعْلٌ) دەبێ، بە یاسایەكی جێگیر،وەكو فعلی(رَدَّ )مصدرەكەی(رَدَّا).

(٣) پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:وە فعلی ثلاثی لازم كە لەسەر وزنی(فَعِلَ)بێ،ئەوە مصدرەكەی لەسەر وزنی(فَعَلٌ)دەبێ،ئەم سێ مصدرە: فَرَحٌ ،وَجَوًى ،وَشَلَلٌ،كە فعلەكانیان لەسەر وزنی(فَعِلَ)یە.

(٤) جوِيَ واتا:پەرێشانی خۆشەویستی زۆر.

(٥) پوختەی مانای ئەم چوار دێڕەی ئەلفیە-كە باسی مصدری فعلی ثلاثی لازمە كە لەسەر وزنی(فَعَلَ)-:٤٤٢-فعلی لازم كەلەسەر وزنی(فَعَلَ)بێ وەكو(قَعَدَ)مصدرەكەی

فعلی لازم که لەسەر وزنی(فَعَلَ)بیّ مصدرەکەی لەسەر وزنی فُعُولُ دەبیّ بە قیاسی،دەڵێی:(( قَعَدَ قُعُوداً ،غَدَا غُدُوّاً، بَكَرَ بُكُوراً)) وە ئامارژەی کرد دانەر بەووتەی:(( مَا لَمْ يَكُنْ مُسْتَوجِباً فِعَالاً –تاکۆتای))بۆ ئەوەی کە کاتیّ مصدرەکەی لەسەر وزنی فُعُولٌ دەبیّ کە لەو فعلانە نەبیّ کە مصدرەکەیان لەسەر وزنی:فِعالٌ،یان فَعَلانٌ،یان فُعالٌ دەبن.

جا ئەو فعلە لازمانەی کە مصدرەکەیان لەسەر وزنی فِعالٌ بریتین لە:هەموو ئەو فعلانەی بۆ مانای ڕێگرتن ونەکردنن،وەکو: أَبَى إِبَاءً ،ونَفَر نِفاراً ، شَرَد شِرَاداً[1]، ئەمەبوو مەبەست لەووتەی((فَـأَوَّلٌ لِـذِى امْتِنَاعٍ)).

وە ئەو فعلە لازمانەی کە مصدرەکەیان لەسەر وزنی (فعلانٌ) ن بریتین لە:هەموو ئەو فعلانەی کە مانای ئالٌ وگۆڕ وجووڵە لەخۆدەگرن، وەکو:((طَافَ طَوَفَاناً ، جَال جَولاناً ، نَزَا نَزَوَاناً[2]))ئەمەبوو مانای ووتەی ((وَالثَّانِ لِلَّذِى اقْتَضَى تَقَـلُّبَا)).

---

لەسەر وزنی(فُعُولٌ)دەبیّ بە جێگیری هەروەها وەکو فعلی(غدا)کە مصدرەکەی(غُدُوٌّ)ە.٤٤٣–بە مەرجیّ لەو فعلانە نەبیّ کە مصدرەکەیان لەسەر وزنی(فِعَالاً)یان(فَعَلاَناً)یان(فُعَالاً)بیّ.٤٤٤–جا یەکەم لەو سیانە–واتا:(فِعَالاً)–مصدرە بۆ ئەو فعلەی مانای ڕێگرتن بگەیێنیّ،وەکو فعلی ابی.وە دووەمیان واتا:( فَعَلاَنا)–بۆ ئەو فعلانەیە کە مانای ئالٌ وگۆڕ یان جووڵە دیّ. ٤٤٥–وە وزنی(فُعَالاً)مصدرە بۆ ئەو فعلانەی بۆ نەخۆشی ودەرد بەکاردێن،یان ئە فعلانەی بۆ دەنگ(صوت)ن،هەروەها ئەوانەی بۆ ڕێکردن(سیر)ن،هەروەها بۆ دەنگ وزنی(فعیلٌ)بەکاردیّ،وەکو فعلی صهل،مصدرەکەی صهیلە–واتا:حیلەودەنگی ئەسپ–.

[1] ابی:واتا مەنعی کرد یان ڕازی نەبوو، ونفر واتا:هەڵات وڕایکرد، شرد واتا:سەرکەش بوو ولەدەست دەرچوو.

[2] طَافَ واتا:سوڕانەوە، جال واتا:گەڕان، نزا واتا:بازدان.

وە ئـەو فعلـە لازمانـەی کـە مـصدرەکەیان لەسـەر وزنـی فُعـالٌ ن بـریتین لە:هەموو ئەو فعلانەی بۆ مانای نەخۆشی ،یان دەنگ بەکاردێن،نموونەی یەکـەم:سَعَلَ سُعَالاً ، زُكِمَ زُكَاماً، مَشَى بطنُه مُشَاءً. وە نموونـەی دووەم: نَعَبَ الغُـرَابُ نُعَـاباً ،ونَعَـقَ الرَّاعـي نُعَاقـاً ،وأَزَّتِ القِـدْر أُزَازاً[١] ئەمـــەبوو مەبەســـت لەووتەی:(( لِلدَّا فُعَالٌ أَوْ لِصَوتٍ)).

وە ئاماژەی کـرد بەووتـەی:(( وَشَمَلْ سَـيْراً ،وَصَوْتاً الْفَعِيلُ))بـۆ ئـەوەی کـە وزنـی (فعيل) دەبێتە مصدر بۆ هەموو ئەوفعلانەی بۆ ڕۆشتن وڕێکردنن،وە بـۆ ئـەو فعلانەی بۆ دەنگن،جا نموونەی یەکەم:ذَمَل ذميلاً[٢] ،ورَحَل رَحيلاً. وەنموونەی دووەم: نَعَبَ نعيباً،ونعق عقياً،وأزّتِ القِدْرُ أزيزاً،وصهلتِ الخيلُ صهيلاً.

٤٤٦- فُعُولَةٌ فَعَالَةٌ لِـفَعُلاَ كَسَهُلَ الأَمْرُ وَزَيْدٌ جَزُلاَ[٣].

ئەگەر فعل لەسەر وزنی فعُل بـوو-کـە تـەنها فعلـی لازم لەسـەر ئـەم وزنەیـە- ئەوە مصدرەکەی لەسەر وزنی فُعُولَةٌ یان لەسەر وزنـی فَعَالَةٌ دەبێ،نموونـەی یەکـەم:سَهُلَ سُهُولَةً ،و صَعُبَ صُعُوبَةً ، وعَذُبَ عُذُوبَةً. وەنموونـەی دووەم: جَزُلَ جَزَالَةً[٤]،و فَصُحَ فَصَاحَةً ، وضَخُمَ ضَخَامَةً.

* * *

٤٤٧- وَمَا أَتَى مُخَالِفاً لِمَا مَضَى فَبَابُهُ النَّقْلُ كَسُخْطٍ وَرِضَى[٥].

---

[١] نعب واتا:قیرەی قەڵەڕەش. نعق واتا:هاوارکردن. وازّ واتا:دەنگ ونیزەی مەنجەڵ ودیزە.

[٢] ذَمَل واتا:ڕۆیشتنی خێرای حوشتر.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:وزنی فُعُولَةٌ فَعَالَةٌ مصدرن بۆ فعلێ کەلەسەر وزنی(فَعُلَ)یە-ئەم وزنە تایبەتە بۆ فعلی لازم-،وەکو فعلی سهُل مصدرەکەی سُهُولَةٌ ،وەفعلی جزُل مصدرەکەی جَزالةٌ.

[٤] جزُل واتا:زۆربوو.

[٥] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەر مصدرێك بێ بۆ فعلی ثلاثی پێچەوانەی ئەو وزنانەی باسکران ئەوە سماعین وقیاسی نین،وەکو هەردوو مصدری سُخط ،ورِضى.

واتا ئەوەی باسكرا لەم بابەتە ئەوە قیاس ویاسای جێگیرە بۆ مصدری فعلی ثلاثی،وە ئەوەی بێ پێچەوانەی ئەوەی باسكرا ئەوە قیاسی نیە،وتەنها پشت دەبەستریّ بە بیستن لە عەرەب،وەكو: سَخِطَ سُخْطاً، ورَضِيَ رِضًا ،و ذَهَبَ ذَهَاباً ،و شَكَرَ شُكْراً ،و عَظُمَ عَظَمَةً.

* * *

***باسی وزنەكانی مصدری فعلی چوار پیتی و پێنج پیتی وشەش پیتی :**

٤٤٨–وَغَيْرُ ذِي ثَلاَثَـــةٍ مَقِيسُ مَصْدَرُهُ كَـــقُدِّسَ التَّقْدِيسُ

٤٤٩–وَزَكِّـــهِ تَزْكِيَةً وَأَجْمِــلاَ إِجْمَالَ مَنْ تَجَمُّلاً تَجَمَّــلاَ

٤٥٠–وَاسْتَعِذْ اسْتِعَاذَةً ثُمَّ أَقِـــمْ إِقَامَـــةً وَغَالِباً ذَا التَّـا لَزِمْ

٤٥١–وَمَا يَلِي الآخِرُ مُـدَّ وَافْتَحَا مَعْ كَسْرِ تِلْوِ الثَّانِ مِمَّا افْتُتِحَا

٤٥٢–بِهَمْزِوَصْلٍ كَاصْطَفَى وَضُمَّ مَا يَرْبَعُ فِى أَمْثَالِ قَـــدْ تَلَمْلَمَا[1].

---

[1] پوختەی مانای ئەم پێنج دێرەی ئەلفیە:٤٤٨–مصدری فعلی زیاتر لە ثلاثی قیاسیە وجێگیرە،بۆ نموونە هەرفعلێكی رُباعی لەسەروزنی(فَعَّلَ)بێ–وصحیح بێ وكۆتاییەكەی پیتی بزوێن(معتل)نەبێ– ئەوە مصدرەكەی لەسەر وزنی(تفعیلٌ)ـە،وەكو فعلی(قدّس) مصدرەكەی تقدیسە. ٤٤٩–بەلاّم ئەگەر معتل بێ ئەوەمصدرەكەی لەسەر وزنی(تفعلة)دەبێ وەكو فعلی زكّی مصدرەكەی(تزكية) یە،وە هەرفعلێكی رُباعی لەسەر وزنی (أفْعَلَ)بێ ئەوە مصدرەكەی لەسەر وزنی(إفعال)دەبێ، وەكوفعلی(اجملَ) مصدرەكەی إجمالە، ڕستەی(مَنْ تَجَمُّلاً تَجَمَّـلاَ)بۆ تەواوكردنی وزنە شعرەكەیە.٤٥٠– هەرفعلێكی سُداسی–شەش پیتی–لەسەر وزنی(اسْتَفْعَلَ) بێ ئەوە مصدرەكەی لەسەر وزنی(اسْتِفْعَال) دەبێ مەگەر(معتل العین)–واتا عین الفعل حەرفی علە بێ–ئەوە مصدرەكەی لەسەر وزنی(استفالة)دەبێ وەكو فعلی(استعاذ)مصدرەكەی(استعاذة)، هەروەها مصدری فعلی(اقمْ)–كە فعلێكی رُباعیەوعین الفعلی حەرفی علەیە–دەبێتە(إقامة )لەسەر وزنی(إفالة)،وەبەزۆری وایە كۆتاییە كەی تای خرە–.٤٥١–وە هەرفعلێكی پێنج حەرفی وشەشی بە هەمزەی وصل دەست پێبكات ئەوە مصدرەكەی بە زیادكردنی ئەلیفێك بۆ پێش كۆتای ومكسوركردنی حەرفی دووەمی دەبێ.٤٥٢–وەكو

لەم چەند دێڕەدا باسی مصدری فعلی زیاتر لە سێ حەرف کردووە،کە سەرجەمیان قیاسین واتا یاسای دیاریکراویان هەیە.

جا ئەو فعلە رُباعیەی لەسەر وزنی(فعّلَ)بێ،ئەوە یان فعلێکی صحیحە یان معتلە،ئەگەر صحیح بوو ئەوە مصدرەکەی لەسەر وزنی(تَفْعیلٌ)ـە، وەکو((قدّسَ تقدیساً))،وە وەکو فەرمایشتی خوای گەورە﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا﴾[1]،وە هەندێ جار مصدرەکەی لەسەر وزنی(فِعّال)دێ،وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا﴾[2]،وە هەندێ جار مصدرەکەی لەسەر وزنی(فِعَال)دەبێ بە بێ شەدەی عینەکەی،وە ئەم ئایەتە بەم شێوەیەش خوێندراوەتەوە﴿وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَابًا﴾بەبێ شەدەی حەرفی ذالەکە،وە ئەگەر فعلەکە معتل بوو[3] ئەوە مصدرەکەی لەسەر هەمان وزنە بەلام یایی وزنی تفعیل حذف دەکرێ،ولەبری تایەیەکی خڕ دێ

---

فعلی(اصطفی) مصدرەکەی دەبێتە (اصْطِفاء)، وە هەرفعلێکی پێنج حەرفی بە تا دەست پێبکات ئەوە مصدرەکەی بەوە دەبێ حەرفی چوارەمی بکرێتە ضمە وەکو فعلی(تَلَمْلَمَ)–واتا:–مصدرەکەی دەبێتە(تَلَمْلُمَ).

[1] رستەی کۆتاییە لە ئایەتی ژمارە(١٦٤)ـی سورەتی(النساء)،کورتەی ماناکەی:خوای گەورە قسەی کرد لەگەلٚ پێغەمبەر موسی–علیەالسلام–بەقسەکردن. **إعرابەکەی**: و:حسب ماقبله. كلّمَ:فعل ماضٍ.اللهُ:فاعل. موسى:مفعولٌ به. تكليماً:مفعول مطلق منصوب،وهو مؤكد لفعله للدلالة على أنّ التكليم حقيقة لا مجازا. **الشاهد فيها**:تكليماً مصدر الفعل كلّمَ لأنَ مصدر(فعّلَ)يجيء على وزن(تفعيل).

[2] ئایەتی(٢٦)ـی سورەتی(النبأ)،کورتەی ماناکەی:–دۆزەخییەکان–لەدونیادا ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی. **إعرابەکەی**:و:حسب ماقبلها. كذّبوا:فعل وفاعل. بآياتنا: جارومجرور متعلقان بـــ(كذّبوا).كِذّاباً:مفعول مطلق منصوب.**الشاهد فيها**: (كِذّابا) مصدر فعله على وزن(فعّل).

[3] واتا:حەرفی کۆتایی علە بوو.

لەکۆتایی،وئەو کات مصدرەکەی لەسەر وزنی(تَفْعِلَة)دێ،وەکو((زکّی تزکیة))،وە بەکەمی هاتووە لەسەر وزنی تفعیل،وەکو ووتەی:

٢٦٦- باتَتْ تُنَزَّى دَلْوَها تَنْزِيًّا    كَمَا تُنَزِّى شَهْلَةٌ صَبِيًّا[1].

وە ئەگەر فعلەکە مهموز بوو[2]-کە دانەر باسی نەکردووە-ئەوە مصدرەکەی لەسەر وزنی تفعیل دێ،ولەسەر وزنی تفعلة یش دێ وەکو: خَطَّأَ تَخْطِيئاً وتَخْطِئَةً، وجَزَّأَ تَجْزِيئاً وتَجْزِئَة، ونَبَّأَ تنبيأً.

وە ئەگەر فعلە رُباعییەکە لەسەروزنی((أفْعَلَ))بوو ئەوە مصدرەکەی لەسەر وزنی(إفْعال)دەبێ وەکو: أَكْرَمَ إِكْرِاماً، وأَجْمَلَ إجْمالاً ، وأَعْطَى إِعْطَاءً. ئەمە بەمەرجێ عين الفعلەکەی حەرفی علە نەبێ،جا ئەگەر عين الفعل حەرفی علە بوو ئەوە حەرەکەی عینەکە دەچێ بۆ فاالفعل وعینەکە حذف دەکرێ،ولەبریدا تای تأنیث دەهێنرێ بەزۆری،وەکو:أقامَ إقامةً، وئەصڵەکەی:إقواماً بووە وحەرکەی واوەکە چووە بۆ قافەکە،ودواتر واوەکە حذفکراوە،ولەبری تای تأنیث هاتووە وبووە بە إقامةً.

ئەمە بوو مەبەست لەووتەی((ثُمَّ أَقِمْ إِقَامَةً))،وە ووتەی:((وَغَالِباً ذَا التَّا لَزِمْ))ئاماژەیە بۆ ئەوەی باسمان کرد لەوەی کە تای تأنیث وەکو بری(تعویض)دێ بە زۆری،وە هاتووە حذفکردنی ئەم تایە،وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَإِقَامِ الصَّلَاةِ﴾[3].

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:ئەو ژنە دۆلکەکەی هەڵدەکێشێ بەلاوازی و دەلەرزێ وەکو لەرزینی پیرەژن کاتێ یاری بە منداڵ دەکات. بەڵگەکەی:(( تَنْزِيًّا))مصدری فعلی نزّی یە ولەسەر وزنی تفعیل هاتووە ولەسەر وزنی تفعلە نیە،ئەمەش کەمە.

[2] واتا:فعلە رُباعییەکەی لەسەر وزنی(فعّل)یە کۆتاییەکەی حەرفی هەمزە بوو.

[3] بەشێکە لەئایەتی(٣٧)ی سورەتی الحج.

وه ئەگەر فعلەکە خُماسی بیٚ ولەسەر وزنی(تفعّلَ)ئەوه مصدرەکەی لەسەر وزنی (تفعُّل)-به ضمةی عینەکەی-وەکو: تَجَمَّلَ تَجَمُّلاً ، تَعَلَّمَ تَعَلُّماً ، تَكَرَّمَ تَكَرُّماً.

وەئەگەر فعله که حەرفی یەکەمی هەمزه بوو[1] ئەوه مصدرەکەی بەوه دەبیٚ حەرفی سێیەمی مکسور دەکریٚ،وئەلیفێك بۆ پێش کۆتایی زیاد دەکریٚ،جا فعلەکه لەسەر وزنی انفعل بیٚ،یان افتعل بیٚ،یان استفعل بیٚ،وەکو: انْطلقَ انطِلاقاً،و اصْطفى اصطِفاءً، واسْتخرَجَ استِخراجاً،ئەمەبوو مانای ووتەی دانەر((وَمَا يَلِي الآخِرُ مُدَّ وَافْتَحَا)).

وه ئەگەر فعلی(استفعل)عینەکەی حەرفی علە بوو ئەوه حەرەکەی عینەکه دەچیٚ بۆ فاالفعل وعینەکه حذف دەکریٚ،ولەبریدا تای تأنیث دەهێنریٚ به واجبی،وەکو:اسْتَعَاذَ استِعاذةً،وئەصڵەکەی اسْتِعْواذاً بووه وحەرکەی واوەکه چووه بۆ عینەکە-کە فاءلفعله،ودواتر واوەکه حذفکراوه،ولەبریدا تای تانیث هاتووه وبووه به استِعاذةً،ئەمەبوو مانای ووتەی ابن مالك((وَاسْتَعِذْ اسْتِعَاذَةً)).

وه مانای ووتەی دانەر:(( وَضُمَّ مَا يَرْبَعُ فِى أَمْثَالِ قَدْ تَلَمْلَمَا))ئەوەیه کەئەگەر فعلی خُماسی لەسەر وزنی((تفَعْلَلَ))بیٚ ئەوه مصدرەکەی لەسەر وزنی((تفَعْلُل))-به مضموم کردنی حەرفی چوارەمی-دەبیٚ،وەکو((تَلَمْلَمَ تَلَمْلُماً,وتَدَحْرَجَ تَدَحْرُجاً)).

* * *

---

[1] واتا:هەمزەی وصل بیٚ،ئەمەش تایبەته بۆ فعلی خُماسی وسُداسی،دیاره فعلی سُداسی هەمووی به هەمزه دەست پێدەکات.

٤٥٣- فِعْلاَلٌ أَوْ فَعْلَلَةٌ لِفَعْلَلاَ وَاجْعَلْ مَقِيساً ثَانِياً لا أَوَّلاَ[١]

مصدرى فعلى (فعْلَلَ) لەسەر وزنى فِعْلال دىَ وەكو: دَحْرَجَ دِحْرَاجاً, وسَرْهَفَ سِرْهَافاً.وە لەسەر وزنى فَعْلَلَةٌ يش دىَ-ئەمەشيان قياسيە-وەكو:(( دَحْرَجَ دِحْرَاجةً,وبَهْرَجَ بَهْرجةً، وسَرْهَفَ سِرْهَافةً[٢])).

* * *

٤٥٤-لِفَاعَلَ الفِعَالُ وَالْمُفَاعَلَهْ وَغَيْرُ مَا مَرَّ السَّمَاعُ عَادَلَهْ[٣].

هەر فعلىَ لەسەر وزنى(فاعَل)بىَ ئەوە مصدرەكەى لەسەر وزنى (فِعَال)و(مُفاعَلة)دەبىَ،وەكو((ضَارَبَ ضِراباً ومُضارَبَةً، وقَاتَلَ قِتالاً ومُقاتلَةً وخَاصَمَ خِصامَاً ومُخاصَمةً)).

هەروەها ئاماژەى كرد دانەر بە ووتەى:(( وَغَيْرُ مَا مَرَّ-تا كۆتاى))بۆ ئەوەى كە هەر مصدرىَ بىَ بۆ فعلى غير ثلاثى بەدەر لەو وزنانەى باسكران ئەوە سماعين وياساييان نيە،وە ماناى ووتەى((عادله))ئەوەيە كە سماع وبيستن لە عەرەب هاوتاى ئەو جۆرە مصدرانەن،وبۆيە لەخۆوە وبەبىَ بيستن لە عەرەبى رەسەن دروست نيە بوترێن،وەكو ووتەى عەرەب-لە مصدرى فعلى فعّل كە معتل بىَ-تفعيلاً،وەكو:

---

[١] پوختەى ماناى ئەم ديَرەى ئەلفيە:هەريەك لە وزنى(فِعْلاَلٌ)و( فَعْلَلَةٌ)مصدرن بۆ فعلى رُباعى (فَعْلَلَ)،دووەميان-واتا:(فَعْلَلَةٌ)-قياسيە نەوەك يەكەميان.

[٢] دحرج واتا:تلاندنەوە. سرهف واتا:خواردنى چاكى دايە. بهرج واتا:حەلاَلى كرد،يان تەزويركردن.

[٣] كورتەى ماناى ئەم ديَرەى ئەلفيە:فعلى رُباعى(فاعَلَ) مصدرەكەى لەسەر وزنى(فِعَال)و(مُفاعَلة)دەبىَ،وە جگە لەوانەى باسكران هەر وزنێكى تر هاتبىَ بۆ مصدرى فعلىَ ئەوە سماعيە.

*باتَتْ تُنَزِّی دَلْوَها تَنْزِیًّا[١]* كە بەپێی قیاس بوایە دەوترا تنزیةً، وە وەكو ووتەیان لە فعلی حوقل حیقالاً،قیاسەكەی حوقلەً–وەكو ((دحرج دحرجةً))، وە لەنموونەی هاتنی حیقال ووتەی:

٢٦٧– یا قَوْمِ قَدْ حَوْقَلْتُ أو دَنَوْتُ وشرُّ حِیقالِ الرِّجالِ الْمَوْتُ[٢].

هەروەها وەكو ووتەیان –لە مصدری فعلی تفعّل–تِفِعّالاً،وەكو: تَمَلَّقَ تِمِلَّاقاً،وە بەپێی قیاس دەبوایە تفعُّلَ تفعُّلاً،وەكو: تَمَلَّقَ تَمَلُّقاً.

* * *

*باسی اسمی مەڕەواسمی هەیئە:

٤٥٥–وَفَعْلَةٌ لِمَرَّةٍ كَجَلْسَهْ وَفِعْلَةٌ لِهَيْئَةٍ كَجِلْسَهْ[٣].

ئەگەر ویسترا اسمی مەڕە لە مصدری فعلی ثلاثی بكرێ ئەوە دەوترێ فَعْلَةٌ–بە فتحەی حەرفی فایەكەی–وەكو: ضَربتُه ضَرْبَةً،وقتلْتُهُ قَتْلَةً. ئەمە بەمەرجێ مصدرەكە بۆخۆی تای تأنیثی پێوە نەبێ،جا ئەگەر تای تانیثی پێوە بوو ئەوە دەبێ صفەیەكی بۆ بهێنرێ كە بۆ یەك جار كردنیەتی،وەكو:نَعْمة،ورحْمة،كە ئەگەر بیوسترێ بۆ یەك جار بێ دەبێ وەصفی كەی بە یەك[٤].

وە ئەگەر ویسترا اسمی هەیئە لە مصدری فعلی ثلاثی دروستی كرێ دەوترێ: فِعْلَةٌ–بە فتحەی حەرفی فایەكەی–وەكو: جَلَسَ جِلْسَةً حسنةً,وقَعَدَ قِعْدةً، ومات مِیْتَةً.

---

[١] پێشتر مانای ئەم دێڕەمان كرد.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەی گەلەكەم بێگومان پیر ولاوازبووم یان نزیكم لە پیری ولاوازی،وە خراپترین پیری مردنە. **بەڵگەكەی**:((حیقال))مصدری فعلی حوقل یە كە لەسەر وزنی فعلل یە ودەبوایە مصدرەكەی–بە پێی قیاس– حوقله بوایە.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:اسمی مەڕە–كە مەبەست پێی یەك جار كردنی ئەو كارەیە–لە سەر وزنی(فَعْلَةٌ)دێ،وە اسمی هەیئە–كە مەبەست پێی شێوازو چۆنێتی ئەو كارەی–لەسەر وزنی(فِعْلَةٌ)دەبێ.

[٤] واتا:دەڵێ نَعْمةً واحدةً، و رحْمة واحدةً.

٤٥٦- فِى غَيْرِ ذِى الثَّلاَثِ بِالتَّا الْمَرَّهْ وَشَــذَّ فِيــهِ هَيْئَةٌ كَالْخِمْرَهْ[١].

ئەگەر بیوستریٚ اسمى مەڕە لە فعلى زیاتر لـە ثلاثـى دروستکریٚ،ئەوە تـاى خڕ دەخریٚتە سەر مصدرەکەى وەکو: أَكْرَمْتُهُ إِكْرَامَةً، و دَحْرَجْتُهُ دِحْرَاجَةً.

وە بەشاذى هاتووە وزنى فِعْلة لـە فعلـى زیـاتر لـە ثلاثـى،وەکو ووتـەیان: هي حَسَنةُ الخِمْرَةِ[٢]،وزنـى فِعلـة یـان دروسـت کـردووە لـە فعلـى(اختمر)،وە وەکـو ووتەیان: هو حسنُ العِمّة[٣].وزنى فِعلة یان دروست کردووە لە فعلى(تعمّم).

* * *

## بیناى اسمى فاعل واسمى مفعول وصفەى مشبّهه

٤٥٧- كَفَاعِلٍ صُغِ اسْمَ فَاعِلٍ إِذَا مِنْ ذِى ثَلاَثَةٍ يَكُونُ كَـغَذَا[٤].

هـەرکاتیٚ بیوستریٚ اسمـى فاعل لـە فعلـى ثلاثـى دروسـتکریٚ ئـەوە لەسـەر وزنى((فاعل))دیٚ،ئەمەش یاسایە بۆ هەموو فعلیٚکى ثلاثى کە لەسـەر وزنـى فَعَـلَ بـیٚ-کـە عـین الفعلەکـەى مفتوحـە-تیٚپـەڕ(متعـدى)بـیٚ یـان تیٚنەپـەڕ(لازم)بیٚ،وەکـو ضَـرَبَ اسمـە فاعلەکـەى ضـاربٌ ـە،و ذهَـبَ ذاهِـبٌ ـە،وغذا غاذٍ ـە، وە ئەگەر فعلەکە لەسـەر وزنـى فَعِلَ بیٚ-کە عین الفعلەکەى مکسورە-ئەوە یان متعدیە،یان لازمە،جا ئەگەر متعدى بیٚ ئەوە بەپیٚى یاسا اسمە فاعلەکەى لەسـەر وزنـى فاعلـە،وەکو رَکِبَ اسمـە فاعلەکـەى راکِبٌ ،وة

---

[١] پوختەى ماناى ئەم دیٚڕەى ئەلفیە:ئەگەر فعلەکە زیاتر لە ثلاثى بوو ئەوە اسمى مەڕەکەى بە زیادکردنى تاى مُدوَر-خڕ-دەبیٚ بۆ مصدرەکەى،وە بە شاذى هاتووە لەسەر وزنى فِعْلة وەکو خِمْرة،کە اسمى مەڕەى فعلى(اخْتَمَرَ)یە.

[٢] واتا:ئەو سەرپۆشەکەى جوانە.

[٣] واتا:ئەو جامەدانیەکەى جوانە.

[٤] کورتەى ماناى ئەم دیٚڕەى ئەلفیە:اسمى فاعل دروست دەکرى لەسەر وزنى فاعل ئەگەر فعلەکەى سیٚ حەرف-ثلاثى-بوو،وەکو فعلى غذا اسمە فاعلەکەى غاذي ـە.

عَلِمَ عالِمٌ،وه ئەگەر لازم بێ،یان ئەگەر فعله ثلاثیەکه لەسەر وزنی فعُلَ بوو-کەعین الفعلەکەی مضمومة-ئەوه اسمه فاعلەکەی لەسەر وزنی فاعل نایه مەگەر به سماعی،ئەمەیه مەبەست له ووتەی دانەر:

٤٥٨- وَهْوَ قَلِيلٌ فِى فَعُلْتُ وَفَعِلْ          غَيْرَ مُعَدًّى بَلْ قِيَاسُهُ فَعِلْ

٤٥٩-وَأَفْعَلُ ،فَعْلاَنُ نَحْوُ أَشِرِ          وَنَحْوُ صَدْيَانَ،وَنَحْوُ الأَجْهَرِ[1].

واتا:هاتنی اسمی فاعل لەسەر وزنی فاعل کەمه لەو فعلەی لەسەر وزنی فعُل-که عین الفعلەکەی مضمومه-وەکو ووتەیان:حمُضَ اسمه فاعلەکەی حامِضٌ،هەروەها کەمه بۆ ئەو فعلەی لەسەر وزنی فعِلَ-که عین الفعلەکەی مکسوره-که لازم بێ،وەکو:أمِنَ اسمه فاعلەکەی آمِنٌ،و سلِمَ سالِمٌ،وه عَقِرتْ المرأةُ اسمه فاعلەکەی عاقِرٌ،بەڵکو قیاس ویاسا بۆ اسمه فاعلی فعلی فعِلَ که مکسور العینه و لازمه ئەوەیه لەسەر وزنی فَعِلٌ-به کسرەی عینەکەی-دەبێ وەکو((نَضِرَ نَضِرٌ , بَطِرَ بَطِرٌ , أَشِرَ أَشِرٌ[2]))یان لەسەر وزنی فعْلان دەبێ وەکو((عَطِشَ : عَطْشَانُ , صَدِيَ صَدْيَانُ))،وه یان لەسەر وزنی افعل دەبێ،وەکو((سَوِدَ أَسْوَدُ , جَهِرَ أَجْهَرُ)).

٤٦٠- وفَعْلٌ أَوْلَى وَفَعِيلٌ بِفَعُلْ          كَالضَّخْمِ وَالْجَمِيلِ وَالفِعْلُ جَمُلْ

٤٦١-وَأَفْعَلٌ فِيهِ قَلِيلٌ وَفَعَـلْ          وَبِسِوَى الفَاعِلِ قَـدْ يَغْنَى فَعَلْ[3].

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیه:٤٥٨—وزنی فاعل-کەمه بۆ فعلی ثلاثی که لەسەر وزنی فعُلَ بێ،یان لەسەر وزنی فعِلَ بێ و متعدی نەبێ-واتا:لازم بێ-،بەڵکو لەسەر وزنی فَعِلٌ دەبێ.٤٥٩-یان لەسەر وزنی افْعَلٌ دەبێ،یان فَعْلانُ،وەکو اشِرٌ،وه وەکو صدْیانُ،وه وەکو الأَجْهَر.

[2] نَضِرٌ واتا:گەشاوەوجوان. بَطِرٌ ,أَشِرٌ واتا:لووت بەرز ولەخۆبایی.

[3] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیه:٤٦٠-وزنی فَعْلٌ وفعیلٌ له پێشتره بۆ اسمه فاعلی فعلی فعُلَ ،وەکو ضَخْمٌ وجمیلٌ،فعلی جمیل جمُلَ یه.٤٦١-وه به کەمی هاتووه وزنی افْعلٌ بۆ فعُلَ ،هەروەها وزنی فَعَلٌ، وه هەندێ جارێ وزنی فَعَلٌ لەبری فاعلٌ دێ.

ئەگەر فعل لەسەر وزنی فعُلَ-کە مضموم العینە-بوو ئەوە بەزۆری اسمە فاعلەکەی لەسەر وزنی فعْلٌ دەبێ،وەکو((ضَخُمَ اسمە فاعلەکەی ضَخْمٌ،وە شَهُمَ شَهْمٌ[1]))،وە لەسەر وزنی فعیلٌ دەبێ،وەکو((جَمُلَ اسمە فاعلەکەی جمیلٌ،وشَرُفَ شریفٌ))،وە کەمە هاتنی اسمی فاعل[2] لەسەر وزنی افْعَل وەکو((خطُبَ اسمە فاعلەکەی اَخْطبُ))،هەروەها کەمە هاتنی لەسەر وزنی فَعَلٌ وەکو((بطُلَ اسمە فاعلەکەی بَطَلٌ)).

وە پێشتر ڕابورد کە یاساوقیاس بۆاسمی فاعلی فَعَلَ کە مفتوح العینە ئەوەیە کەلەسەر وزنی فاعِلٌ بێ،بەڵام بەکەمی هاتووە لەسەر غەیری وزنی فاعل،وەکو فعلی طاب اسمە فاعلەکەی طیِّبٌ،وە فعلی شاخَ شَیْخٌ،وە فعلی شابَ اشْیبُ،ئەمەشە مانای وتەی:((وَبِسِوَى الفَاعِلِ قَدْ يَغْنَى فَعَلْ)).

*اسمی فاعل لە فعلی زیاتر لە ثلاثی:

٤٦٢-وَزِنَةُ الْمُضَارِعِ اسْمُ فَاعِلِ      مِنْ غَيْرِ ذِی الثَّلاَثِ كَالْمُوَاصِلِ
٤٦٣-مَعْ كَسْرِ مَتْلُوِّ الأَخِيرِ مُطْلَقَا      وَضَمِّ مِيمٍ زَائِدٍ قَدْ سَبَقَا
٤٦٤-وَإِنْ فَتَحْتَ مِنْهُ مَا كَانَ انْكَسَرْ      صَارَ اسْمَ مَفْعُولٍ كَمِثْلِ الْمُنْتَظَرْ[3].

دەڵێ:وزنی اسمی فاعل لە فعلی زیاتر لە سێ حەرف هەمان وزنی فعلە مضارعەکەیەتی بە زیادکرنی میمێکی مضموم لە جێی حەرفە

---

[1] شهم:زیرەك.

[2] واتا:هاتنی اسمی فاعل بۆ فعلی ثلاثی مضموم العین(فَعُلَ)).

[3] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:اسمی فاعلی فعلی زیاتر لە سێ -واتا:فعلی رُباعی وخماسی وسداسی-لەسەر وزنی فعلە مضارعەکەیان دەبن بە گۆڕینی حەرفە مضارعەکە بە میمێکی مضموم،ومکسور کردنی حەرفی پێش کۆتای،وە ئەگەر حەرفی پێش کۆتای مفتوح بکەی ئەوە دەبێتە اسمی مفعول،وەکو ناوی مُنتظَر-کە اسمی مفعولی فعلی(انتظَر)یە.

مضارعەکە،ومکسور کردنی پێش کۆتایی بە ڕەهایی:واتا ئەگەر پێش کۆتایی مکسور بێ یان مفتوح بێ،کەوابوو دەڵێی:(( قَاتَلَ يُقاتِلُ فهو مُقاتِلٌ، ودحْرَجَ يُدَحْرِجُ فهو مُدَحْرِجٌ،و واصَلَ يُواصِلُ فهو مُواصِلٌ،و تَدَحْرَجَ يتدحْرَجُ فهو مُتدحْرِجٌ،و تعلَّمَ يتعلَّمُ فهو مُتعلِّمٌ)).

وە ئەگەر وویستت اسمی مفعول دروستکەی لە فعلی زیاتر لە ثلاثی ئەوە وەکو اسمی فاعل دەکەی،بەڵام پێش کۆتایی مفتوح دەکەی،وەکو: مُضارَبٌ، مُقَاتَلٌ , مُنْتَظَرٌ.

* * *

*وزن ودروستکردنی اسمی مفعول لە فعلی ثلاثی :

٤٦٥- وَفِى اسْمِ مَفْعُولِ الثُّلاَثِى اطَّرَدْ     زِنَــةُ مَفْعُولٍ كَآتٍ مِنْ قَصَدْ[١].

ئەگەر ویسترا اسمی مفعول لە فعلی ثلاثی دروستکرێ ئەوە لەسەروزنی ((مَفْعُولٌ))دێ، ئەمەش یاساوجێگیرە بۆی،وەکو((قَصَدْتُه فَهو مَقْصُودٌ ، ضَرَبْتُه فهو مَضْرُوبٌ ، مَرَرْتُ به فهو مَمْرُورٌ به[٢])).

*بەکارهێنانی وزنی( فعيل )لەجێی( مفعولٌ ):

٤٦٦-ونَابَ نَقْلاً عَنْهُ ذُو فَعِيلِ     نَحْوُ فَتَاةٍ أَوْ فَتىً كَحِيــلِ[٣].

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:اسمی مفعولی فعلی ثلاثی وزنی(مفعول)ی بۆ جێگیرە،وەکو هاتنی اسمی مفعول لە فعلی قصد(مَقْصُودٌ).

[٢] اسمی مفعول لە فعلی متعدی دروست دەکرێ، کەوابوو ئەگەر فعلەکە لازم بوو ئەوە دەبێ بکرێتە متعدی پاشان اسمی مفعولی لێ دێ، لەم سێ نموونەیەدا هەریەك لە فعلی(ضَرَبَ وقَصَدَ)متعدین ڕاستەوخۆ کراون بە اسمی مفعول،بەڵام فعلی(مررتُ) فعلێکی لازمە بۆیە جارومجروری بۆ هێنراوە.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:بەکار دێ وزنی(فعیلٌ)لە جێی(مفعولٌ)بە بێ یاسا-واتا:سماعیە -،وەکو بەکارهێنانی کحیلٌ لە جێ مکحولٌ-واتا:چاو ڕەشتوو-.

فعیلٌ جێی مفعولُ دەگرێ لەڕووی ماناوە،وەکو((مررتُ برجلٍ جَریحٍ، وامْرأةٍ جریحٍ، وفتاةٍ کحیلٍ، وفتیً کحیلٍ، وامْرأة قتیلٍ ورجلٍ قتیل))هەریەك لە جریح وقتیل وکحیل لە جێی مجروح ومکحول ومقتول هاتوون.

ئەمەش[1] قیاس ویاسای نیە،بەڵکو تەنها پشت بە بیستنی دەبەسترێ، ئەمەیە مانای ووتەی دانەر((ونَابَ نَقْلاً عَنْهُ ذُو فَعِیلٍ)).

جا کوڕی دانەر[2] وتوویەتی بەکارهێنانی وزنی فعیل لە جێی مفعول زۆرە وقیاسی نیە،بە یەکدەنگی زانایان، لە بانگەشەی یەکدەنگی زانایان لەم بابەتەدا قسە هەیە،ئەوەتا باوکی[3] لە کتێبی التسهیل دا ولە بابەتی اسمی فاعل ولە باسی جێگرتنی فعیل بۆ مفعول فەرموویەتی:ئەمە قیاسی نیە،پێچەوانەی بۆچوونی هەندێکیان،وە لە شەرحەکەیدا فەرموویەتی: هەندێکیان فەرموویانە ئەمە قیاسیە بۆ هەر فعلێك کە وزنی فعیلی نەبێ بۆ اسمی فاعل،جا ئەگەر هەیبوو وەکو علیمٌ ئەوە بە قیاسی بەکارنایە فعیل لە جێی مفعول،هەروەها فەرموویەتی لە بابەتی مُذکر ومؤنثدا:بەکارهێنانی فعیل لە جێی مفعول لە گەڵ زۆرێکەیدا قیاسی نیە،کەوابوو دانی ناوە بە قسەی ڕاستتر[4]،ئەمەش مانای وایە ڕاجیای(خلاف)هەیە.

وە دەکرێ پاساو بۆ کوڕی دانەر بکرێ بەوەی کە بانگەشەی یەکدەنگی کردووە لەوەی کە وزنی فعیل لە جێی مفعول بەڕەهایی نیە،واتا بۆ هەموو فعلێ نیە،ئەمەش وایە،وەکو باوکی لە شەرحی کتێبی التسهیل دا فەرموویەتی:کە بێژەری ئەمەی دەڵێ قیاسیە تایبەتی دەکات بەو فعلەی کە وزنی فعیلی نیە بۆ اسمی فاعل.

---

[1] واتا:بەکار هێنانی فعیل لە جێی مفعول.

[2] مەبەست کوڕی ابن مالکە کە شەرحی ئەلفیەکەی باوکی کردووە.

[3] واتا:ابن مالك،لە کتێبی التسهیل دا

[4] کە دەڵێ قسەی ڕاستتر(اصح)،واتا:قسەی ڕاست(صحیح)یش هەیە،کەوابوو إجماع نیە لە بابەتەکەدا.

هەروەها دانەر ئاگاداری دا بە ووتەی:((فَتَاةٍ أَوْ فَتىً كَحِيلٍ))کە وزنی فعیل لەجێی مفعول بێ یەکسانە بۆ نێر ومێ،دواتر ئەم بابەتە بەڕوونتر دێ لە بابەتی التأنیث، إنشاء اللهُ تعالی.

وە دانەر لە کتێبی التسهیل دا فەرموویەتی کە فعیل جێی مفعول دەگرێ لە رووی ماناوە،نەوەك لە رووی عەمەل کردن،کەوابوو لەسەر ئەم بۆچوونە ناڵێی:((مررتُ برجلٍ جريحٍ عبدُهُ))عبدُهُ مرفوع کەی بە جريح[1]،بەلاّم غەیری دانەر ئەمەی بەدروست زانیوە.

* * *

***باسی صفەی مُشبّهە:**

٤٦٧–صِفَةٌ اسْتُحْسِنَ جَرُّ فَاعِلِ    مَعْنًى بِهَا الْمُشْبِهَةُ اسْمَ الفَاعِلِ[2].

پێشتر رابورد کە مەبەست لە صفە[3]:ئەوەیە کە ماناو خاوەنەکەی(معنی وذات) لە خۆ بگرێ،ئەمەش هەریەك لە اسمی فاعل،واسمی مفعول،وأفعلی تفضیل،وصفەی مشبّهە دەگرێتەوە.

جا دانەر باسی ئەوەی کردووە کە نیشانەی صفەی مشبّهە ئەوەیە کە جوان وڕێکە مجرورکردنی فاعلەکەی پێی،وەکو:((حَسَنُ الوجهِ، ومنطلِقُ اللسانِ، وطاهِرُ القلبِ))ئەصڵەکەی:حَسَنٌ وجْهُهُ، ومُنطلِقٌ لسانُهُ، وطاهِرٌ قلْبُهُ، لێرەدا وجْهُهُ:مرفوعە بە حَسَنٌ وفاعلێتی،ولسانُهُ:مرفوعە بە مُنطلِقٌ،

---

[1] چونکە اسمی مفعول ناوەکەی پاش خۆی مرفوع دەکات بەوەی دەبێتە نائب فاعل بۆی.

[2] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:صفەی مشبّهە نیشانەکەی ئەوەیە کە جوانە مجرورکردنی فاعلەکەی،واتا:إضافەدەکرێ بۆلای فاعلەکەی وبەلفظ مجروری دەکات،ولەماناذا فاعلێتی.

[3] مەبەست بە صفە لێرەدا نعت نیە ،بەڵکو مەبەست پێی ئەو ناوانەیە کە وەرگیراو(مشتق)ن،وجامد نین.

وقلبُـهُ:مرفوعـه بـه طـاهرٌ، ئەمـەش[١] دروسـت نيـه بـۆ جۆرەكـانى تـرى صفه،كەوابوو نالّێی:(( زيدٌ ضاربُ الأبِ عمراً))[٢]مەبەستت((ضاربٌ أبوهُ عمراً))،وه نالّێی((زيدٌ قائمُ الأبِ غدا))مەبەستت((زيدٌ قائمٌ أبوهُ غدا))،هەروەها پێشتر ڕابورد كه اسمی مفعول دروسته إضافەبكرێ بۆلای مرفوعەكەی،دەلّێی:(( زيدٌ مضْروبُ الأبِ))لەم كاتەدا وەكو صفەی مشبّهه وايه.

* * *

٤٦٨- وَصَوْغُهَا مِنْ لاَزِمٍ لِحَاضِرِ   كَطَاهِرِ الْقَلْبِ جَمِيلِ الظَّاهِرِ[٣]

واتا:صفەی مشبهه له فعلی متعدی دروست ناكرێ[٤]،كەواتا نالّێی:(( زيدٌ قاتِلُ الأبِ بكراً))مەبەستت قاتِلُ الأبِ بكراً[٥]،بەلّكو تەنها لەفعلی لازم دروست دەكرێ،وەكو((طَاهِرِ الْقَلْبِ جَمِيلِ الظَّاهِرِ[٦]))،هەروەها دەبێ فعلەكە تەنها بۆ حال بێ،وئەمەی مەبەست له ووتەی دانەر:((لِحَاضِرِ))كەوابوو نالّێی:(( زيدٌ حسنُ الوجهِ غداً أو أمس)).

---

[١] واتا:إضافەكردن بۆلای فاعلەكەی.

[٢] پێشتر باسمان كرد اسمی فاعل كه خالی بێ له ئەليف ولام بەمەرج عەمەل دەكات،يان عەمەل ناكات.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيه:صفەی مشبّهه دروست دەكرێ ووەردەگيرێ له فعلی لازم كه بۆ حال بێ وبۆ ڕابردو داهاتوو نەبێ،وەكو:طَاهِرِ الْقَلْبِ جَمِيلِ الظَّاهِرِ،واتا:دلّ ودەرونی پاكه ودەری جوانه.

[٤] لێرەدا صفەی مشبهه له اسمی فاعل جيادەبێتەوە،لەبەر ئەوەی اسمی فاعل له فعلی لازم ومتعدی دروست دەكرێ وەكو باسكرا.

[٥] لەبەر ئەوەی فعلی قتل فعلێكی متعديه.

[٦] لێرەدا طاهر له فعلی طهُر وەرگيراوە،وجميل له فعلی له جمُل وەرگيراوە وهەردووكيان فعلی لازمن.

وە هۆشداری دا دانەر بە ووتەی:((كَطَاهِرِ الْقَلْبِ جَمِيلِ الظَّاهِرِ))بۆ ئەوەی كە صفەی مشبهە ئەگەر لە فعلی ثلاثی بێ دوو جۆرە:یەكێكیان:هاوتای فعلی مضارعە[1]،وەكو((طَاهِرِ الْقَلْبِ[2]))ئەمەش كەمە،ودووەمیان:هاوتای نیە،ئەمەش زۆرە،وەكو((جَمِيلُ الظَّاهِرِ، وحَسَنُ الوجهِ، وكَرِيمُ الأبِ))،بەلاّم ئەگەر لە فعلی غەیری ثلاثی بوو ئەوە پێویستە هاوتای فعلە مضارعەكەی بێ،وەكو((ومنطلقُ اللسانِ)).

* * *

٤٦٩-وَعَمَلُ اسْمِ فَاعِلِ الْمُعَدَّى    لَهَا عَلَى الْحَدِّ الَّذِي قَدْ حُدَّا[3].

واتا:جێگیر دەبێ بۆ صفەی مشبهە عەمەلی اسمی فاعلی متعدی،كە بریتیە لە رفع كردن،ونصب كردن،وەكو((زيدٌ حسَنٌ الوجْهَ))لێرەدا لە ناوی(حسنٌ)جێناوێكی مرفوعی[4] هەیە كە فاعلە،و(الوجهَ)دەبێتە منصوبی هاوشێوەی مفعول بە[5]، لەبەر ئەوەی ناوی(حسنٌ)هاوشێوەی(ضاربٌ)ـە وعملی ئەو دەكات، هەروەها ئامارژەی كرد دانەر بەووتەی:((عَلَى الْحَدِّ الَّذِي

---

[1] مەبەست لە هاوتابوونی فعلی مضارعە لەڕووی حركات وسكنات،بۆ نموونە طاهرٌ هاوتای فعلی يطهرُ .

[2] تێبینی:ووشەی(طاهر)دەكرێ اسمی فاعل بێ،ودەكرێ صفەی مشبهە بێ،جا ئەگەر مەبەست لە طاهر صفەتێكی كاتی بێ ئەوە اسمی فاعلە،وە ئەگەر مەبەست پێی صفەتێكی جێگیر وهەمیشەی بێ ئەوە صفەی مشبهەیە،هەروەها هەموو صفەتێكی تر، بەمەش هەریەك لە اسمی فاعل و صفەی مشبهە لەیەك جیا دەبنەوە لەڕووی ماناوە.

[3] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:-صفەی مشبهە-هەمان عەمەلی اسمی فاعلی متعدی دەكات-واتا:مرفوع ومنصوبی پێویستە-،بەو شێوەیەی باسكرا.

[4] واتا:لە محلی رفعدایە،چونكە جێناو مبنیە.

[5] لەبەر ئەوەی(حَسَنٌ) لە فعلی(حسُن)وەرگیراوە و فعلێكی لازمە وپێویستی بە مفعول بە نیە،بۆیە دەڵێن(الوجه)منصوبە بە هاوشێوەی مفعول بە(التشبيه بالمفعول به).

قَدْ حُدًّا))بۆ ئەوەی کە صفەی مشبهە عەمەل دەکات بەو شێوەیەی باسکرا لە اسمی فاعل،کە بریتیە لە پشت بەستن[1].

* * *

٤٧٠–وَسَبْقُ مَا تَعْمَلُ فِيهِ مُجْتَنَبْ وَكَوْنُـهُ ذَا سَبَبِيَّةٍ وَجَـبْ[2].

لەبەر ئەوەی صفەی مشبهە فەرعێکە لە اسمی فاعل ئەوە تەنها عەمەل لەو دەکات،بۆیە دروست نیە پێشکەوتنی معمولەکەی بەسەریدا،وەکو ئەوەی دروست بوو لە اسمی فاعل،کەوابوو دروست نیە بڵێی((زيدٌ الوجْهَ حسَنٌ))وەکو دروستە بڵێی:((زيدٌ عَمراً ضاربٌ))،هەروەها صفەی مشبهە تەنها عەمەل لەو شتە دەکات کە پەیوەندی پێوەیە،وەکو((زيدٌ حسَنٌ وجْهَـهُ))،وە عەمەل ناکات لەو ناوەی کە پەیوەندی پێوە نیە،کەوابوو ناڵێی((زيدٌ حسنٌ عمراً))،بەڵام اسمی فاعل عەمەل دەکات لەوناوەی پەیوەندی پێوەیە،وە ئەوەی پەیوەندی پێوە نیە،وەکو((زيدٌ ضاربٌ غلامَه،و ضاربٌ عمراً)).

* * *

---

[1] واتا:پشت بەستن بە پێش خۆی،وئەوەی کە لە دێڕی(٤٢٩)ئەلفیە باسکرا.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: پێشکەوتنی ئەوەی کە صفەی مشبهە عەمەلی تێدەکات–واتا:معمولەکەی– بەهیچ شێوەیەك دروست نیە پێش صفەی مشبهەکە–عاملەکە–بکەوێت، هەروەها صفەی مشبهە تەنها عەمەل لەو شتە دەکات کە پەیوەندی– لەڕووی ماناوە–پێوەیە،وە لەناوی بێگانە(اجنبی)–واتا:ئەو ناوەی پەیوەندی بەوەوە نیە لەڕووی ماناوە–عەمەل ناکات.

***جۆرو حاڵەتەکانی صفەی مشبهە ومعمولەکەی:**

٤٧١– فَارْفَعْ بِهَا وَانْصِبْ وَجُرَّ مَعَ أَلْ وَدُونَ أَلْ مَصْحُوبَ أَلْ وَمَا اتَّصَلْ

٤٧٢–بِهَا مُضَافـــاً، أَوْ مُجَرَّداً، وَلاَ تَجْرُرْ بِهَا مَعْ أَلْ سُماً مِنْ أَلْ خَلاَ

٤٧٣–وَمِـنْ إِضَافَةٍ لِتَالِيهَا ،وَمَـــــا لَـمْ يَخْـــلُ فَـهْوَ بِالْجَوَازِ وُسِمَا[1]

صفەی مشبهە یان ئەلیف ولامی پێوەیە،وەکو(الحسن)،یان پێوەی نیە وەکو(حسنٌ)،وە لە هەردوو حاڵەتەکەدا معمولەکەی بەدەر نیە لە شەش جۆر:

یەکەم:معمولەکە ئەلیف ولامی پێوەیە،وەکو((الحسنُ الوجه،وحسن الوجه)).

دووەم:معمولەکە ئەلیف ولامی پێوە نیە،بەلاّم إضافەکراوە بۆلای ناوێ ئەلیف ولامی پێوەیە،وەکو((الحسنُ وجهِ الأبِ،وحسنُ وجْهِ الأبِ)).

سێیەم:إضافەکرابێ بۆلای جێناوی وەصفکراوەکە،وەکو((مررتُ بالرجل الحسنِ وجهُهُ،وبرجلٍ حسنٍ وجْهُهُ)).

چوارەم:إضافەکرابێ بۆلای ناوێکی مضاف بۆلای جێناوی وەصفکراو،وەکو((مررتُ بالرجل الحسنِ وجهُ غلامهِ ،وبرجلٍ حسنٍ وجْهُ غلامهِ)).

پێنجەم:خالی بێ لە ئەلیف ولام،بەلاّم خالی نەبێ لە إضافە،وەکو((الحسنُ وجهُ أبٍ،وحسنُ وجْهُ أبٍ)).

شەشەم:خالی بێ لە ئەلیف ولام ولە إضافە،وەکو((الحسنُ وجهاً،وحسنُ وجهاً)).

---

[1] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە: مرفوع بکە بە صفەی مشبهە،ومنصوب بکە،ومجروریش بکە بەمەرجێ ناوەکەی پاشی ئەلیف ولامی پێوە بێ،-واتا:صفەی مشبهە عەمەل دەکات-،لە کاتێکدا ئەلیف ولامی پێوە بێ،یان خالی لە ئەلیف ولام بەلاّم إضافە کرابێ، وە ئەگەر صفە مشبهەکە ئەلیف ولامی پێوە بوو ناوەکەی پاشی مجرور ناکات مەگەر ئەو ناوەش ئەلیف ولامی پێوە بێ یان إضافەکرابێ بۆلای ناوێ ئەلیف ولامی پێوە بێ ئەوە ئەتوانی ناوەکەی پاشی مرفوع یان منصوب یان مجرور بکەی.

کەواتا ئەمە دوانزە جۆرە،وە معمولەکەش لە هەر جۆرێکیان:یان مرفوعە،یان منصوبە،یان مجرورە. کەواتە دەکاتە سی وشەش جۆر وشێوە[1]

بۆ ئەمەش ئامارژەی کرد دانەر بەووتەی((فَارْفَعْ بِهَا))واتا:مرفوع بکە بە صفەی مشبهە،((وانصب،وجُرّ مع أل))واتا:ئەگەر صفەکە ئەلیف ولامی پێوە بوو وەکو(الحسن)، و((وَدُونَ أَلْ))واتا:کاتێ صفەمشبهەکە خالی بێ لە ال،وەکو(حسنٌ)،وە((مصحوب أل))واتا:معمولەکە ئەلیف ولامی پێوە بێ،وەکو(الوجە)،و((ما اتّصل بها:مضافاً،أو مجرداً))واتا:ئەو معمولەی لکاوە بە صفەی مشبهەوە،ئەگەر مضاف بێ،یان خالی بێ لە ال وإضافە،جا ووتەی((مضافاً))لەخۆ دەگرێ ئەو معمولەی إضافەکراوە بۆلای ناوێ کە ال ی پێوەیە،وەکو((وجهُ الأبِ)) وە ئەو معمولەی إضافە کراوە بۆلای جێناوی وەصفکراوەکە،وەکو((وجهُهُ))،وە ئەوەی إضافە کراوە بۆلای ناوێ کە إضافەکراوە بۆلای جێناوی وەصفکراوەکە،وەکو((وجە غلامِهِ)) وەئەوەی إضافەکراوە بۆلای ناوێکی خالی لە ال وخالی نەبوو لە إضافە وەکو((وجهُ أبٍ)).

هەروەها ئامارژەی کرد دانەر بەووتەی:(( وَلاَتَجْرُرْ بِهَا مَعْ أَلْ-تا کۆتای))بۆ ئەوەی ئەم جۆروحاڵەتانە[2] هەموویان دروست نین،بەڵکو نادروستە-کاتێ کە صفەمشبهەکە ال ی پێوە بێ-چوار حاڵەتیان:

یەکەم:مجرور کردنی ئەو معمولەی إضافەکراوە بۆلای جێناوی وەصفکراوە،وەکو((الحسنُ وجهِهِ)).

دووەم:مجرورکردنی ئەو معمولەی إضافە کراوە بۆلای ناوێ کە إضافەکراوە بۆلای جێناوی وەصفکراوەکە،وەکو((الحسنُ وجهِ غلامِهِ)).

---

[1] ١٢کەرەتی ٣-٣٦.

[2] واتا:١٢ جۆرەکەی پێشتر باسکرا.

سێیەم: مجرورکردنی ئەو معمولەی إضافە کراوە بۆلای ناوێکی خالی لە ال وخالی نەبوو لە إضافە وەکو((الحسنُ وجهُ أبٍ)).

چوارەم: مجرورکردنی ئەو معمولەی خالیە لە ال و إضافە،وەکو((الحسنُ وجهٍ)).

کەواتا مانای ووتەی دانەر((وَلَاتَجْرُرْ بِهَا))واتا مجرورمەکە بە صفە مشبهە،کاتێ کە ال ی پێوە بوو،ناوێ کە خالیە لە ال وخالیە لە إضافە،وەکو ئەو چوار حاڵەتەی باسکرا.

وە ئەوەی خالی نیە لەمە دروستە مجروری کەی،هەروەکو دروستە مرفوع ومنصوبی کەی،وەکو الحسنُ الوجهِ،والحسنُ وجهِ الأبِ، هەروەها دروستە مجرورکردنی معمولەکە ومنصوب کردن ومرفوع کردنی کاتێ کە صفەمشبهەکە ال ی پێوە نەبێ بەهەموو شێوەیەك.

## التعجب[١]

٤٧٤-بِأَفْعَلَ انْطِقْ بَعْدَ مَا تَعَجُّبَا أَوْ جِئْ بِأَفْعِلْ قَبْلَ مَجْرُورٍ بِبَا

٤٧٥-وَتِلْوَ أَفْعَلَ انْصِبَنَّهُ كَـ (مَا أَوْفَى خَلِيلَيْنَا وَأَصْدِقْ بِـهِمَا)[٢].

تعجب كردن دوو صیغەی هەیە:یەکێکیان((ما افعَلَهُ))،ودووەمیان:((افعِلْ بـهِ))،وە بـۆ هـەردووکیان ئاماژەی کـرد دانـەر بـە دێـڕی یەکەمی[٣]،واتا:بێنەوبڵێ لە پاش((ما))ی تعجب (افْعَلَ)وەکو:((ما احسنَ زیداً،وما اوفی خلیلَیْنا))،یان صیغەی((افْعِلْ))لە پێش حەرفی جەڕی(ب)،وەکو:((احسِنْ بالزیدَیْنِ،واصدِقْ بهما)). جا[٤] ما:دەبێتە مبتدا ،ونکرەی تەواوە لای پێشەوا سیبویە،و((أحسن))فعلی ماضیە،وفاعلەکەی

---

[١] تعجب:یەکێکە لە شێوازەکانی قسەکردن ولە کوردیدا ووشەی سەرسوڕمانی بۆ بەکاردێ،وزۆرجار مرۆڤ لەبینینی شتێك یان دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێ،بۆیە لە پێناسەی التعجب دا ووتراوە:(هو استعظامُ فعلِ فاعلٍ ظاهر المزیة)واتا: بەگەورە زانینی کارێکە کە تایبەتە وجیاوازە لە عادەتی. وە لەزمانی عەرەبیدا تعجب دوو جۆرە:یەکەمیان:قیاسی(یاسادار)کە دوو صیغەی هەیە ولەشەرحەکەدا باس دەکرێ. دووەم:سماعی(بیستراو وبێ یاسا):ئەمانە چەند ووشە ودەستەواژەیەکن عەرەب بەکاریان هێناوە بۆ تعجب کردن وسەرسامی دەربڕین لە هەندێ کات وحاڵەتی تایبەتدا،وەکو{سبحان الله، لله درّهُ فارساً،کیف تکفرون بالله...، یالك من لیلٍ!}.

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٧٤-صیغەی افعل لە پاش ما-واتا:ما افعل-بەکاربێنە بۆ تعجب کردن،یان افعِلْ بەکاربێنە لە پاش حەرفی جەڕی(بـ)- واتا:افعِلْ بە-. ٤٧٥-وە ئەوناوەی دەکەوێتە پاش(ما)ی تعجبی منصوب بکە،وەکو نموونەی((مَا أَوْفَى خَلِيلَيْنَا وَأَصْدِقْ بِهِمَا))واتا:دوو دۆستەکەی ئێمە زۆر بە وەفان وزۆریش ڕاستگۆن. ئەم نموونەیە هەردوو صیغەکەی تعجبی لەخۆگرتووە.

[٣] واتا:دێڕی ژمارە ٤٧٤ی ئەلفیە.

[٤] لێرەوە ابن عقیل إعرابی صیغەکانی تعجب دەکات.

جێنـاوێکی نادیـارە ودەگەڕێتـەوە بـۆ(مـا)،و((زیـداً))مفعـول بـە بۆفعلی(احسن)،وڕستەکەش[1]دەبێتە خبری(ما)،وتقدیری ڕستەکە((شيءٌ أحسنَ زیداً))واتا:شتێك زیدی جوان کردووە،هەروەها ڕستەی((ما أوفی خلیلَیْنا)).

وە أفْعِلْ:فعلی أمرە وماناکەی بۆ تعجبە وبۆ أمر نیە،وفاعلەکەی مجرورە[2] بە حەرفی جەڕی(بـ)،وحەرفی(بـ)زائدەیە.

وە بەڵگە هێنراوەتـەوە بـۆ فعـل بـوونی أفْعَـلَ[3]بـەوەی کـە نـونی وقایـە وەردەگرێ کاتێ یای متکلمی پێوە بلکێ،وەکو:((ما أفْقَرَني إلى عفوِ اللهِ))،وە بەڵگەش بۆ فعل بوونی أفعِلْ هێنراوەتـەوە بـەوەی نـونی توکید دەچێتە سەری،لە ووتەی:

٢٦٨-ومُسْتَبْدِلٍ مِنْ بَعْدِ غَضْبَى صُرَيْمَةً فَأَحْرِ بِـهِ مِنْ طُولِ فَقْرٍ وأَحْرِيَا[4].

مەبەستی(وأحريَنْ)بە نونی توکیدی خفیفە،کە لەوەستاندا دەبێتە ئەلیف.

هـەروەها ئامـاژەی کـرد دانـەر بەووتـەی:((وتِلـوَ أفْعَـلَ)) بـۆ ئـەوەی کـە ئـەو نـاوەی لەپاش((أفْعَلَ))وە دێ منصوبە چونکە دەبێتە مفعول بە،وەکو((ما أوفى خليلَيْنا)).

پاشـان نموونـەی هێنایـەوە دانـەر بەووتـەی((وأصـدق بهمـا))بـۆ صـیغەی دووەمی تعجب.

---

[1] واتا:ڕستەی((احسن زیداً)).

[2] واتا:مجرورە لفظاً ومرفوعە محلاً.

[3] ڕاجیای وخلاف هەیە لە نێوان زانایانی نحو دەربارەی ئەوەی کە(أفعل)تعجب بە هەردوو صیغەکەوەی اسمە یان فعلە.زۆربەیان پێیان وایە کە فعلە.

[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:زۆرجار ئەو کەسەی دەگۆڕێتەوە مێگەلی ١٠٠حوشتری بە مێگەلی ٢٠یان ٣٠حوشتری،شایانی ئەوەیە تووشی هەژاری ونەداری زۆربێ. بەڵگەکەی:(( وأحرياً))لێرەدا نونی توکید خفیفە -کە بەشێوەی تنوین نوسراوە-چۆتە سەر فعلی تعجب،دیارە نونی توکید تایبەتە بە فعل.

وه ئەوەی باسمان كرد كە((ما))[1] نكرەی تەواوە بۆچوونی ڕاستە،وجملەكەی پاشی دەبێتە خبر بۆی،وتقديرەكەی:((شيءٌ احسنَ زيداً))واتا:جوانی كردووە، بەڵام پێشەوا ئەخفەش پێی وايە كە((ما))موصولەيە وجملەكەی پاشی صلەيەتی، وخبرەكەی محذوفە، وتقديرەكەی:((الّذي احسنَ زيداً شيٌ عظيمٌ))، وهەندێك پێيان وايە كە((ما))استفهاميە،وجملەكەی پاشی خبرە بۆی، وتقديرەكەی:((ايُّ شيءٍ احسَنَ زيداً؟))،وهەندێك پێيان وايە كە((ما))نكرەی وەصفكراوە، وجملەكەی پاشی صفەيە بۆی،وخبرەكەی محذوفە،وتقديرەكەی: ((شيءٌ احسنَ زيداً عظيمٌ))[2]

* * *

٤٧٦–وَحَذْفَ مَا مِنْهُ تَعَجَّبْتَ اسْتَبِحْ     إِنْ كَانَ عِنْدَ الْحَذْفِ مَعْنَاهُ يَضِحْ[3]

دروستە حذف كردنی ئەو شتەی تعجبی لیٚ دەكریٚ،كە بريتيە لە ناوە منصوبەكەی دوای(أفْعَلَ)،وە ناوە مجرورەكەی پاش حەرفی بێی افعِلْ،ئەگەر بەڵگە هەبیٚ لەسەر حذف كردنەكە،جا نموونەی يەكەم[4] ووتەی:

٢٦٩–أَرَى أُمَّ عَمْرٍو دَمْعُهَا قَدْ تَحَدَّرَا     بُكَاءً على عَمْرٍو وما كَانَ أَصْبَرَا[5]

تقديرەكەی((وما كَانَ أَصْبَرَها))جێناوەكەی حذف كردووە كە مفعولە بۆ فعلی اصبر،لەبەر ئەوەی بەڵگە هەيە لەسەری كە پێشتر باسی كردووە،نموونەی

---

[1] واتا:((ما))ی صيغەی(ما افعل).

[2] كەواتا:چوار بۆچوونی سەرەكی هەيە دەربارەی إعرابی ((ما))ی صيغەی(ما افعل):بزانە.

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:حذف كردنی ئەو شتەی تعجبی لێدەكەی دروستە،ئەگەر ماناكەی ڕوون وئاشكرا بیٚ ولیٚ تێكچوون ڕوو نەدا.

[4] واتا:نموونەی حذف كردنی ئەو شتەی تعجبی لێكراوە لە پاش صيغەی(ما افعل).

[5] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:من دايكی عەمر وا دەناسم كە كەسێكی بەصبر ونەفەس درێژە،كەچی ئێستا زۆر دەگری وفرمێسك دەڕژیٚ بۆ عەمر. بەڵگەكەی:(( وما كَانَ أَصْبَرَا)) لێرەدا ئەو تعجب لێكراو كە بريتيە لە جێناوی مفعول بە بۆ فعلی(اصبر).

دووەم[1] فەرموودەی خوای گەورە﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ﴾[2] تقدیرەکەی –والله اعلمُ– وابصر بهم،(بهم)حذف کراوە لەبەر ئەوەی بەڵگە هەیە کە پێشتر باسکراوە ودووبارەکراوەتەوە، وە وەکو ووتەی شاعر:

٢٧٠– فَذَلِكَ إنْ يَلْقَ الْمَنِيَّةَ يَلْقَهَا    حَمِيداً وإنْ يَسْتَغْنِ يَوْماً فَأَجْدِرِ[3]. واتا:فأجدر بە لێرەدا تعجب لێکراو حذف کراوە لە پاش صیغەی((أفْعِلْ)) هەرچەندە عطف نەکراوەتەوە بۆ سەر صیغەیەکی هاوشێوەی خۆی،ئەمەش شاذە.

*    *    *

٤٧٧– وَفِى كِلاَ الفِعْلَيْنِ قِدْماً لَزِمَا    مَنْــعُ تَصَرُّفٍ بِحُكْمٍ حُتِمَا[4].

هەردوو فعلەکەی تعجب نەگۆڕن ودەست کاری ناکرێن،وبەڵکو بە یەك شێوە بەکاردێن صیغەی(أفْعَلَ)تەنها بە ماضیی بەکار دێ،وە صیغەی (أفْعِل)تەنها بە شێوەی امر بەکاردێ،دانەر فەرموویەتی:ئەمەش خیلافی تیا نیە.

---

[1] واتا:نموونەی حذف کردنی ئەو شتەی تعجبی لێکراوە لە پاش صیغەی افعلْ بهِ.

[2] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٣٨)ـی سورەتی(مریم)،کورتەی ماناکەی:ئای چەندە بیسەرو بینەرن–بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا–. إعرابەکەی: أسمعْ: فعل ماضي جامد جاء على صيغة الأمر.بهمْ:بـ:حرف جر زائد، هم:ضمير متصل بارز، مبني على السكون في محل رفع فاعل. وأبْصِرْ:مثل أسمع، وفاعله محذوف دلّ عليه ما قبله،أي وأبصر بهم. الشاهد فيها:((وابصرْ))حيث حذف المجرور بالباء بعد فعل التعجب(ابصرْ)،لأنه دلّ عليه الدليل.

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:–ئەو کەسە هەژارە–ئەگەر مردن پێی بگا وبمرێ بە چاکی دەمرێ،وە ئەگەر ڕۆژێ دەوڵەمەند بێ ئەوە شایستەی دەوڵەندیە. بەڵگەکەی: ((فاجدر))لێرەدا تعجب لێکراو کە فاعلی صیغەی(افعل بە)حزف کراوە لەبەر ئەوەی پێشتر باسکراوە.

[4] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەر دوو فعلی تعجب(ما افعل)و(افعل بە) نەگۆڕ(جامد)ن،و هەمیشە بەو جۆرە بەکار دێن وصیغە وشێوەی تریان نیە.

***چۆنێتی دروست كردن وداڕشتنی فعلی تعجب ومەرجەكانی:**

٤٧٨- وَصُغْهُمَا مِنْ ذِی ثَلاَثٍ صُرِّفَا    قَابِلِ فَضْلٍ، تَمَّ،غَیْرِ ذِی انْتِفَا

٤٧٩-وَغَیْرِ ذِی وَصْفٍ یُضَاهِی أَشْهَلاَ    وَغَیْرِ سَالِكٍ سَبِیلَ فُعِلاَ[١].

مەرجە بۆ ئەو فعلەی تعجبی لێدەكرێ بەهەردوو صیغەكەی حەوت مەرج:

یەكەم:دەبێ سێ حەرفی(ثلاثی) بێ،كەوابوو دروست ناكرێ لە فعلی زیاتر لە سێ حەرفی،وەكو:دحرج وانطلقَ واستخرجَ.

دووەم:دەبێ فعلەكە بگۆڕ(متصرف)بێ،كەواتا دروست ناكرێ لە فعلی نەگۆڕ،وەكو: نِعمَ،وبئسَ،وعسی،ولیس.

سێیەم:دەبێ ماناكەی كەم وزۆر هەڵگرێ،كەواتا دروست ناكرێ لە فعلی((ماتَ))و((فنِيَ))وهاوشێوەكانی.

چوارەم:دەبێ فعلە تەواو(تامّ)بێ،بەمەش خۆپارێزا لە فعلە ناتەواوەكان (الأفعال الناقصة)،وەكو:كان وهاوشێوەكانی،كەوابوو ناوترێ((ما أكونَ زیداً قائماً))،بەڵام كوفێكان بە دروستیان داناوە.

پێنجەم:نابێ نەفی كراو بێ،بە مەش خۆپارێزا لە فعلی نەفی كراوی پەیوەست(لزوم)[٢]،وەكو((ما عاجَ فلانٌ بالدواء))واتا:سوودی لێوەرنەگرت، یان فعلی نەفی كراوی دروست(جائز)،وەكو:((ما ضربتُ زیداً)).

شەشەم:نابێ وەصفەكەی لەسەر وزنی((أفعل فعلاء))بێ،كەوابوو خۆپارێزا لەو فعلانەی بۆ ڕەنگن،وەكو:سوِدَ وەصفەكەی دەبێتە أسود،و حمرَ دەبێتە احمر، هەروەها ئەو فعلانەی بۆ عەیب وكەم وكورتین وەكو حوِلَ[٣]

---

[١] كورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:فعلی تعجب بە هەردوو صیغەكەیەوە دروست بكە لەو فعلەی ئەم حەوت مەرجەی تێدایە:ثلاثي بێ،بگۆڕ(متصرف)بێ،كەم وزیادهەڵگرێ،تەواو(تام)بێ وناقص نەبێ،جێگیر(مثبت)بێ ومنفی نەبێ، صفەتی فعلەكەی لەوانە نەبێ لەسەر وزنی(أفعل فعلاء)ـن،وە بكەر دیار بێ وبكەر نادیار نەبێ.

[٢] مەبەست ئەو فعلانەیە كە تەنها بە نەفییەوە بەكارهاتوون ،وبە مثبتی بەكارنایەن.

[٣]حولَ: فێلێ وتەڵەكە.

وەصــفەکەی دەبێتــە احــول،وعــور[1] دەبێتــە اعور،کــەوابوو نــاڵێی:((مــا اسودەُ))،یان((ما احمرەُ))،وە ناڵێی:
((ما أحولەُ))یان((ما اعورەُ))،وە ناڵێی((اعور بە))یان((احول بە)).
حەوتــەم:نــابێ فعلەکــە بکــەر نادیــار(مــبنی للمجهــول)بێ،وەکــو:((ضُــرِبَ زیدٌ))،کەوابوو ناڵێی:((ما اضربَ زیداً))مەبەست تعجب کردن بێ لـە لێدانێ کە لەزید دراوە،بۆ ئەوەی لێمان تێك نەچێ لە لێدانێ زید کردوویەتی.

*　　*　　*

***تعجب کردن لەو فعلانەی کە مەرجەکانی تێدا نەبێ:**

٤٨٠-وَأَشْدِدَ أَوْ أَشَدَّ أَوْ شِبْهُهُمَا　　يَخْلُفُ مَا بَعْضَ الشُّرُوطِ عَدِمَا

٤٨١-وَمَصْدَرُ العَادِمِ بَعْدُ يَنْتَصِبْ　　وَبَعْدَ أَفْعِلْ جَرُّهُ بِالْبَــا يَجِبْ[2].

واتا:تعجب دەکرێ لەو فعلانەی کە مەرجەکانی تێدا نیە[3] بەهۆی هێنانی فعلی اشدِدْ وهاو وێنەی[4]،یان اشدّ وهاو وێنەکانی،وپاشان مصدری ئەو فعلەی مەرجەکەی تێدا نیە بە منصوبی لە پاش((أفعلَ))دادەنرێ ودەبێتە مفعول بە،ومجرور دەکرێ لە پاش((أفعِلْ))بە حەرفی جەڕی بــ،کەوابوو دەڵێی:((ما اشدّ دحرجتَهُ،واستخْراجَهُ))و((اشدِدْ بدحرجتِهِ،واستخراجِهِ)) وە((ما اقبحَ عورَهُ،واقبِحْ بعورِهِ،وما اشدَّ حمرتَهُ،واشدِدْ بحمرتِهِ)).

---

[1] واتا:یەك چاو.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٤٨٠-هەردوو فعلی یاریدەدەر(مساعد)ی (اشدد و اشدّ) یان هەر فعلێکی هاوشێوەیان-واتا:هەر فعلێکی مساعد کە بگونجێ وماناکە تەواو بکات- بەکار بێنە بۆ ئەو فعلەی کە یەکێك لە حەوت مەرجەی پێشووی تێدا نەبێ.٤٨١-وە پاشان مصدری فعلەکە منصوب بکە لە پاش فعلە مساعدە لە صیغەی(ما افعل)،ومجروری بکە لە پاش صیغەی(افعل بە).

[3] واتا:حەوت مەرجەکەی پێشتر باسکرا.

[4] وەکو فعلی:اکثر،یان اجملَ،یان اقبحَ،یان هەر فعلێك کە مانای گشتی هەبێ وبگونجێ لەگەڵ فعلەکە.

٤٨٢–وبِالنُّدُورِ احْكُمْ لِغَيْرِ مَا ذُكِرْ وَلاَ تَقِسْ عَلَى الَّذِى مِنْهُ أُثِـرْ[1]

واتا:ئەگەر هات فعلێكى تعجب لەو فعلانەى باسكران كە ڕاستەوخۆ تعجبى لێناكرێتەوە حوكمى نادربوون وشاذى بەسەردا دەدرێ،وقياسى ناكرێتە سەر ئەوەى بيستراوە،وەكو ووتەيان((ما اخصرهُ))[2] تعجب كردنە لە فعلى((اختُصِرَ))كە فعلێكى زياتر لە سىٚ حەرفيە وبكەر ناديارە، وە وەكو ووتەيان((ما أحْمَقَهُ))تعجبيان كردووە لە فعلىٚ كە وەصفەكەى لەسەر وزنى((افعلَ فعلاءَ))يە،حمقَ واحمقَ، وە وەكو ووتەيان((ما اعساهُ،واعسِ بهِ))تعجبيان كردووە لە فعلى((عسى))كە فعلێكى نەگۆڕە.

* * *

٤٨٣–وَفِعْلُ هَذَا البَابِ لَـنْ يُقَدَّمَا مَعْمُولُـــهُ وَوَصْلَهُ بِـــمَا الْــزَمَا

٤٨٤–وَفَصْلُهُ بظَرْفٍ أَوْ بِحَرْفِ جَرْ مُسْتَعْمَلٌ وَالْخُلْفُ فى ذَاكَ اسْتَقَرْ[3].

دروست نيە پێشكەوتنى معمولى فعلى تعجب بەسەر فعلەكەيدا،نالێى: ((زيداً ما أحسن))وە نالێى:((ما زيداً احسن))،وەنالێى((بزيدٍ احسن))،وە پێويستە معمولەكەى لەگەڵ عاملەكەيدا بىٚ وبەين نەخرێن بە ووشەيەكى بێگانە،كەوابوو لە ڕستەى((ما أحسنَ مُعطيَك الدرهمَ))دروست نيە بلٚێى:(( ما

---

[1] كورتەى ماناى ئەم دێڕەى ئەم ئەلفيە:بە كەمى هاتووە فعلى تعجب پێچەوانەى ئەوەى باسكرا،وە ئەگەر شتێكى واهات ئەوە پێچەوانەى ياسايە قياسى نيە.

[2] واتا:چەندە كورت وپوختە!

[3] پوختەى ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفيە:٤٨٣–فعلى ئەم بابەتە–واتا:هەردوو فعلى تعجب–دروست نيە معمولەكەى پێشى كەوىٚ،وە پێويستە صيغەى(ما افعل)بلكێت بە(ما)ى تعجبيەوە وبەينيان نەكرىٚ.٤٨٤–وە كەم جار هاتووە بەين كردنيان بە ظرف و جارومجرور،وە خيلافيشى تێدايە.

أحسنَ الدرهمَ مُعطيَك[١]))،جیاوازی نیه لەمەدا[٢] لە نێوان مجرور وغەیری مجرور،کەواتا ئاڵێی:((ما احسنَ بزیدٍ ماراً))مەبەستت((ما أحسنَ ماراً بزیدٍ))،وەئاڵێی((ما احسنَ عندك جالساً))مەبەستت((ما احسنَ جالساً عندك))،جا ئەگەر معمولی فعلە تعجبەکە ظرف یان جارومجرور بوو ئەوە لەبەین کردنی فعلەکە ومعمولەکەی ڕاجیای(خلاف)هەیە،وڕای باو ئەوەیە کە دروستە،پێچەوانەی بۆچوونی ئەخفەش ومُبرّد وئەوانەی بۆچوونی ئەوانیان هەیە،وە پێشەوا صیمری ووتوویەتی کە پێشەوا سیبویە بەدروستی نازانێ،وە نموونەی ئەوەی هاتووە لە قسەی عەرەب بۆ بەین خستن ووتەی عەمری کوڕی معدیکربە:(( للهِ دَرُّ بني سُلَيْمٍ ما أَحْسَنَ فِي الْهَيْجَاءِ لِقَاءَهـا , وأَكْرَمَ فِي اللَّزَبَاتِ عَطَاءَهـا , وأَثْبَتَ فِي الْمَكْرُمَـاتِ بَقَاءَهـا))[٣]،وە وەکو ووتەی پێشەوا عەلی ﷺ کاتێ تێپەڕی بەلای عەمماردا وتەپ وتۆزی لەسەر ڕووی لادا وفەرمووی:(( أَعْزِزْ عَلَيَّ أباالْيَقْظَانِ أنْ أَرَاكَ صَرِيعاً مُجَدَّلاً))[٤]،هەروەها ئەوەی هاتووە لە هۆنراوە ووتەی هەندێ لە هاوەڵانە-رضي الله عنهم-:

٢٧١- وَقَالَ نَبِيُّ الْمُسْلِمِينَ تَقَدَّمُوا     وأَحْبِبْ إِلَيْنَا أنْ تَكُونَ الْمُقَدَّمَا[٥].

---

[١] لەم ڕستەیەدا((معطیكَ))مفعولی-واتا:معمولی-احسن یە واسمی فاعلە وفاعلێکی مستتری هەیە و(الدرهم) دەبێتە مفعول-معمول-بۆ معطیك،کەوابوو(الدرهم) پەیوەندی بە (ما احسن) وە نیە وبێگانەیەتی.

[٢] واتا:لە بەین خستن لە فعلی تعجب ومعمولەکەی.

[٣] مانای ئەم ووتەی کاکە عەمر:ماشا الله لە خێروبێری زۆری ئەوەی سولەیم ،لەکاتی جەنگدا زۆر پیاووچاکن،وە لەتەنگانەدا زۆر بەخشندەن،وە پیاوەتی وچاکەیان جێگیر وهەمیشەییە.

[٤] واتا: ئای چەند قورس وناڕەحەتە کە دەتبینم مردووی وبەهێزبووی!.

[٥] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:پێغەمبەری مسوڵمانانﷺفەرمووی:وەرنە پێش-بۆ وەرگرتنی ماڵ وسامان وزەکات-ئێمەش زۆرمان پێ خۆشە لە پێش بین. بەڵگەکەی:(( وأحْبِبْ إِلَيْنَا أنْ تَكُونَ))لێرەدا بەین خراوەتە نێوان فعلی تعجب(احبب)و معمولەکەی(لن تكون)،بۆیە دروستە لەبەر ئەوەیە بەینەکە جارومجرورە(إلينا).

**وە وەکو ووتەی:**

**٢٧٢- خَلِيلَيَّ مَاأَحْرَى بِذِي اللُّبِّ أَنْ يُرَى صَبُوراً ولَكِنْ لا سَبِيلَ إلى الصَّبْرِ**[1]

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:ئەی دوو دۆستەکەم چەند گرنگە خاوەن عەقڵ هەمیشە خۆڕاگربێ،بەلاَم ڕێگەی صەبر وخۆڕگری ئاسان نیە!. بەڵگەکەی:(( مَاأَحْرَى بِذِي اللُّبِّ أَنْ يُرَى)) بەین خراوەتە نێوان فعلی تعجب(أحرى)و معمولەکەی(أن يُرى)،بۆیە دروستە لەبەر ئەوەی بەینەکە جارومجرورە(بِذِي اللُّبِّ).

# نعْمَ وبِئْس ، وما جَرَى مَجْرَاهُمَا[١]

## باسى نعم وبئس وهاوشێوەكانيان

٤٨٥- فِعْـلاَنِ غَيْـرُ مُتَصَرِّفَيْنِ نِعْـمَ وَبِئْسَ رَافِعَـانِ اسْمَـيْنِ

٤٨٦-مُقَارِنَيْ أَلْ أَوْ مُضَافَيْنِ لِمَا قَارَنَهَا كَـ (نِعْمَ عُقْبَى الكُرَمَا)

٤٨٧-وَيَرْفَعَانِ مُضْمَراً يُفَسِّـرُهْ مُمَيِّزٌ كَـ (نِعْـمَ قَوْماً مَعْشَرُهْ)[٢].

بۆچوونى زۆرينەى زانايانى ڕێزمانى عەرەبى ئەوەيە كە هەريەك لە((نعم،وبئس))فعلن،بە بەڵگەى ئەوەى تاى تأنيثى ساكنە دەچێتە سەريان،وەكو((نِعْمَتِ المرأةُ هندٌ , وبئستِ المرأةُ دعدٌ[٣])).بەڵام كۆمەڵێ لە زانا كوفييەكان-لەوانيش پێشەوا فەڕا-پێيان وايە كە(نعم وبئس)ناون وفعل نين،بەڵگەيان هێناوەتەوە بەوەى كە حەرفى جەڕ چۆتە سەريان لەقسەى هەندێ لە عەرەب((نِعْمَ السَّيْرُ على بِئْسَ العَيْرُ))[٤]وە ووتەى يەكێكى تريان((واللهِ ما هي بِنِعْمَ الولدُ ،نصرُها بكاءٌ،وبرُّها سرقةٌ))[٥]،وەلآمى

---

[١] ئەم بابەتە پێى دەوترێ((المدح والذم))واتا:باس كردن بە باشە،يان بە خراپە،جا بۆ مدح كردن ئەم سێ فعلە بەكاردێ((نِعْمَ،حبَّ،حبَّذا))،وە بۆ ذم كردنيش ئەم سێ فعلە بەكاردێ((بئس ،وساءَ،لاحبّذا)).

[٢] پوختەى ماناى ئەم سێ دێڕەى ئەلفيە:٤٨٥-نعم وبئس دوو فعلى نەگۆڕ(جامد)ن،وناوێ لە پاشيان مرفوع دەكەن ودەبێتە فاعليان.٤٨٦-فاعلى نعم وبئس سێ جۆرە-يان ال ى پێوەيە،وە يان إضافە كراون بۆلاى ناوێ كە ال ى پێوەيە،وەكو(نعم عقبى الكرما)واتا:بەهەشت باشترين پاشەڕۆژى چاكەكارانە.٤٨٧-وە يان فاعلەكەيان جێناوێكى ناديارەو بەهۆى تمييزەوە لە ڕستەكەدا ڕوون دەبێتەوە،وەكو(نعم قوماً معشرُه)واتا:عەشيرەتى ئەو باشترين قەومن.

[٣] واتا:باشترين ئافرەت هندە،وە خراپترين ئافرەتيش دعدە-دعد ناوى ئافرەتە-.

[٤] واتا:باشترين ڕێكردنە-كە دەچێ بۆ لاى خۆشەويستەكەى-لەسەر خراپترين سوارى.

[٥] ئەمەش ووتەى يەكێكە لە كەسانى سەردەمى نەزانى كە ڕقيان لە مێينە بووە،لەكاتێكدا ووتوويەتى كە پێى ووتراوە كچت بووە،واتا:سوێند بەخوا كچ باش

زانایـان بـۆ ئـەم دوو وتەیـە ئەوەیـە کـە(نعـم وبـئس)مفعـولن بـۆ قـەولێکی حذفکراو کە ئەو قەولە صفەتە بۆ وەصفکراو(موصـوف)ـێکی حـذفکـراو کە ئـەو مجـرورە بـە حـەرفـە جەڕەکە،نـەوەك((نعـم وبـئس))،وتقدیرەکـەش: نِعْـمَ الـسَّیْرُ علـی عـیرٍ مقـولٍ فیـهِ بِئْسَ العَیْـرُ، ومـا هـي بِولـدٍ مقـولٍ فیـه نعـمَ الولـدُ.موصوفەکەوصفەکە(١) حذفکراون،ومعمولەکـەیان(٢) لـەجێیان دانـراون لە گەڵ مانەوەی هەریەك لە(نعم وبئس)بە فعلی.

جـا ئـەم دوو فعلـە نەگۆڕن،بۆیـە تـەنها بـە شـێوەی ڕابـردوو(ماضـی)بـەکاردێن،وە پێویستە مرفوعێکیان هەبێ کە بکەر(فاعل)ە،فاعلی ئەم دوو فعلە سێ جۆرە:

یەکـەم:ال ی پێوەیـە،وەکو((نِعْمَ الرجلَ زیـدٌ))،وە وەکـو فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿نِعْمَ الْمَوْلَی وَنِعْمَ النَّصِیرُ﴾(٣)،جـا زانایـان ڕایـان جیایـە دەربـارەی ئـەم لامە(٤)،هەندێ ووتوویانە:بۆ ڕەگەز(جنس)ـی ڕاستەقینەیە،کەواتابوو مدحی

---

نیە،سەرخستنی ئەو بۆ من گریانێتی وهیچی تر،چاکەی ئەویش بۆم دزیی کردنییەتی–مەبەستی ئەوەیە گەر بیەوێ چاکە بکات لەگەڵ کەسێکدا دەبێ پارە لەمێردەکەی بدزێ–!.ئەمەبۆچوونی دوور لەخوایانە.

(١) کە بریتین لە((عیرٍ مقولٍ ))و(( وِلدٍ مقولٍ)).

(٢) لەبەر ئەوەی کە(مقول)اسمی مفعولە وعاملە بۆیە معمولی هەیە،کە بریتیە لەڕستەی(بئس العیرُ)،و(نعم الولد).

(٣) بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٤٠)ـی سورەتی(الأنفال)کە دەکاتە ئایەتی کۆتای جوزئی(٩)،پوختەی ماناکەی:–ئەو(خوای گەورە)–باشترین پشتیوانە وباشترین یاریدەدەروسەرخەرتانە. إعرابەکەی:نِعمَ:فعل ماض جامد لإنشاء المدح مبني علی الفتح.المولی:فاعل مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة منع من ظهورها التعذر،والمخصوص بالمدح محذوف تقدیره(الله). ونعم النصیرُ:مثل الجملة التي قبلها. **الشاهد فیها:(المولی والنصیر)فاعلان لفعل المدح حیث دخلت علیهما(ال).**

(٤) واتا:ال ی سەر فاعلی(نعم وبئس)،بۆیە دەڵێ لام چونکە همزەی(ال)هەمزەی وەصلە.

هەموو پیاوان دەكەی[١] لەبەر خاتری زید،وپاشان زیدت تایبەت كردووە بەو مدحە،كەوابوو دوو جار مدحی زیدت كردووە،وە هەندێ ووتوویانە:بۆ ڕەگەزە بە مجازی،وەكو ئەوەی كە زیدت كردبێتە ڕەگەزی هەموو پیاوان بۆ زیادمدح كردن ومبالغه كردن، وە هەندێ ووتوویانە:ئەم لامە بۆ عهدە[٢].

دووەم:فاعلەكە إضافەكراوە بۆلای ناوێ كە(ال)ـی پێوەیە،وەكو ووتەی دانەر((نعم عقبى الكرما))،وە وەكو فەرموودەی خوای گەورە:﴿وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾[٣].

سێیەم:جێناوێكی نادیارە كە ڕاڤە كرابێتەوە بە ناوێكی نەناسراوی منصوبی تمییز،وەكو((نِعْمَ قوماً معْشرُهُ))لێرەدا لە فعلی(نعم)جێناوێكی نادیار هەیە كە ناوی(قوماً)ڕاڤە وڕوونی كردۆتەوە،وە((معشرُه))دەبێتە مبتدا[٤]،وە هەندێ ووتوویانە:كە((معشرُه))مرفوعە بە نعم ودەبێتە فاعل،وجێناوی نیە،وە هەندێ لەم زانایانە فەرموویانە:((قوماً))دەبێتە حال،وە هەندێكیان فەرموویانە:دەبێتە تمییز. وە وەكو((نعم قوماً معشرُه))وایە فەرموودەی خوای گەورە﴿بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾[٥]

---

[١] واتا:لەڕستەی((نعم الرجلُ زيدٌ)).

[٢] مەبەست لە عهد ئەوەیە كە پێشتر باسكراوە ودوو بارەدەكرێتەوە. پێشتر باسمان كرد.

[٣] ڕستەی كۆتاییە لە ئایەتی(٣٠)ـی سورەتی(النحل)،كورتەی ماناكەی:زۆر خۆش وچاكە ماڵ وشوێنی پارێزكاران. إعرابەكەی: و:حسب ما قبله، لـ:لام الابتداء،نعم:فعل ماض جامد لإنشاء المدح.دارُ:فاعل نعم مرفوع. وهو مضاف،المتقين:مضاف إليه مجرور وعلامة جره الياء. والمخصوص بالمدح محذوف تقديره(هي). الشاهد فيها:(دار المتقين)حيث جاء فاعل نعْمَ مضافا إلى ما فيه(ال).

[٤] مبتدای مؤخره وڕستەی(نعم قوما)له محلي رفعدا خبری مقدّمه.

[٥] ڕستەی كۆتاییە لە ئایەتی ژمارە(٥٠)ـی سورەتی(الكهف)،كورتەی ماناكەی:ئای چ گۆڕینەوەیەكی خراپە بۆ ستەمكاران.إعرابەكەی:بئسَ:فعل ماضي جامد لإنشاء الذم مبني على الفتح، وفاعله ضمير مستتر تقديره(هو)يفسره كلمة(بدلاً) وتقدير الجملة

**وه ووتەی شاعر:**

٢٧٣–لَنِعْمَ مَوْئِلاً الْمَوْلَى إذا حُذِرَتْ    بَأْسَاءُ ذِی البَغْیِ واسْتِیلاَءُ ذِی الإِحَنِ[1]

**وه ووتەی:**

٢٧٤–تقولُ عِرْسِی وَهْیَ لی فِی عَوْمَرَهْ    بِئْسَ امْــرَأً وإِنَّنِی بِئْسَ الْمَـرَهْ[2].

* * *

٤٨٨–وَجَمْعُ تَمْیِیزٍ وَفَاعِلٍ ظَهَرْ    فِیهِ خِلاَفٌ عَنْهُمُ قَدِ اشْتَهَر[3].

**زانایان ڕایان جیایه له دروستی کۆکردنەوەو هاتنی تمییزوفاعلی ئاشکرا(الظاهر)له فعلی((نعم))وهاوشێوەکانی،هەندێکیان فەرموویانه: دروست نیه،وئەمەش له پێشەوا سیبویه نەقڵ کراوه،کەوابوو دروست نیه بڵێی:((نعم الرجلُ رجلاً زیدٌ))،وه هەندێکی تر پێیان وایه دروسته، وبەڵگەیان هێناوەتەوه بەووتەی:**

٢٧٥–والتَّغْلِبِیُّونَ بِئْسَ الفَحْلُ فَحْلُهُمُ    فَحْــلاً، وأُمُّـهُمْ زَلاَّءُ مِنْطِیقُ[4]

**وه ووتەی:**

---

**(بئس البدل بدلاً).للظالمین:جارومجرورمتعلقان بـ(بدلا). بدلاً:تمییز منصوب. الشاهد فیها:استتار فاعل بئس.**

**[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕه:بێگومان باشترین پەناگه ئەو دۆستەیه کاتێ ترسی نارەحەتی دەست درێژی کاران وداگیرکاران وکینه لەدڵانت هەیه پەنات دەدا. بەڵگەکەی:((لنعم موئلاً))فاعلی نعم جێناوێکی نادیارەو ناوی((موئلاً))ڕوونی دەکاتەوه.**

**[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:ژنەکەم دەڵێ له کاتێکدا هاوار دەکا بەسەرم دا:تۆ خراپترین پیاوی،ومنیش خراپترین ژنم. بەڵگەکەی:((بئس امرأً))فاعلی بئس جێناوێکی نادیاره.**

**[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیه:ڕاجیای هەیه له کۆکردنەوەی تمییز وفاعلی ئاشکرای نعم وبئس.**

**[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕه:تەغلیبیێکان–که تاقمێکن له عەرەبه گاورەکان–خراپترین نێر نێری ئەوانه–واتا:پیاویان خراپه–،ودایکیشیان–واتا:ئافرەتیان– بێهێزولاوازن لەبەر ئەوەی خەریکی کارەکەرین. بەڵگەکەی:((بئس الفحلُ ..فحلاً))لەم ڕستەیەدا فاعلی ئاشکراو تمییزی کۆکردۆتەوه.**

٢٧٦- تَزَوَّدْ مِثْلَ زَادِ أَبِيكَ فِينَا      فَنِعْمَ الزَّادُ زَادُ أَبِيكَ زَادا[١].

وە هەندێکی تریان تەفصیلیان داوە:ووتوویانە:ئەگەر تمییزەکە مانایەکی زیاتری لە مانای فاعلەك گەیاند ئەوە دروستە کۆکرێنەوە،وەکو:((نعم الرجلُ فارساً زيدٌ))،ئەگەر نا دروست نیە،وەکو:((نعم الرجلُ رجلاً زيدٌ)).

وە ئەگەر فاعلەکە جێناو بوو ئەوە دروستە کۆکردنەوەی لەگەڵ تمییزەکە،بەیەکدەنگی زانایان،وەکو((نعم رجلاً زيدٌ)).

*      *      *

٤٨٩-و((مَا)) مُمَيِّزٌ وقِيلَ فَاعِلُ      فِي نَحْوِ نِعْمَ مَا يَقُولُ الفَاضِلُ[٢].

((ما))دەکەوێتە پاش((نعم،وبئس))ـەوە دەڵێی:((نعم ما))یان((بئس ما))،وەکو فەرمایشتی خوای گەورە﴿إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ﴾[٣]،وە

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:هەوڵدە توێشوو هەڵگرە وەکو توێشووی باوکت-واتا:هەڵسوکەوتت وەکو ئەو وابێ-،بەڕاستی باشترین توێشوو توێشووی باوکت بوو. بەڵگەکەی:((فنعم الزادُ..زادا)) فاعلی ئاشکراو تمییزی کۆکردۆتەوە،ئەمەش لای زۆربەی زانایان دروست نیە.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:((ما))لە محلی نصبدا تمییزە ،وهەندێ ووتوویانە فاعلە،لە وێنەی ڕستەی((نِعْمَ مَا يَقُولُ الفَاضِلُ))واتا:جوانترین شتە ئەوەی کە ئەو بەڕێزە دەیڵێ.

[٣] بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٢٧١)ـی سورەتی(البقرە)،پوختەی ماناکەی:ئەگەر ئاشکرای بکەن خێرەکانتان ئەوە کارێکی باشە. إعرابەکەی:إنْ:حرف شرط جازم. تبدوا:فعل مضارع(فعل الشرط)مجزوم،وعلامة جزمه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة،والواو:ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل،والألف:فارقة.الصدقاتِ:مفعول به منصوب وعلامة نصبه الكسرة لأنه جمع مذكر السالم.فَنِعمّا:فـ:واقعة في جواب الشرط،نِعمَّ:فعل جامد لإنشاءِ المدح مبني على الفتح،وفاعله ضمير مستتر وجوباً تقديره(هو)مفسرٌ بـ(ما)،ما:نكرة تامة بمعنى شيءٌ مبني على السكون في محل نصب

**فەرمووده خوای گەوره:﴿بِئْسَمَا اشْتَرَوْا بِهِ أَنْفُسَهُمْ﴾[(١)]،جا راجیای هەیە لەم((ما))یەدا،هەندێ ووتوویانە:نکره منصوبەیە وتمییزه،وفاعلی((نعم)) جێناوی نادیاره،وه ووتراوه:فاعله،ولەم کاتەدا دەبێتە ناوێکی ناسراو((معرفە))،ئەمەش بۆچوونی ابن خروفە،وئەم بۆچوونەی بۆلای پێشەوا سیبویە پاڵداوه.**

* * *

***باسی تایبەت کراو بە مدح یان بە ذمّ((المخصوص بالمدح أو الذمّ)):**

**٤٩٠-وَيُذْكَرُ الْمَخْصُوصُ بَعْدُ مُبْتَدَا أَوْ خَبَرَ اسْمٍ لَيْسَ يَبْدُو أَبَدَا[(٢)].**

**باس دەکرێ لە پاش((نعم،وبئس))وفاعلەکەیان ناوێکی مرفوع،کە دەبێتە تایبەت کراو(مخصوص)بە مدح کردن یان ذم کردن،نیشانەی ئەم ناوەش ئەوەی کە بگونجێ بکرێتە مبتدا،وفعل وفاعلەکەش بکرێنە خبری،وەکو**

---

على التمييز،والتقدير:نعمَ الشيءُ شيئاً. هي:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدأ مؤخر،وجملة(نعم)وفاعلها في محل رفع خبر مقدم. **الشاهد فيها:((نعمّا))إذْ وقعت ما بعد نعمَ ولفظت نِعمّا.**

(١) **ڕستەی یەکەمە لە ئایەتی ژماره(٩٠)ـ سورەتی(البقرة)،کورتەی ماناکەی:شتێکی زۆر خراپ بوو کە خۆیانیان پێ فرۆشت. إعرابەکەی:**بئسَ:فعل ماض جامد لإنشاء المدح مبني على الفتح. ما:نكرة تامة بمعنى شيء مبني على السكون في محل نصب تمييز،والفاعل ضمير مستتر ،وقيل ما:اسم موصول في محل رفع فاعل.اشتروا:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها من الإعراب صلة الموصول(إذا كان ما موصولة)،أو في محل رفع نعت لمحذوف تقديره شيء(إذا كان ما نكرة تامة). الشاهد فيها:((بئس ما))اتصال ما ببئسَ.

(٢) **کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:باس دەکرێ لەپاش هەریەك لە((نعم))یان ((بئس)) وفاعلەکەیان تایبەتکراو(مخصوص) بە مدح یان بە ذمّ،وه ئەم ناوه مخصوصە دەبێتە مبتدای مؤخر-وجملەفعلییەکەی پێشی دەبێتە خبری مقدّم-،یان دەبێتە خبر بۆ مبتدایەکی محذوف.**

((نِعْمَ الرجلُ زیدٌ، وبئسَ الرجلُ عمروٌ، ونعم غلامُ القومِ زیدٌ، وبئس غلامُ القومِ عمروٌ، ونعم رجلاً زیدٌ، وبئس رجلاً عمروٌ))،دووشێوە إعراب کردنی باو هەیە بۆ ئەم ناوە[(١)]:

یەکێکیان:ئەوەیە کە ئەم ناوە مبتدایە،وجملەکەی پێشی دەبێتە خبری[(٢)].

دووەم:خبرە بۆ مبتدایەکی محذوف بە واجبی،وتقدیرەکەی:((هو زیدٌ، وهو عمروٌ))واتا:مدحکراو زیدە،وذمّکراو عەمرە. وەهەندێ لەزانایان ئەم إعرابی دووەمەیان بە نادروست داناوە ورێیان پێنەداوە،ویەکەمیان بە واجب داناوە.وە ووتراوە[(٣)]:دەبێتە مبتدا وخبرەکەی محذوفە،وتقدیرەکەی:((زیدٌ الممدوحُ)).

* * *

٤٩١-وَإِنْ يُقَـدَّمْ مُشْعِرٌ بِهِ كَفَى كَـ(الْعِلْمُ نِعْمَ الْمُقْتَنَى وَالْمُقْتَفَى)[(٤)].

ئەگــەر پێــشتر شــتێك باســکرا لەســەر مخــصوص بــە مدحکردنەکــە،یان ذمّکردنەکە ئەوە پێویست ناکا جارێکی تر لە کۆتایی ڕستەکەوە باسکرێ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿..إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾[(٥)]،

---

(١) واتا:بۆ ناوە مخصوصەکە،کە دەکەوێتە پاش فعل وفاعلەکە.

(٢) واتا:لە ڕستەی((نعم الرجلُ زیدٌ))زیدٌ:مبتدا مؤخرە،و نعم الرجلُ:جملەی فعلیەودەبێتە خبری مقدم.

(٣)ئەمە دەبێتە بۆچوونی سێیەم دەربارەی إعرابی ناوە مخصوصەکە،کەوابوو سێ بۆچوون هەیە.

(٤) کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەگەر ناوە مخصوصەکە پێشتر باسکرا ئەوە پێویست ناکا جارێکی تر لە پاش فعل وفاعلەکە باسکرێتەوە،وەکو ڕستەی((الْعِلْمُ نِعْمَ الْمُقْتَنَى وَالْمُقْتَفَى)) واتا:زانست باشترین شتە دەستی خەی وباشترین شتە شوێنی کەوی.

(٥) بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٤٤)ی سورەتی(ص)،کورتەی ماناکەی:بەڕاستی ئێمە ئەو(پێغەمبەر ایوب-علیە السلام-)مان بە خۆگرببینی،چ بەندەیەکی چاك بوو بەڕاستی زۆرگۆێڕایەڵ وڕووی لەخوابوو. **إعرابەکەی**:إنّ:حرف مشبە بالفعل،نا:ضمیر متصل مبني في محل نصب اسم إنَّ. وجدْناهُ:فعل وفاعل ومفعول بە أوّل. صابراً:مفعول بە ثان منصوب. نعْمَ:فعل ماض جامد.العبدُ:فاعل مرفوع. والمخصوص بالمدح محذوف

واتا: نعم العبد أيوب، تایبەت کراو بەمدحەکە حذفکراوە-کە بریتیە لە أیّوب علیه السلام-لەبەر ئەوەی پێشتر باسکراوە.

* * *

***ئەو فعلانەی وەکو بئس ونعم بەکاردێ بۆ مدح وذم:**

٤٩٢-وَاجْعَلْ كَبِئْسَ سَاءَ وَاجْعَلْ فَعُلاَ    مِنْ ذِي ثَلاَثَـةٍ كَـنِعْمَ مُسْجَلاَ[١].

بەکاردێ فعلی((ساء))بۆ زەمکردن وەکو بەکارهێنانی((بئس))،کەوابوو فاعلەکەی دەبێ وەکو فاعلی بئس وابێ،لەوەی کە یان ال ی پێوەبێ،وەکو((ساء الرجلُ زيدٌ))،یان إضافەکرابێ بۆلای ناوێ ال ی پێوەبێ وەکو((ساءَ غلامُ القومِ زيدٌ))،یان جێناوێ بێ کە ناوێکی نکرە ڕوونی دەکاتەوە،وەکو((ساءَ رجلاً زيدٌ))، وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿سَاءَ مَثَلًا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا..﴾[٢]،وە لەپاش فاعلەکەیەوە مخصوص بە زەمکردنەکە

---

محذوف تقديره(هو). **الشاهد فيها:((نعم العبد))حيث حذفَ المخصوص بالمدح وهو أيوب لدلالة ما قبله عليه.**

[١] کورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:بەکار بێنە وەکو بئس فعلی(ساء)،وە بەکار بێنە هەموو فعلێکی ثلاثی دوای گۆڕینی وزنەکەی بە(فَعُلَ)بۆ مدح کردن، بەڕەهایی،ووشەی(مُسجلا)واتا: بەڕەهایی.

[٢] بەشێکە لەئایەتی(١٧٧)ی سورەتی(الأعراف)،کورتەی ماناکەی:بەدوخراپە وێنەوچیرۆکی ئەو کەسانەی نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانی. **إعرابەکەی:**ساء:فعل ماض جامد لإنشاء الذم مبني على الفتح،وفاعله ضمير مستتر تقديره(هو)يفسره مثلاً والتقدير(ساء المثلُ مثلاً).مثلاً:تمييز منصوب. القومُ:مبتدأ مؤخر مرفوع، وجملة(ساء مثلا)في محل رفع خبر مقدم. الذين:اسم موصول مبني في محل رفع نعت للقوم. كذّبوا:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها من الإعراب صلة الموصول. **الشاهد فيها:(ساء مثلاً)حيث استعمل ساء استعمال بئس،وفاعله هنا ضمير مستتر.**

باس دەکرێ،وەکو چۆن لە پاش بئس وە باس دەکرێ،وإعرابەکەی بەو شێوەیە دەبێ باسکرا.

هەروەها ئامـاژەی کرد دانەر بەووتـەی((وَاجْعَلْ فَعُلاً))بۆ ئەوەی کە هەموو فعلێکی ثلاثی دروستە مدح کردن یان زەمکردنی پێ بکرێ کاتێ دەکرێتە سەر وزنی(فَعُلَ)،و وەکو((نعم وبئس))مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ لەهەموو ئەو حوکم وبڕیارانەی باسکرا،کەوابوو دەڵێی:((شَرُفَ الرجلُ زيدٌ، ولَؤُمَ الرجلُ بكرٌ،وشَرُفَ غلامُ الرجلِ زيدٌ، وشَرُفَ رجلاً زيدٌ)).

جا بەپێی ئەم ڕەهاییەی دانەر[1] بێ دروستە لە فعلی عَلِمَ بوترێ:((علُمَ الرجلُ زيدٌ))بە ضمةی حەرفی دووەم((عين الفعل))ی ووشەکە،دانەر خۆی وکوڕەکەی ئەم نموونەیان هێناوەتەوە،بەڵام غەیری دانەر ووتوویانە کە دروست نیە ئەم سێ فعلە((علِمَ،و جهِلَ،وسمِعَ))بکرێنە سەر وزنی فعُل،لەبەر ئەوەی عەرەب کاتێ ئەم سێ فعلەی بەکار هێناوە تەنها بە کسرەی حەرفی دووەم((عين الفعل))یان بەکاریان هێناوە،ونەیان کردووە بە ضمة،بۆیە بۆ ئێمەش دروست نیە بیکەینە ضمة،بەڵکو دەبێ وەکو خۆی بیهێڵینەوە، وەکو چۆن عەرەب وەکو خۆی هێڵاویانەتەوە،کەوابوو دەڵێی:((علِمَ الرجلُ زيدٌ،وجهِلَ الرجل عمروٌ،وسمِعَ الرجلَ بكرٌ))[2].

* * *

---

[1] واتا:ئەوەی کە هەموو فعلێکی ثلاثی دەکرێ بۆ مدح وزەم بەکاربێ کاتێ دەکرێتە سەر وزنی(فعُل).

[2] کەوابوو ئەم سێ فعلە کاتێ بویسترێ تعجبیان لێ بکری وەکو خۆیان دەمێننەوەو ناکرێنە سەر وزنی(فعُل)لای زۆربەی زانایان،بەڵام ڕای ابن مالك وایە دروستە بکرێنە سەر وزنی(فعُل).

٤٩٣- وَمِثْلُ نِعْمَ حَبَّـذَا الفَاعِلُ (ذَا) وَإِنْ تُرِدْ ذَمًّا فَقُلْ:(لاحَبَّـذَا)[1].

بۆ مدح كردن دەوترێ:((حَبَّذا زيدٌ))،وە بۆزەمكردنيش:((لاحَبَّذا زيدٌ))،وەكو ووتەی:

٢٧٧- ألاَ حَبَّذَا أَهْلُ الْمَلاَ غَيْرَ أنَّه إذا ذُكِرَتْ مَيٌّ فَلاَ حَبَّذَا هِيَا[2].

جا ڕاجيای هەيە لە إعرابی((حَبَّذا زيدٌ))،هەريەك لە أبو علی الفارسی لە كتێبی البغداديات،وابن برهان،وابن خروف-كە ووتوويەتی ئەمە بۆچوونی پێشەوا سيبويە يە،وهەركەس غەيری ئەم بۆچوونە لە پێشەوا سيبويە بگێڕێتەوە بەهەڵەدا چووە-وە بۆچوونی هەڵبژاردەی دانەرە،كە((حبّ))فعلی ماضيە،و((ذا))فاعلەكەيەتی،ومخصوص بە مدحەكە دروستە مبتداكە بێ،وڕستەكەی پێشی[3] دەبێتە خبر،وە دروستە كە((زيدٌ))خبر بێ بۆ مبتدايەكی محذوف،وتقديرەكەی((هو زيدٌ))واتا:مدحكراو يان زەمكراو زيدە،ئەمەش بۆچوونی هەڵبژێراوە لای دانەر.

وە هەريەك لە پێشەوا مبرّد لە كتێبی المقتضب دا،وابن السراج لە كتێبی الأصول ،وابن هشام اللّخمی،وبۆچوونی پەسەندی ابن عصفور،پێيان وايە كە((حَبَّذا))اسمە،ومبتدايە،ومخصوصەكەی دەبێتە خبری،يان((حَبَّذا)) خبری مقدّمەومخصوصەكەی مبتدای مؤخرە،كەواتا ((حبّ))لەگەڵ((ذا)) لێكدراون وبوون بەيەك ناو.

---

[1] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:وەكو نعم وايە((حَبَّذا))وفاعلەكەی بريتيە لە((ذا))،وە بۆ زەمكردن دەڵێی:((لا حَبَّذا)).

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ئای چەند چاكن خەڵكانی بيابان(صحراء)،بەلاّم كە باسی دادە(ميّ)بێ-ناوی ئافرەتێكە-چاك نيە وخراپە. بەڵگەكەی:((حبّذا...و لاحبّذا)) بەكار هاتوون بۆ مدح كردن وزەم وكردن.

[3] واتا:ڕستەی((حبّذا))كە فعل وفاعلە دەبنە خبری مقدم بۆ((زيدٌ)).

وە كۆمەڵێك-لەوانە ابن دُرُستويە-پێیان وایە كە((حَبَّذا))هەمووی فعلی ماضیە،و((زيدٌ))فاعلەكەیەتی،كەواتا((حبّ))لەگەڵ((ذا))لێكدراون وبوون بە یەك فعل،ئەم بۆچوونەش لاوازترینە.

* * *

٤٩٤- وَأَوْلِ ذَا الْمَخْصُوصَ أَيًّا كَانَ لا تَعْدِلْ بِذَا فَهْوَ يُضَاهِي الْمَثَلا[1].

واتا:بهێنە ناوە تایبەتكراو(مخصوص) بە مدح یان بەزەمكردنەكە لەپاش((ذا))هەر جۆروشێوەیە بێ،چ مفرد،ومذكر ،ومؤنث ،ومثنى،جمع بێ، وە((ذا))یەكە ناگۆڕێ بەهۆی مخصوصەكەوە،بەڵكو تەنها بە مفردی مذكری بەكاردێ،لەبەر ئەوەی هاوشێوەی پەندە،پەندیش ناگۆڕێ،وەكو دەڵێی:((الصيفَ ضيّعتِ اللبنَ))[2] بۆ نێر ومێ وتاك ودووان وكۆ بەم شێوەیە بەكاردێ ونـاگۆڕێ ،كەواتا دەڵێـی:((حبّذا زيدٌ،وحبّذا هندٌ،والزيدانِ،والهندانِ،والزيدونَ،والهنداتُ))ناگۆڕێ((ذا))[3] لە مفردومذكر بوون،ئەگەر بگۆڕی دەوترێ:((حبّذي هندٌ، وحبّذانِ الزيدانِ،وحبّتانِ الهندانِ،وحبّ اولئك الزيدون،أو الهنداتُ)).

* * *

٤٩٥-وَمَا سِوَى ذَا ارْفَعْ بِحَبَّ أَوْ فَجُرّْ بِالْبَا وَدُونَ ذَا انْضِمَامُ الْحَا كَثُرْ[4].

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:((ذا))كە فاعلی((حبّ))یە بەیەك شێوە بەكاردێ بۆ مفرد ومثنى وجمع،ومذكر ومؤنث،-واتا:ناگۆڕێ-،وەكو بەكارهێنانی پەند وایە،كە نەگۆڕە.

[2] واتا:لە هاویندا شیرەكە لەدەست چوو،ئەم پەندە بەكاردێ بۆ كەسێ كە بەدەستی خۆی شتێك لەدەستی خۆی دەدات.

[3] ذا اسمی إشارەیە.

[4] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر جگە لە((ذا))لە پاش فعلی((حبّ))وە هات،ئەوە دوو جۆر إعرابی بۆ دروستە،یان مرفوع دەبێ بە فعلی((حبّ))،وە یان مجروردەبێ بە حەرفی جەڕی(بـ)ی زیادكراو،وە كاتێ فعلی حبّ جگە لە((ذا))لە دوایەوە دێ بەزۆری وایە حەرفی حای((حبّ))مضموم بێ.

واتا هەرکاتێ لە پاش فعلی((حبّ))جگە لە((ذا))هەر ناوێکی تر هات ئەوە دوو شێوە إعرابی تیا دروستە:مرفوع کردنی بە فعلی حبّ،وەکو((حبّ زیدٌ))،وە مجرورکردنی بە حەرفی(بـ) زیادکراو،وەکو((حبّ بزیدٍ))،وە ئەصلی فعلی حبّ:حَبُبَ یە،وهەردوو حەرفی (بـ) تێهەڵکێش کراون وبووە بە حبّ.

پاشان ئەگەر لەپاش((حبّ)) ذا هات ئەوە واجبە حەرفی حایەکەی مفتوح کەی،دەڵێی:((حَبَّ ذا))،وە ئەگەر جگە لە((ذا))هات ئەوە دروستە حەرفی حایەکەی مضموم کەی،وەدروستە مفتوحی کەی،دەڵێی:((حُبَّ زیدٌ))وە ((حَبَّ زیدٌ))،وە گێڕدراوەتەوە بەهەردوو شێوەکە ووتەی:

٢٧٨–فَقُلْتُ اقْتُلُوهَا عَنْكُمُ بِمِزَاجِهَا وحَبَّ بِهَا مَقْتُولَةً حِينَ تُقْتَلُ[1]

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:ووتم تونی ئەو عەرەق ومەیە خاو کەنەوە بەتێکەڵاوکردنی ئاو،چونکە زۆر خۆش دەبێ کاتێ تونییەکەی بەئاو بمرێنی. بەڵگەکەی:((وحَبَّ)) حەرفی حایەکەی بەدوو شێوە خوێندنەوە گێڕدراوەتەوە،لەبەر ئەوەی فاعلەکەی ((ذا))نیە.

## أفعل التفضيل[١]

٤٩٦-صُغْ مِنْ مَصُوغٍ مِنْهُ لِلتَّعَجُّبِ أَفْعَلَ للتَّفْضِيلِ وَأْبَ اللَّذْ أُبِي[٢].

دروست دەكرێ لەو فعلانەی كە دروستە تعجبیان لێ بكرێ[٣]-بۆ دەلالەت كردن لەسەر تفضیل وبەراوردكردن-وەصف وناوێ لەسەر وزنی((أفعلُ))،دەڵێی((زیدٌ افضلُ من عمروٍ،واكرمُ من خالدٍ))،وەكو چۆن دەڵێی((ما افضلَ زیداً،وما اكرمَ خالداً))،وە ئەوەی دروست نیە تعجبی لێ بكرێ ئەوە دروست نیە اسمی تفضیلی لێ بكرێ،كەوابوو اسمی تفضیل دروست ناكرێ لە فعلی زیاتر لە ثلاثی،وەكو دحرج واستخرج،وە لەفعلی نەگۆڕ،وەكو نعم وبئس،وە لە فعلێ كە كەم وزیاد هەڵنەگرێ وەكو مات وفنيَ،وە لە فعلی ناتەواو((ناقص))،وەكو كان وهاوشێوەكانی،وە لەفعلی نەفی كراو،وەكو((ما عاج بالدواءِ،وما ضربَ))،وە لەو فعلانەی كە صفەكەیان لەسەر وزنی((افعل فعلاء))وەكو((حمر،وعور))،وە لەفعلی بكەر نادیار،وەكو ((ضُرِبَ،وجُنَّ))،وە بەشاذی هاتووە ووتەیان((هو اخصرُ مِنْ كذا))أفعلی تفضیلیان دروست كردووە لەفعلی((اختُصِرَ))كە فعلێكی خماسیە وزیاتر لە ثلاثیە،وبكەر نادیارە،وە ووتوویانە:((اسودُ من حلك الغُراب[٤]،وابیضُ من اللبن))اسمی تفضیلیان دروست كردووە لە فعلێ كە وەصفەكەی لەسەر وزنی افعلُ.

---

[١] پێیشی دەوترێ اسمی تفضیل،واتا:ئەو ناو ووزنەی بەكاردێ بۆ ئەوەی كە دوو ناو هاوبەش وبەشدارن لە كاروصیفەتێك،ویەكێكیان زیاتر وباشترە لەوی تریان. ووشەی((التفضیل))واتا:فەزڵ دان وباودانی بەسەر ئەوی تر، وە لە زمانی كوردیدا اسمی تفضیل بە پاشگری((ترە))كۆتای دێ،وەكو دەڵێین((جوانترە،زیرەكترە، چالاكترە...هتد))، جا ئێمە لەشەرحەكەدا ووشەی تفضیل بەكاردێنین.

[٢] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:دروستكە وداڕێژە لەو فعلەی كە تعجبی لێدەكرێ صیغە واسمی تفضیل،وە ئەو فعلەی تعجبی لێناكرێ ئەوە دروست نیە تفضیلی لێ بكرێ.

[٣] واتا:ئەو مەرجانەی لە دێڕی(٤٧٨و٤٧٩)ی ئەلفیە باسكرا.

[٤] واتا:ڕەشترە لە ڕەشی قەلە ڕەش.

٤٩٧-وَمَا بِهِ إِلَى تَعَجُّبٍ وُصِلْ      لِمَانِعٍ بِهِ إِلَى التَّفْضِيلِ صِلْ[١].

پێشتر ڕابورد-لە باسی تعجب دا[٢]-كە تعجب دەكرێ لەو فعلانەی كە مەرجەكانی تێدا نیە بە فعلی یاریدەر(مساعد)ی((اشدّ))وهاوشێوەكانی،وە لێرەدا ئاماژەی كرد بەوەی كە اسمی تفضیل دروست دەكرێ لەو فعلانەی مەرجەكانی تێدا نیە بەهەمان شێوەی تعجب كردن،هەروەكو چۆن دەڵێی:((ما اشدَّ استخراجَهُ))دەڵێی:((هو اشدُّ استخراجاً من زيدٍ)) ،وە وەكو چۆن دەڵێی:((ما اشدَّ حمرتَهُ))دەڵێی:((هو اشدُّ حُمْرةً من زيدٍ))،بەلاّم ئەوەندە هەیە كە مصدرەكە لە بابی تعجب لە پاش((اشدّ))دەبێتە مفعول به،ولێرەدا دەبێتە تمییز.

*      *      *

***باسی جۆر وحاڵەتەكانی اسمی تفضيل:**

٤٩٨- وَأَفْعَلَ التَّفْضِيلِ صِلْهُ أَبَدَا      تَقْدِيراً أَوْ لَفْظاً بِمِنْ إِنْ جُرِّدَا[٣].

افعلی تفضیل بەدەر نیە لە سێ حاڵەت:یەكەمیان:خالی وپەتیە لە ال وإضافەكردن،دووەم:إضافە كراوە،سێیەم:ال ی پێوەیە.

جا ئەگەر خالی بێ ئەوە پێویستە حەرفی جەڕی((من)) لەگەڵ بێ ڕاستەوخۆ:چ حەرفەكە موجود بێ،یان مقدر بێ،وەئەم حەرفە جەڕە ناوە فەزڵ بەسەردراوەكە مجرور دەكا،وەكو((زيدٌ افضلُ مِنْ عمروٍ،ومررْتُ برجلٍ افضلَ من عمروٍ))،وە هەندێ جار حەرفی((من))وناوە مجرورەكەی حذف

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەو فعلانەی مەرجەكانیان تێدا نیە ڕاستەوخۆ اسمی تفضیلیان لێ دروست بكرێ،بەهەمان شێوەی ئەوانەی كە ڕاستەوخۆ تعجبیان لێناكرێ،تفضیلیان لێ دەكرێ.

[٢] لە دێڕی ژمارە(٤٨٠و٤٨١)ی ئەلفیە.

[٣] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:افعلی تفضیل دەبێ لە پاشێوە حەرفی جەڕی(من)بێ لفظاً یان تقديرا،ئەگەر خالی بێ لە ال.

دەكرىٚ ئەگەر بەڵگە لەسەر حذف كردنەكەيان هەبىٚ،وەكو فەرموودەى خواى گەورە﴿..أَنَا أَكْثَرُ مِنْكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾[1]،واتا:وأعزُّ منك نفراً.

وە فامرايەوە لە قسەى دانەر كە افعل التفضيل ئەگەر((أل))ـى پێوە بىٚ،يان إضافه كرا بىٚ ئەوە حەرفى((مِنْ))ـى لە گەڵ نابىٚ،كەواتا نالٚێى:((زيدٌ الأفضلُ مِن عمروٍ))،وە نالٚێى:((زيدٌ افضلُ الناسِ مِن عمروٍ)).

ئەمەش[2] زۆرتر وايە كاتێك دەبىٚ كە افعل التفضيل خبر بىٚ،وەكو ئايەتە پيرۆزەكە[3] وهاوشێوەى،ئەمەش زۆرە لە قورئاندا،وە هەندىٚ جار حذف دەكرىٚ وافعل التفضيل كە خبر نيە، وەكو ووتەى:

٢٧٩-دَنَوْتِ وقَدْ خِلْنَاكِ كالبَدْرِ أَجْمَلاَ فَظَلَّ فُؤَادِى فِي هَوَاكِ مُضَلَّلاَ[4].

لێرەدا((أجملا))أفعلى تفضيله،ومنصوبه وحاله بۆ تاى فعلى((دنوتِ))، وحرفه جەرەكەى((من))حذفكراوە،وتقديرەكەى:دنوتِ أجملَ من البدرِ،وقد خِلْناكِ كالبدر. وە افعل التفضيل ئەگەر خالى وپەتى بىٚ لە((أل))پێويستە

---

[1] بەشێكە لە ئايەتى ژمارە(٣٤)ـى سورەتى(الكهف)،كورتەى ماناكەى:من ماڵ وسامانم لە تۆ زۆرترە وكوڕو خزمەتكاريشم لەتۆ زياترە. إعرابەكەى:أنا:ضمير منفصل مبني على السكون في محل رفع مبتدأ. أكثرُ:خبر مرفوع. منكَ:جارومجرور متعلقان بـ(اكثر). مالاً:تمييز منصوب. وأعزُّ:و:حرف عطف،أعز:معطوف على أكثر مرفوع. نفراً:تمييز منصوب. الشاهد فيها: ((واعزُّ..)) حيث حذف حرف جره(من)مع مجروره،لدلالة ماقبله عليه.

[2] واتا:ئەوەى كە حەرفى جەرى((من))ومجرورەكەى حذف دەكرىٚ لە پاش افعل التفضيل كاتىٚ خالى بىٚ لە((أل)).

[3] واتا:ئايەتى سورەتى الكهف،ژمارە(٣٤).

[4] ماناوبەڵگەى ئەم دێرە:نزيك بوويتەوە لە كاتێكدا ئێمە وا خەياڵمان كرد وەكو مانگ جوانى،بۆيە دڵم لە خۆشەويستى تۆدا سەرگەردان بوو. بەڵگەكەى:((اجملا..))اسمى تفضيلە وحەرفە جەرەكەى((من))پاشى لەگەڵ مجرورەكەى حذف كراوە لەكاتێكدا اسمە تفضيلە كە خبر نيە وحالە.

مفرد ومذکر بێ،هەروەها ئەگەر إضافە کرا بێ بۆلای ناوی نەناسراو،بۆ ئەمەش[1] ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:

٤٩٩-وَإِنْ لِمَنْكُورٍ يُضَفْ أَوْ جُرِّدَا أُلْـزِمَ تَذْكِيراً وَأَنْ يُوَحَّـدَا[2].

دەڵێی:(( زیدٌ افضلُ مِنْ عمرٍو، وافضلُ رجلٍ، وهندٌ افضلُ مِنْ عمرٍو، وافضلُ امرأةٍ، والزيدانِ افضلُ مِن عمرٍو، وافضلُ رجلينِ، والهندانِ افضلُ مِنْ عمرٍو، وافضلُ امراتينِ، والزيدونَ افضلُ مِنْ عمرٍو، وافضلُ رجالٍ، والهنداتُ افضلُ مِنْ عمرٍو، وافضلُ نساءٍ))،کەواتا((افعلُ))لەم دوو حاڵەتەدا مذکر ومفردە،وناکرێتە مؤنث،وناکرێتە مثنى وجمع.

* * *

٥٠٠-وَتِلْوُ ((أَلْ)) طِبْقٌ وَمَـا لِمَعْرِفَهْ أُضِيفَ ذُو وَجْهَيْنِ عَنْ ذِي مَعْرِفَهْ

٥٠١-هَذَا إِذَا نَوَيْتَ مَعْنَى((مِنْ))،وَإِنْ لَمْ تَنْوِ فَهْوَ طِبْقُ مَـا بِهِ قُرِنْ[3]

ئەگەر افعلی تفضیل((ال))ی پێوە بێ ئەوە پێویستە هاوتایی پێش خۆی بێ:لە مفردبوون،ومذکربوون،غەیری ئەم دووانەش،کەواتا دەڵێی:((زيدٌ الأفْضَلُ ، والزَّيْدَانِ الأَفْضَلاَنِ ،والزَّيْدُونَ الأَفْضَلُونَ ،وهِنْدٌ الفُضْلَى ،والهِنْدَانِ الفُضْلَيَانِ

---

[1] واتا:بۆ ئەوەی کە افعل التفضيل ئەگەر خالی بێ لە((ال))،وە ئەگەر إضافەکرابێ بۆ لای ناوی نەناسراو،ئەوە پێویستە افعل التفضيل مفرد ومذکر بێ ونەگۆڕێ.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر افعل التفضيل بۆ لای ناوی نەناسراو إضافە کرا،یان ئەگەر خالی بێ لە((ال))و إضافە،ئەوە پێویستە افعل التفضيل مفرد بێ ومذکر بێ.

[3] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٥٠٠-ئەگەر افعلی تفضیل((ال))ی پێوە بوو ئەوە هاوتای ناوەکەی پێش خۆیەتی لەڕووی مذکر ومؤنث ومثنى وجمعەوە،وە ئەگەر افعلی تفضیل إضافە کراوبوو بۆلای ناوی ناسراو ئەوە بە دوو شێوە دروستە-بەوەی هاوتای ناوەکەی پێش خۆی بێ،یان هاوتای نەبێ-.٥٠١-ئەمە ئەگەر مەبەست ونیەتی((من))هەبێ واتا:مانای تفضیل وبەراوردکردنەکە هەبێ،وە ئەگەر مەبەستی ((من))نەبێ ئەوە دەبێ هاوتای بێ وبەیەك شێوە دروستە.

،والهِنْدَاتُ الفُضَّلُ، أو الفُضْلَيَاتُ))،وه دروست نیه هاوتای ناوەکەی پێش خۆی نەبێ،کەواتا نالێی:(( الزیدونَ ،الأفضلُ))،یان((الزیدانِ الأفضلُ))، وه یان((هندٌ الأفضلُ))،یان((الهندانِ الأفضلُ)) وه یان((الهنداتُ الأفضلُ))،وه دروست نیه حەرفی((مِنْ))ی پێوه بێ،کەواتا نالێی:((زیدٌ الأفضلُ من عمروٍ))، بەڵام ووتەی:

٢٨٠-وَلَسْتُ بالأَكْثَرِ مِنْهُمْ حَصًى وإنَّمَا العِــزَّةُ لِلْكَاثِرِ[1]

ئەم دێڕه لێکدەدرێتەوەوتأویل دەکرێ بەوەی کە ئەلیف ولامەکە[2] زیادکراوه، وئەصڵەکەی:ولستُ بأكثرَ منهم،یان بەوەی کە((منهم))متعلق نیه بە((الأكثر))بەڵکو متعلقه به ناوێکی حذفکراوی خالی له((ال))، وتقدیرەکەی((ولستُ بالأكثرِ اكثرَ منهم)).

وه ئاماژەی کرد بەووتەی:((وما لمعرفه اضیفَ-تا کۆتایی))بۆ ئەوەی کە افعلی تفضیل ئەگەر إضافەکرا بۆلای ناوی ناسراو ومەبەست پێی تفضیل کردن بوو،ئەوه دوو شێوەی تیا دروسته:یەکیان:بەکارهێنانی وەکو خالی وپەتی له((ال))وله إضافه،کە هاوتای پێش خۆی نابێ،دەڵێی:((الزَّیدانِ أفضلُ القومِ،والزَّیدونَ أفضلُ القومِ ، وهندٌ أفضلُ النِّسَاءِ ،والهندانِ أفضلُ النساءِ ،والهنداتُ أفضلُ النسَاءِ)).

دووەم:بەکارهێنانی وەکو ئەوەی کە((ال))ی پێوەبێ،کە هاوتای ناوەکەی پێشی دەبێ،دەڵێی:(( الزیدان أَفْضَلاَ القومِ، والزیدون أَفْضَلُو القومِ، أو أَفَاضِلُ

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕه:من هێزو دەسەڵاتم لەوان زۆرتر نیه،هەرچەنده بەزۆری وایه سەربەزی بۆ زۆرییه. **بەڵگەکەی**:(( بالأَكْثَرِ مِنْهُمْ..))وا دەردەکەوێ کە حەرفی ((من))لە گەڵ افعل التفضیل کە (ال)ی پێوەیه هاتووه،ئەمەش لای زۆربەی زانایان دروست نیه،و لێکدانەوەی بۆ کراوه کە ابن عقیل-رحمه الله- ئاماژەی پێدەکا.

[2] واتا: ئەلیف ولامی سەر((بالأَكْثَرِ)).

القومِ، وهند فُضْلى النساءِ،والهندان فُضْلَيَا النساءِ، والهنداتُ فُضَّلُ النساءِ ،أو فُضْلَيَاتُ النساءِ))،وەمەرج نیە تەنها بەکارهێنانی یەکەم،پێچەوانەی بۆچوونی ابن السراج،وە هەردوو بەکاهێناەنەکە لە قورئاندا هاتووە،نموونەی بەکارهێنانی بەهاوتا نەبوونی ناوەکەی پێش خۆی فەرموودەی خوای گەروە﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَى حَيَاةٍ..﴾[1]،وەنموونەی بەکارهێنانی بە هاوتایی ناوەکەی پێش خۆی فەرموودەی خوای گەروە:﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا..﴾[2]،وە هەردوو بەکارهێنانەکە کۆبۆتەوە لەفەرموودەی

---

[1] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٩٦)ی سورەتی(البقرة)،کورتەی ماناکەی:سوێند بێت ئەو(جولەك)انە دەبینیت لە هەموو کەس زیاتر حەز لەژیان دەکەن. إعرابەکەی: و:حسب ما قبلها، لـ:واقعة في جواب قسم محذوف،وهي تفيد التوكيد،تجدَنّ:فعل مضارع مبني على الفتح لاتصاله بنون التوكيد،وفاعله:ضمير مستتر تقديره(انت). هم:ضمير متصل مبني على السكون في محل نصب مفعول به أول. أحرصَ:مفعول به ثان منصوب، وهو مضاف. الناسِ:مضاف إليه مجرور. على حياةٍ:جارومجرور متعلقان بـ(أحرص). الشاهد فيها:((لتجدنهم أحرص..))حيث جاء افعل التفضيل غير مطابق لموصوفه(هم)، ولو جاء مطابقا لقيل:(أحارص)أو(احرصي)،والوجهان جائزان عند الجمهور.

[2] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١٢٣)ی سورەتی(الأنعام)،کورتەی ماناکەی:بەو شێوەیە لە هەموو شارو ئاوەدانیەکدا گەورەترین تاوانباریمان کرد(بە دەسەڵاتدار). إعرابەکەی:و:حسب ماقبلها،ك:حرف جر،ذا:اسم إشارة مبني في محل جر اسم مجرور،واللام:للبعد،والكاف:للخطاب،والجاروالمجرور متعلقان بمحذوف صفة لمفعول مطلق محذوف،والتقدير:وجعلنا في مكة مجرمين جعلاً مثل جعلنا... جعلْنا:فعل وفاعل.في كل:جارومجرور متعلقان بـ(جعلنا)،وكل مضاف. قريةٍ:مضاف إليه. أكابرَ:مفعول به أول (لجعلنا)منصوب، وفي كل:فَي محل نصب مفعول به ثان. مجرميها:بدل من أكابر منصوب وعلامة نصبه الياء لأنه جمع مذكر السالم،وهو

پێغەمبەرﷺ:(( أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَنازِلَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ:أحاسنكم أخلاقاً،الموطئونَ أكنافاً،الذين يألفونَ ويُؤلفونَ))[١].

جا ئەوانەی بەدروستیان داناوە دوو شێوەکە ووتوویانە:ڕەوانتر ئەوەیە هاوتا بێ،بۆیە عەیب ونەنگی گیراوە لەسەر قسەی خاوەنی الفصیح[٢] لەووتەی((فاخترنا افصحهنّ[٣]))ووتوویانە:ڕاستر وابوو وتبای:((فُصحاهنّ))[٤].

---

مضاف، ها:في محل جر مضاف إليه. موطن الشاهد:((اكابر مجرميها..))حيث ورد افعل التفضيل(اكابر)مطابقا لما قبله،لأنه اضيف إلى معرفة.

[١] ئەم فەرموودەیە هەریەك لە ئیمامی بُخاری لە کتێبی((الأدب المفرد))دا،وئیمامی احمد لە مسندەکەیدا بە شێوازو جیاجیا ڕیوایەتیان کردووە،پوختەی ماناکەی:ئایە پێتان بڵێم کامتان زۆرتر خۆشەویستی منن،ولەڕۆژی دوایدا لەمنەوە نزیکە:ئەوانەتان ڕەوشتتان بەرزوجوانە، وباوەش کراوەن بۆ خەڵکی گونجاون،وهەمیشە هۆگرن لە گەڵ خەڵکیدا وخەڵکیش هۆگریانە. إعرابەکەی: الا:حرف عرض مختص بالدخول على الجملة الفعلية،غير عامل. أُخبِرُكم:فعل وفاعل ومفعول به. بأحبكم: جارومجرور ومضاف إليه. إليَّ:جارومجرور متعلقان بـ(أحبّ). واقربكم:حرف عطف واسم معطوف ومضاف إليه. منّي:جارومجرور متعلقان بـ(أقربكم). منزلَ:تمييز منصوب. يومَ:ظرف زمان منصوب على الظرفية في محل نصب مفعول فيه،وهو مضاف. القيامة:مضاف إليه مجرور. أحاسنُ:خبر لمبتدا محذوف تقديره(هم)،وهو مضاف، (كم)في محل جر مضاف إليه. اخلاقاً:تمييز منصوب. الموطئون:خبرلمبتدا محذوف. اكنافاً: مفعول به لاسم الفاعل(الموطئون). الذين:اسم موصول مبني على الفتح في محل رفع خبر لمبتدا محذوف تقديره(هم). يألفون:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها صلة الموصول. ويؤلفون: و:حرف عطف،يؤلفون:جملة فعلية معطوفة على التي قبلها.موطن الشاهد: ((احبكم، اقربكم،احاسنكم))افعل التفضيل هنا اضيف إلى معرفة،وجاز فيه وجهان.

[٢] کە:ابو العباس احمدی کوڕی یحیای ثعلبە،ویەکێکە لەزانایانی ڕێزمانی عەرەبی وکوفیە،ونامیلکەیەکی نووسیوە بەناوی((فصيح ثعلب)).

[٣] واتا:هەڵمان بژارد لغە وبۆچوونی ڕەوانتر.

[٤] لەبەر ئەوەی((فصحى))صفەیە بۆ(لغة ولهجة)کە ووشەیەکی مؤنثە.

وە ئەگەر افعلی تفضیل مەبەست پێی بەراوردکردن نەبوو ئەوە پێویستە هاوتای ناوەکەی پێش خۆی بێ،وەکو ووتەیان:((الناقصُ والأشجُّ اعدلا بني مروان[1]))واتا:عادلەکانی[2] نەوەی مەڕوان.

وە بۆ ئەمەی باسمان کرد لە مەبەست بوونی بەراورد وتفضیل ومەبەست نەبوونی ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی:(( هَذَا إِذَا نَوَيْتَ مَعْنَى((مِنْ))–دێڕکە[3]))واتا:دروستی دوو شێوەکە–مەبەستم هاوتابوونی ناوەکەی پێش خۆی وهاوتانەبوونی–مەرجە بەوەی کە مەبەستت ئەوەبێ بەراوردوتفضیل کردن بێ،وە ئەگەر ئەم مەبەستە نەبێ ئەوە پێویستە هاوتای ناوەکەی پێش خۆی بێ[4].

ووتراوە:لە بەکارهێنانی افعلی تفضیل بۆ غەیری بەراورد وفەزڵدان فەرموودەی خوای گەورە﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ...﴾[5]،

---

[1] واتا:ناقص کە نازناو وصفەیە بۆ خەلیفە((یزید کوڕی عبدالملك کوڕی مروان))بۆیە پێی ووتراوە ناقص:لەبەر ئەوەی لەسەردەمی ئەودا ئازووقەوخواردنی سەربازانی کەمکردەوە. والأشجّ:نازناوصفەتی خلیفە((عمری کوڕی عبدالعزین))ووشەی اشجّ واتا:بریندار وزام،بۆیە وای پێ ووتراوە لەبەر ئەوەی برین وزامێك لە دەم چاویدا بووە. جا ئەم دوو خەلیفەیە لەناو ئەمەوێکاندا لەهەموویان دادپەروەرتربوون بۆیە وا ووتراوە.

[2] کەواتا:اعدل بۆ بەراورد کردن وتفضیل بەکار نەهاتووە،بەڵکو وەکو صفەتێکی ئاسای بەکار هاتووە.

[3] واتا:دێڕی ژمارە(٥٠١)ی ئەلفیە.

[4] لەبەر ئەوەی اسمی تفضیل جۆرێکە لە صفەونعت،صفەش دەبێ مطابق وهاوتای پێش خۆی(موصوف ومنعوت)ەکەی بێ.

[5] بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٢٧)ی سورەتی(الروم)،پوختەی ماناکەی:ئەو(خوا)زاتێکە بەدی هێنانی دەست پێکردووە ولەپاشان(دوای مردنی)دووبارە دروستی دەکاتەوە، وئەم (دروستکردنەوەی دووەمی)لای خوا ئاسانترە.. إعرابەکەی:و:حسب ما قبلها،هو:ضمير منفصل مبني في محل رفع مبتدا. الذي:اسم موصول مبني في محل رفع

وه فـەرمووده‌ى:﴿رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ..﴾[١]،واتـا:هـيِّنٌ عليـه،وربُّكم عـالم بكـم. وه ووتـه‌ى شاعر:

* وإنْ مُدَّتِ الأَيْدِى إلى الزَّادِ لَمْ أَكُنْ    بِأَعْجَلِهِمْ إذْ أَجْشَعُ القَوْمِ أَعْجَلُ[٢].

واتا:لم اكن بعجلهم. وه ووته‌ى:

٢٨١- إنّ الذى سَمَكَ السَّماءَ بَنَى لَنَا    بَيْتـاً دَعَائِمُهُ أَعَــزُّ وأَطْوَلُ[٣].

واتـا:دعائمـهُ عزيـزة طويلـة، جـا ئايـه ئه‌مـه[٤] قياسـيه يـان نا؟پێشه‌وا مُبرد ووتوويه‌تى:قياسيه،وغه‌يرى مبرد ووتوويانه:قياسى نيه،ئه‌مـه‌ش ڕاسته،وه خاوه‌نى كتێبى الواضح[٥] باسى ئه‌وه‌ى كردووه كه زانايانى نحو ئه‌مه‌يان[٦]

---

خبر.يبدأُ:فعل وفاعل،والجملة الفعلية لامحل لها من الاعراب صلة الموصول. الخلقَ:مفعول به منصوب.ثمّ:حرف عطف. يعيدهُ:فعل وفاعل ومفعول به،والجملة الفعلية معطوفة على التي قبلها. وهو:مثل سابقها. اهونُ:خبر مرفوع. عليه:جارومجرور متعلقان بـ(اهون). الشاهد فيها:((اهونُ..))حيث جاء أفعل التفضيل لغير التفضيل، فأهون بمعنى هيِّنٌ عليه.

[١] بەشێکه له‌ئايه‌تى ژماره(٥٤)ى سوره‌تى(الاسراء)،پوخته‌ى ماناكه‌ى:په‌روه‌ردگارتان زاناتره به‌ئێوه. إعرابه‌كه‌ى:ربُّ:مبتدا مرفوع،وهو مضاف،كم:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. اعلمُ:خبر مرفوع. بِكُمْ:جارومجرور متعلقان بـ(أعلم). الشاهد فيها:((اعلمُ))حيث استعملت صيغة افعل لغير التفضيل،وأعلم بمعنى عالمٌ بكم.

[٢] پێشتر له شاهد وبه‌ڵگه‌ى ژماره(٧٧)ماناى ئه‌م دێره‌مان كرد،وه به‌ڵگه‌كه‌ى بۆ ئێره بريتيه له((بأعجلهم))افعلى تفضيل به‌كار هاتووه بۆ غه‌يرى تفضيل وبه‌راورد كردن.

[٣] ماناوبه‌ڵگه‌ى ئه‌م دێره:بێگومان ئه‌و زاته‌ى ئاسمانى به‌رزكردووه بۆ ئێمه‌ش ماڵێكى پيرۆزى-مه‌به‌ست كعبه‌ى پيرۆزه-كۆڵه‌كه وپايه‌كه‌ى زۆر به‌هێزه ودامه‌زراوه. به‌ڵگه‌كه‌ى:((اعزُّ واطولُ))افعلى تفضيل به‌كار هاتوره بۆ غه‌يرى تفضيل وبه‌راوردكردن.

[٤] واتا:به‌كار هێنانى وبه‌راورد كردن افعلى تفضيل بۆ غه‌يرى تفضيل.

[٥] كه ناوى محمدى كوڕى حسن وناسراوه به پێشه‌وا الزبيدى.

[٦] واتا:به‌كار هێنانى وبه‌راورد كردن افعلى تفضيل بۆ غه‌يرى تفضيل،نه به‌سماعى ونه‌به‌قياسى،كه‌واتا:سێ بۆچوون هه‌يه له‌م باره‌وه:١-ده‌ڵێ قياسيه كه بۆچوونى

پێی دروست نیە،وە پێشەوا ئەبو عُبیدە[1] دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە﴿وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾فەرموویەتی:بەمانای هێنْ دێ،و دێڕە شعرەکەی فەرەزدق[2]-کە شاهد وبەڵگەی دووەمە-وتوویەتی:بە مانای عزیزة طویلة هاتووە،وە بێگومان زانایانی نحو وەڵامی ئەبو عُبیدەیان داوەتەوە، وتوویانە:هیچ بەڵگەی نیە لەمەدا.

* * *

***چ کاتێ حەرفی((من))ومجرورەکەی پێش اسمی تفضیل دەکەون:**

٥٠٢- وَإِنْ تَكُـــنْ بِتِلْوِ مِنْ مُسْتَفْهِمَا فَلَهُمَا كُنْ أَبَـــداً مُقَدِّمَـــا

٥٠٣-كَمِثْلِ((مِمَّنْ أَنْتَ خَيْرٌ))، وَلَدَى إِخْبَـــارٍ التَّقْدِيمُ نَـــزْراً وَرَدَا[3].

پێشتر ڕابورد کە افعلی تفضیل ئەگەر خالی بێ[4] ئەوە لە پاشێوە حەرفی جەڕی(من) دێ کە ناوە فەزڵ بەسەردراوەکە مجرور دەکا،وەکو((زیدٌ افضلُ مِنْ عمروٍ))،وە((مـن))وناوە مجرورەکەی وەکو مضاف إلیە وان بۆ ناوی

---

پێشەوا مبردە.٢-دەڵێ:سماعیە کە بۆچوونی بەهێز وزۆرینەیە.٣-دەڵێ:نە سماعیە ونەقیاسیە،ئەمەش بۆچوونی هەندێکە لەزانایان.

[1] یەکێکە لە زانایان وپێشەوایانی زمان وئەدەبی عەرەبی،وناوی تەواوی:معمّری کوڕی مثنایە،وخاوەنی کتێبی((إعراب القرآن))و((مجاز القرآن))،وساڵی ٢٠٩ك کۆچی دوای کردووە،خوای گەورە پلەوپایە داری کات.

[2] واتا:دێڕی ژمارە(٢٨١).

[3] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر لەپاش حەرف جەڕی((مِنْ))وە اسمی استفهام هات،ئەوە پێویستە حەرفە جەڕەکە واسمە مجرورەکەی پێش اسمە تفضیلەکە کەون. وەکو((مِمَّنْ أَنْتَ خَيْرٌ))،لێرەدا ووشەی((خیر))اسمی تفضیلە وئەصڵەکەی((اخیر))ە وهمزەکەی حذفکراوە لەبەر زۆر بەکارهێنان((لکثرة الاستعمال))، وەکەم جار جارومجرورەکە پێش اسمە تفضیلە دەکەون لە کاتێکدا ڕستەکە خبرە واستفهام نیە.

[4] واتا:خالی (مجرد)بێ لە (أل)و،ولە إضافە کردن.

مضاف،بۆیە دروست نیە پێش خۆیان کەون،هەروەکو چۆن دروست نیە مضاف إلیە پێش مضاف کەوێ،مەگەر ناوە مجرورەکە اسمی استفهام بێ،یان إضافە کرابێ بۆلای اسمی استفهام،لەم کاتەدا پێویستە((مِن))وناوە مجرورەکەی پێش کەوێ، وەکو((ممّنْ انتَ خیرٌ؟ومِن ایّهم انت افضلُ؟،ومِنْ غلامِ ایِّهم انت افضلُ؟))، وە بەشاذی هاتووە پێش خستنی لەگەڵ غەیری استفهام،بۆ ئەمەش[1] ئامارەی کرد دانەر بەووتەی ((وَلَدَى إِخْبَارٍ التَّقْدِيمُ نَزْراً وَرَدَا))، وەکو ووتەی:

٢٨٢- فَقَالَتْ لَنَا أَهْلاً وَسَهْلاً وَزَوَّدَتْ    جَنَى النَّحْلِ بَلْ ما زَوَّدَتْ مِنْه أَطْيَبُ[2].

تقدیرەکەی:بل ما زوّدت اطیبُ منهُ، وە وەکو ووتەی ذي الرُّمّة[3] کە وەصفی چەند ئافرەتێك دەکات بەوەی قەڵەو سستن:

٢٨٣- وَلاَ عَيْبَ فِيهَا غَيْرَ أنَّ سَرِيعَها    قَطُوفٌ وأَنْ لا شَيْءَ مِنْهُنَّ أَكْسَلُ[4].

تقدیرەکەی:وان لاشيءَ اکسلُ منهنّ،وە ووتەی:

٢٨٤- إذا سَايَرَتْ أَسْمَاءُ يَوْماً ظَعِينَةً    فَأَسْمَاءُ مِنْ تِلْكَ الظَّعِينَةِ أَمْلَحُ[1].

---

(١) واتا:بۆ ئەوەی کە حەرفی جەری((من))وناوە مجرورەکەی پێش اسمی تفضیل دەکەون ،لەکاتێکدا ناوە مجرورەکە اسمی استفهام نیە.

(٢) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:ئەو-ئافرەتە-ووتی پێمان:یاخوا بە خێربێن سەرچاوان، وئەوەندە خۆش مەشەرەب وقسە خۆش بوو وەکو هەنگوین،بەڵکو لە هەنگوینیش چاکتر وشیرینتر. بەڵگەکەی:((.. مِنْه أَطْيَبُ))جارومجرور پێش افعلی تفضیل کەوتوون ولەکاتێکدا اسمە مجرورەکە اسمی استفهام نیە،ئەمەش شاذە.

(٣) ناوی غیلانی کوڕی عوقبەیە،یەکێك بووە لەشاعرە ناودارەکانی ئەمەوییەکان، ساڵی(١١٧ك)کۆچی دوای کردووە.

(٤) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:ئەوان هیچ عەیبێکیان نیە جگە لەوەی خێراییان نەماوە،وکەسیش لەوان سست تروتەمەڵ تر نین. بەڵگەکەی:((منهنّ اکسلُ)) جارو مجرور پێش افعلی تفضیل کەوتوون ولەکاتێکدا اسمە مجرورەکە اسمی استفهام نیە،ئەمەش شاذە.

تقدیرەکەی: **فأسماء أملح من تلك الظعینة.**

* * *

***باسی عەمەلی اسمی تفضیل ومەرجەکانی:**

٥٠٤- وَرَفْعُــهُ الظَّاهِــرَ نَزْرٌ وَمَــتَى    عَاقَــبَ فِعْــلاً فَكَثِيراً ثَبَتَــا

٥٠٥-كَلَنْ تَرَى فى النَّاسِ مِنْ رَفِيقِ    أَوْلَى بِــهِ الفَضْلُ مِنَ الصَّدِّيقِ[٢]

افعلی تفضیل بەدەر نیە لەوەی کە بگونجیٚ فعلێك لە جێی دانیشیٚ،یان نەگونجیٚ. جا ئەگەر نە گونجا فعل لەجێی دانیشیٚ ئەوە ناوی ئاشکرا مرفوع ناکات،بەڵکو تەنها جێناوی نادیار((ضمیر مستتر))مرفوع دەکات، وەکو:((زیدٌ افضلُ مِنْ عمروٍ))لێرەدا لە ووشەی((افضلُ))جێناوێکی نادیار هەیە کە دەگەرێتەوەبۆ((زیدٌ))،کەوابوو نالێی:((مررتُ برجلٍ افضلَ منهُ ابوهُ))،ناوی((ابوهُ))مرفوع کەی بە ووشەی((افضلَ))مەگەر لەسەر بۆچوونێکی لاواز کە پێشەوا سیبویە گێراویێتیەوە.

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێرەش:ئەگەر اسما خان بەراورد کەی لەگەڵ هەر ئافرەتێك،ئەوە بێگومان اسما لەو جوانتر وشەنگ ترە. بەڵگەکەی:(( مِنْ تِلْكَ الظَّعِينَةِ أَمْلَحُ)) جارومجرور((من تلك)) پێش افعلی تفضیل((املحُ)) کەوتوون ولەکاتێکدا اسمە مجرورەکە اسمی استفهام نیە،ئەمەش شاذە.

[٢] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە:٥٠٤- افعلی تفضیل بەکەمی وایە فاعلی ئاشکرا((ظاهر))-واتا:جگە لە جێناو(ضمیر)-مرفوع بکات،بەلاّم ئەگەر افعلی تفضیل لەوانە بوو کە بگونجیٚ فعل لەجێی دا بنیشیٚ ئەوە زۆرە مرفوع کردنی بۆ فاعلی ئاشکرا. ٥٠٥-وەکو نموونەی((لَنْ تَرَى فى النَّاسِ مِنْ رَفِيقِ أَوْلَى بِهِ الفَضْلُ مِنَ الصِّدِّيقِ))واتا:نابینی لە ناو خەڵکیدا هیچ دۆستێك وبرادەرێك خاوەن فەزڵ وچاکە بیٚ وەکو ئەبو بەکری صدیق ﷺ.لەم نموونەیەدا افعلی تفضیل((اولی))ناوێکی ئاشکرای((الفضلُ)) مرفوع کردووە،لەبەر ئەوەی دەگونجیٚ فعلێك لە جێی دانریٚ.

خۆ ئەگەر گونجا فعلێك بەمانای افعلی تفضیل لەجێی دانیشێ ئەوە ڕاست ودروستە ناوێكی ئاشكرا مرفوع بكات بەیاسای وجێگیربوون،ئەمەش لەهەموو شوێنێك كە افعلی تفضیل بكەوێتە پاش نەفی یان هاوشێوەی نەفی،وناوە مرفوعەكەی بێگانەی((أجنبی))بێ،ودووجار فەزڵی بەسەردا درا بێ،وەكو:((ما رایتُ رجلاً احسنَ في عینهِ الكحلُ منهُ في عینِ زیدٍ))[1] لێرەدا((الكحلُ))مرفوعە بە((احسنُ))لەبەر ئەوەی ڕاست وگونجاوە فعلێك بە مانای خۆی لەجێی دانرێ،وەكو:(( ما رایتُ رجلاً یحْسُنُ في عینهِ الكحلُ كزیدٍ))، وەوەكو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ:((مَا مِنْ أیَّامٍ أحَبَّ إِلَی اللهِ فیها الصومُ مِنْهُ في عشرِ ذي الحجة))[2]،وە وەكو ووتەی شاعر،كە پێشەوا سیبویە هۆنیوێتێوە:

٢٨٥–مَرَرْتُ عَلَی وادي السِّبَاعِ ولا أرَی كَوَادي السِّبَاعِ حِینَ یُظْلِمُ وَادِیا

أقلَّ بِهِ رَكْبٌ أتَوْهُ تَئِیَّةً وأخْوَفَ إلاّ ما وقی اللهُ ساریا[3]

---

[1] واتا:نەمبینیوە هیچ كەسێك لە چاویدا ڕەشی جوان بێ وەكو چاوی زەید.

[2] ئەم فەرموودەیە ئیمامی بخاری ڕیوایەتی كردووە،بەڵام بەبێ باسی((الصوم))،بەم ڕیوایەتە:(( مَا مِنْ أیَّامٍ ، العَمَلُ الصَّالِحُ فِیهَا أحَبُّ إِلَی اللهِ مِنْ هذِهِ الأیَّامِ ))،واتا:هیچ ڕۆژانێك نین كردەوەی چاك خۆشەویستر بێ لای خوای گەورە تێیاندا وەكو ئەم ڕۆژانەی نۆمینەی حاجیان. إعرابەكەی:ما:نافیة عاملة عمل لیس.مِنْ:حرف جرزائد للتوكید.ایامٍ:اسم مجرور لفظا مرفوع محلاً وهو اسم(ما). احبَّ:خبر(ما)منصوب وعلامة نصبه الفتحة.إلی الله وفیها:جارومجرور متعلقان بـ(احبّ). الصومُ:مرفوع بـ(احبّ)لصحة وقوع الفعل بمعناه،والتقدیر:یحبُّ فیها الصومُ. منه وفي عشرِ: كلاهماجارومجرور،متعلقان بـ(احبّ)،وعشر مضاف،ذي:مضاف إلیه مجرور وعلامة جره الیاء لأنه من الأسماء الخمسة،وهو مضاف. الحجةِ:مضاف إلیه مجرور. الشاهد فیه:((احبَّ...الصومُ))حیث رفع افعل التفضیل(احبّ) فاعلاً ظاهرا وهو(الصوم)لأنه صلح لوقوع فعل بمعناه موقعه.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دوو دێرە:دام بەلای دۆڵی دڕندان لە كاتێكدا نەمبینیوە وەكو دۆڵی دڕندان–كاتێ تاریك دادێ–هیچ دۆڵێ،كەم ترین كاروانی تێدا تێدەپەڕێ بەلەسەر خۆی،وە زۆر دەترسێ–مەگەر كەسێ خوا بیپارێزێ– ئەو كەسەی شەو ڕەوی

لێرەدا((ركبٌ))مرفوعە بە((اقلّ))،جا ووتەی دانەر((وَرَفْعُهُ الظَّاهِرَ نَزْرٌ))ئامارژەیە بۆ حاڵەتی یەكەم[١]،وە ووتەی((وَمَتَى عَاقَبَ فِعْلاً))ئامارژەیە بۆ حاڵەتی دووەم[٢].

---

تێدەكات. بەڵگەكەی:((أقلَّ بِهِ رَكْبٌ..))افعلی تفضیل(اقلّ)ناوێكی ئاشكرای-كە(ركبٌ)-مرفوع كردووە لەبەر ئەوەی دەگونجێ فعلێكی هاومانای جێی بگرێ.

[١] واتا:بۆ حاڵەتی ئەوەی كە نەگونجێ فعلێك لەجێی افعل التفضیل دانیشێ وماناكەی پڕكاتەوە.

[٢] واتا:بۆ حاڵەتی ئەوەی كە بگونجێ فعلێك لەجێی افعل التفضیل دانیشێ وماناكەی پڕكاتەوە.

# ئامادەیە بۆ چاپ







**خوێنەری بەڕێز:**

ئەم کتێبە یەکێکە لەمەوسوعە گەورەکانی زانستی ڕێزمانی عەرەبی، و لەجیهانی ئیسلامیدا بە ناوبانگەو وەرگێڕاوەتە سەر زۆرێک لەزمانەکان، بۆیە بەندەش بە پێویستم زانی دەقی کتێبەکە دوو بەشەو ئەلفیەی ابن مالك، شەرح و ڕاڤەکەی ((ابن عقیل)) وەکو خۆی وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، لەگەڵ دانانی پەراوێزو ڕوونکردنەوەی زیاتر لەکات و شوێنی پێویست لە پەراوێزی هەموو لاپەڕەکاندا، تۆی بەڕێزیش پێویستە بەوردی بیخوێنیتەوەو هەوڵ دەی لێی حاڵی بی، بۆ سوودمەنبوون لێی.

خوای گەورە بەختەوەرو سەرفرازی دونیاو دواڕۆژمان بکات

**لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشک**